# صەلاحەدینی ئەیوبی

## لە لای مێژونوسانی کورد

شەرەفخانی بەدلیسی - محەمەد ئەمین زەکی - صالەح قەفتان
شوکرولڵا بابان - د. محسن محمد حسین



ئامادەکردنی
ئەحمەد حمەأمین رەنجیار

نارین




ناوی کتێب: صەلاحەدینی ئەیوبی لە لای مێژونوسانی کورد

ئامادەکردنی: ئەحمەد حمەأمین رەنجیار

نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

ساڵی چاپ: ٢٠١١ ز

ژمارەی سپاردن: (١٣٠٣)ی ساڵی (٢٠١١)ی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# صەلاحەدینی ئەیوبی

## لە لای مێژونوسانی کورد

شەرەفخانی بەدلیسی – محەمەد ئەمین زەکی – صالەح قەفتان

شوکروڵلا بابان – د.محسن محمد حسین

ئامادەکردنی

ئەحمەد حمەأمین رەنجیار

ناریَن

## پێشەکی

شتێکی روون وئاشکرایە کە گەلی کورد پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە لە مێژووی ئیسلامیدا، ئەمەش زیاتر بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەوە بووە کە کوردە ئەیووبیەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست بەرامبەر خاچ پەرستەکان بەدەستیان هێنا.

واتە ئەو بنەماڵە کوردیە رۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە ناساندنی نەتەوەکەیان بە خەڵکانی جیهان و سەرنجی دۆست و دوژمنیان بەلای خۆیاندا کێشمەند کردووە.

جا بۆ دڵنیاکردنی ئەو کەسانەی کە بیروبۆچونی نادروستیان بەرامبەر ئەو بنەماڵەیە هەیە، چەندێتی پابەند بوونیان بە نەتەوەکەیان و ئەو کەڵك و سوودانەی کە لە کردارەکانیان کەوتۆتەوە بەکورتی دەیخەینە روو.

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە خودی (سەلاحەدین) خۆی پێشەنگی ئەیوبیەکان بووە، نکوڵی لە کوردێتی خۆی نەکردووە بە بەڵگەی ئەوەی (إبن خلكان) کە مێژوونوسێکی متمانە پێکراوە دەڵێ: (یەکێك لە برازاکانی سوڵتان کەناوی "المعز إسماعيل بن يوسف الإسلام" بوو، خۆی بە نەوەی ئەمەویەکان لەقەڵەم دەدا).

لەدوای ئەوە دەڵێ: (بەڵام گوێم لە قاضی "إبن شداد" بوو دەیوت: سوڵتان ئەو قسەی زۆر لەلا ناخۆش بوو، بەمنی وت ئەو رەچەڵەکەی برازام هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نی یە).

هەروەها کەسانی تریش لە بنەماڵەی ئەیووبی ئەو رەچەڵەکەیان رەد کردۆتەوە، وەك مەلیك (العادل أبوبكر) کە ئەوەش مامیەتی.

کاتێ ئەو شتە دەبیستێ نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ دەنێرێ و داوای لێ دەکات واز لەو جۆرە رەچەڵەکە هەڵبەستوانە بێنێ و دەست بەرداری ببێت.

شایەنی ئاماژە بۆکردنە کە کوردەکانی ئەو سەردەمە تەنانەت خاوەن دەسەڵات و میرنشینە دیارەکانیش ئەو جۆرە رەچەڵەکەیان بۆخۆیان داناوە، بەڵام مەبەستیان لە

دیاریکردنی ئەو رەچەڵەکانە جیاواز بووە، خاوەن میرنشینەکان بەمەبەستی نزیك بوون لە ئاینی ئیسلام و شەرعیەت دان بە دەسەڵاتی خۆیان ئەو کارەیان کردووە.

بەڵام هەرچی ئەو مەلیکەیە "المعز اسماعیل" بەهۆی سەرکەشی و نیازخراپی ئەو کارەی کردبوو، هەروەها لەبەر بەدرەوشتی و داوێن پیسی لەلایەن سەربازەکانی دەکوژرێ. هەروەك سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەی بۆ دەکەن .

ئینجا شتێکی گرنگتر دەربارەی ئەو زمانەی کە ئەیوبیەکان لەنێو خۆیان گفتوگۆیان پێ دەکرد، بێگومان زمانی زگماکی خۆیان بووە بە بەڵگەی ئەوەی (جورجی زیدان) کە مێژوو نوسێکی مەسیحیە دەڵێ: (سەلاحەدین لەگەڵ یاریدەرە نزیکەکانی بە زمانێك دەدوا خەڵکەکە لێی تێ نەدەگەیشتن).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئینتیمای نەتەوەیی لای ئەیوبیەکان بەرجەستەبووەو دەتوانین بڵێین شانازیشیان بە کوردێتی خۆیانەوە کردووە .

بەڵام بەداخەوە هەزاری میللەتەکەمان لەلایەنی رۆشنبیری کارێکی زۆری کردۆتە سەر دەرگاوالاکردن بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێ مێژووی ئیسلامی کورد بشێوێنن.

لەراستیدا تۆمەت خستنە پاڵ ئەو بنەماڵەیە پیشەی کەسانێکە کە هەگبەیان خاڵیە لە بەڵگەی زانستی راست و دروست و لەهەمان کاتیشدا بەڵگەیە بۆ نارۆشنبیران.

ئەگینا کەی رەوایە بە چاوی ئەمڕۆ دادگایی مێژوو بکەین و لەسەردەمانێك بیری ئاینی بەرقەراربوو بێت، باسی بیری نەتەوایەتی بکەین.

فەتحی قودس ئاکامەکەی چەند دەرسێك بوو بۆ ئەوروپاو هەڵوێستەیەك بوو لەلایەن جیهانی ئیسلامی و عەرەب بەرامبەر بە کورد!

سەبارەت بەو کەڵك و سوودانەش کە لەکردارەکانیان کەوتۆتەوە، لەراستیدا زۆرنزۆرن بەڵام وەك ئاماژەمان بۆ کرد تەنها بەکورتی باسی سودمەندبوونی گەلی کورد دەکەین لەم بارەیەوە.

ئەوەی راستی بێت ئەگەر هەر هەڵوێستەیەك لە مێژوودا بەرامبەر بە میللەتی کورد کرابێت، ئەوا لە ئەنجامی ناوبانگی (سەلاحەددین) و فەتحی قودس بووە.

ئەو کوردە مەردەی کە توانی نەتەوەکەی و ئیسلام بە جۆرێك ئاوێتە بکا، تا دنیا دنیا بێت دوژمن نەتوانێ لێکیان بپچڕێنێ.

بەڵام دیسانەوە بەداخەوە هێشتا میللەتی ئێمە نەیتوانیوە بکاتە ئەو ئاستە هەڵسوکەوتی تەواو لەگەڵ مێژوودا بکات تاکو داهاتووی پێ روونـاك بکاتەوە، چونکە بنەماڵەی ئەیوبی لە رۆژئاوادا چاکتر ناسراون زیاتر لە رۆژهەلات.

رۆژئاوا بە هۆی دیراسەیەکی قوڵی ژیانی (سەلاحەددینی ئەیوبی) چەند دەرسێك فێربوو، کەچی تازە ئێمە بابەتی ئاوا ساکارو سادە دەخەینە روو.

تاکو ئەو رستەیە: (رۆژئاوا لە رقی سەلاحەددین کوردستانیان دابەش کرد) نەبێتە ویردی سەر زاری نەوەکانمان.

سەلاحەددین رەمزێکە بۆ گەلی کوردی موسوڵمان لەمەڕ هەڵسوکەوت لەگەڵ بێگانە، نمونەی بەرامبەر بە بیروباوەڕەکەی.

هەرچەندە خودی رۆژهەلات ناسەکان خۆیان دانیان بەبەزەیی و لێ بوردن و کاربەرزی سوڵتاندا هێناوە، بەڵام کاتێ یەکێکی وەك (غۆرۆ) کە خۆی بەنەوەی خاچپەرستەکان دەزانێ و دەڵێ: (سەلاحەددین وا هاتینەوە).

لەو کاتەدا با ئەو وتەیەی خوای گەورە بخەینەوە یادمان کە روو لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و دەفەرموێت: ((ولن ترضى عنك اليهود و النصارى حتى تتبع ملتهم)) با ئێمەش خۆمان بە نەوەی سەلاحەددین بزانین و بۆی بچینە مەیدان بە بیرو باوەڕەی سەلاحەددین هەیبوو، بەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ باپیرانی (غۆرۆ) کردی. بزانین ئاخۆ زەرەرمەند دەبین !

باشە بۆ شانازی بە یەکێك نەکەین سەری کوردی بە ئیسلام و هی ئیسلامی بە کورد بەرزکردبێتەوە؟ بۆ بەوە رازی نەبین کاتێ ناوی (قودس) بێ، هەروەك قاضی محی

الدین کاتێ وتاری هەینی لە مزگەوتی ئەقسا خوێندەوە، قەدەری خوا کە لەیەکەم ڕۆژی فەتحی قودسدا بوو لە لایەن جەنگاوەرانی موسڵمانی کورد.

لە دەسپێکی وتارەکەی دا ئاماژەی بە ڕۆڵی کورد کردو وتی:

الحمد لله الذي ذل دولة الصليبي          وعز بالكرد دين المصطفى العربي

هەر بۆیە تائێستاش فەلەستینیەکان چاویان بڕیوەتە دایکانی کورد تاکو ڕۆڵەیەکی تری وایان بۆ گۆش بکات.

شایانی ئاماژە بۆ کردنە کاتێ قودس لە لایەن خاچیەکان داگیر کرا (٧٠٠٠٠) موسڵمانی لێ کوژرا، بەڵام کە سوڵتان فەتحی کرد بە هۆی ڕێکەوتنێك بوو لە نێوان هەردوو لا، هەروەها دڵ نەرمیەکی زۆریشی بەرامبەر دیلە خاچیەکانی ناو قودس نواند.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێزێکی زۆری خاچیەکان لە ئەوروپا بە ڕێکەوت بۆ سەندنەوەی قودس، کە دیارترین هێز بە سەرکردایەتی (رتشارد قلب الاسد)بوو، کەچی سوڵتان بەردەوام بوو لەسەر دڵ نەرمی و لێبوردەیی خۆی. هەتا خودی ئەو مەلیکە کاتێ نەخۆش کەوت سوڵتان خوردەمەنی و پزیشکی بۆ ڕەوانە کرد، تاکو نەفس بەرزی موسڵمانان نیشان بدات.

بۆیە ئەم پاشایە زۆر سەری لەو کارە سوڕماو بەم جۆرە وەسفی سوڵتانی کردووە کە دەڵێ: (أنا أعلم بأن السلطان صلاح الدين شهم، عالي الهمة، عادل، رحيم).

بەو جۆرە سەلاحەددین بۆ ئەوروپای سەلماند کە موسڵمانان بە چاوی مرۆڤانەوە سەیری دوژمن دەکەن.

ئینجا با بزانین ڕۆژهەڵات ناسەکان چۆن لە بارەی (سەلاحەددین)ەوە دواون. بۆ نمونە (ادنولد سيد توماس) دەڵێ: ( لە سەردەمی ئەو سوڵتانەدا مەسیحیەکان لە میسردا لە بارودۆخێکی زۆر خۆشدا ژیانیان دەگوزەراند، ئەو سوڵتانەی کە ناسرا بوو بە (لێبوردەیی ئاینی)، هەندێ سەرانەو باجی بە تەواوی لەسەر هەڵگرتن و

هەندێکیشی کەم کردەوە، هەروەها لەسەر کاروبارە گشتیەکانیش دایمەزراندن وەك وەزیرایەتی و نوێنەرایەتی و ...هتد

هەروەها ( کارل بروکلمان)یش کە رۆژهەلات ناسێکی ترە دەڵێ: ( لە راستی دا سەلاحەدین لە رۆژهەلاتدا وەك رەمزێك وایە بۆ بەختەوەرترین و پڕ ئاسایش ترین چاخی مرۆڤ، هەروەها دوژمن و ناحەزانی هیچ چارەیان نەبووە بێجگە لە دان هێنان بە مەردایەتی و دڵ نەرمی و بەخشندەیی).

لە دوای ئەوەش تۆمەتێکی تر دەخرێتە پاڵ ئەو بنەماڵەیە و بەوە تاوانبار دەکرێن کە (دەوڵەتێکی نەتەوەییان پێك نەهێنا). لەهەمان کاتدا هەندێ نووسەری شۆڤێنی عەرەب دەڵێن سەلاحەددین و بنەماڵەکەی تەنها بایەخیان بە هاوڕەگەزی خۆیان داوەو کەس و کاری خۆیان لەسەر پلەوپایەی بەرز دامەزراندووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکی تریان هەر دان بە کوردیەتي ئەیوبیەکاندا نانێن.

سەبارەت بە بایەخی ئەیوبیەکان بۆ کرد لە راستی دا بەڵگە زۆر زۆرە، کوردەکانی ئەو سەردەمە پێش دەرکەوتنی (سەلاحەددین)یش ئەو هەستەیان هەر هەبووە، هەروەها لەو کاتەدا ئایین پێوانە بووە بۆ دامەزراندنی خەڵك لەسەر پلەوپایەی بەرز، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هۆزە کوردەکانی ئەو سەردەمە لەناو خۆدا یەککگرتوو بوون و هەتا کوردێکی شیاو هەبوایە بۆ پلەو پایەیەکی بەرز ڕەگەزێکی تریان دانەدەنا، بۆ نمونە کاتێك ئەسەدەدین شێرکۆی مامی صەلاحەددین کۆچی دوایی دەکات چەند سەرکردەیەکی تورك و کورد دەیانەوێ پلە و پایەی وەزیرایەتی لە دوای شێرکۆ زەوت بکەن.

بۆیە پیاوێ بەناوی (فەقێ عیسا هاوکاری) هەوڵدەدات صەلاحەددین بە وەزیر دابنێو دەتوانێ زۆربەی سەرکردە کوردەکان ڕازی بکات بەوەی واز لەو کارە بێنن و لە کۆتاییدا ڕوو دەکاتە سەرکردەیەکی کورد کە ناوی (خەسرۆ کوڕی ئەلیلی هەزبانی)یە

پێی دەڵێ: ( لێگەڕێ با کوردێك ببێتە وەزیر باشترە لەوەی تورکمانەکان ئەو هەلە بقۆزنەوە).

لە پاش ئەوەی ئەیوبییەکان توانییانە دەوڵەتێکی بەهێزی یەکگرتووی ئیسلامی کوردی سەر بە خەلافەتی عەبباسی پێك بهێنن کە چەند مەملەکەیەکی وەك (ولاتی شام و میسر و مەغریب و سودان و یەمەن و حیجاز و کوردستان)ی گرتبووەوە. کە مێژوونووسەکان بە (دەولە الاکراد)ی هەروەها پادشاکانیشیان بە پادشایانی ئەو ناوچانە ناوزەد کراون.

لە دوای ئەوە با ئێمە چەند پرسیارێك لە خۆمان بکەین، ئایا ئەگەر صەلاحەددین لە کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاست بەرەنگاری خاچییەکانی نەکردایە ئەو ناوبانگەی پەیدا دەکرد، گەر لە پارچە زەوییەکی کوردستان گۆشەگیربوایە ئەیتوانی ئەو سوودەی کە بە کوردی گەیاندووە بیگەیەنێت؟

ئایا گەر لە پێناوی ئیسلام نەبوایە ئەو هەموو ڕەگەزە جۆراوجۆرە بەشداری لە سوپاکەی دەکرد؟ ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستدەهێنا؟

لە دواییدا نەتەوەکی لەو پەڕی سەربەستی و سەربەرزییە جودابوونەوە لە خەلافەت مانای چییە؟

لە بەر ئەوەی من لەو بڕوایەدام کە ئەیوبییەکان زیاد لە پێویستی ئەو سەردەمە بایەخیان بە نەتەوەی خۆیان داوە و بە هیچ کلۆجێکیش ڕەوا نییە تانە و تەشەریان لێ بدرێت، هەروەها بۆ گەیشتن بە حەقیقەت پێویستە لاساییکەرەوە نەبین و خوێندنەوەیەکی ورد و واقیعیانەمان هەبێ بۆ ئەم مەسەلەیە.

هەر لەم ڕووەشەوە من هەستاوم بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبە مێژووییە خۆماڵییە باوەڕپێکراوەکانی کورد، وەك (شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی) و (خولاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان)ی محمد ئەمین زەکی و (مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)ی صالح قەفتان و (مێژووی کورد و کوردستان) ی شوکراللەی بابان و هەر یەك

لەو بناغە دانەرانەی مێژووی کوردمان کە لە بارەی ئەیوبییەکان و صەلاحەددینەوە کە وەك بەشێکی گرنگ لە مێژوومان لێی دواون، هێناومن وە هەروەها پاشکۆیەکیش بە ناوی (دەوری کوردەکان لە سوپای صەلاحەددیندا)ی د. محسین محمد بهێنم ئەمەش بە خاتری ئەوەی جارێکی تر نەوەی نوێمان بە مێژووی پڕ لە سەروەری خۆی ئاشنا بێتەوە و چیتر وا نەزانێت لەم سەردەمی ئازادی کورد و حوکمی خۆڕێبەرییەیدا نەبوونی باس و خواستی (صەلاحەددینی ئەیوبی) لە کایە ڕۆشنبیری و سیاسییە کوردییەکەماندا کارێکی ڕوایە بەرامبەر بە ئەو زاتە گیراوەتەبەر گوایە صەلاحەددین لە ڕابردوودا هیچی بۆ میللەتەکەی نەکردووە هەتا ئێستا پێویست بە باس و خواست و یادکردنەوە و فیستیڤاڵ بۆگرتنی بێت. نەخێر، بەڵکو ئەوە صلاحەددین بوو وەك کوردێکی موسڵمان و بە سوپایەکی زۆرینەی کوردەوە کە سەرۆکایەتی دونیای ئیسلام گەرای دەکرد بەرامبەر بە دونیای خاچپەرستی وەستایەوە و لوت بەرزی چەندین سەدەی ئەوانی دا لە زەوی و سەرزەمینی ئیسلامی لە داگیرکاری و زۆرداری ئەوان سڕییەوە،بەلاّم زۆر حەیف لە دوای نەمانی ئەوو پەرتەوازەبوونەوەی میللەتانی ئیسلامو هاتنەوەی تەوژمی خاچ پەرستی بۆ جیهانی ئیسلام و کۆلۆنی کردنی خاك و نەتەوەکانی، باسو خواسێك لە سەلاحەدینی ئەیووبی بوو بە پێویستیەکی حەتمی لەبیرخۆ بردنەوە لەلایەن خودی نەتەوەکەی خۆشیەوە.

پێی دەڵێ: ( لێگەڕێ با کوردێك ببێتە وەزیر باشترە لەوەی تورکمانەکان ئەو هەلە بقۆزنەوە).

لە پاش ئەوەی ئەیوبییەکان توانییانە دەوڵەتێکی بەهێزی یەکگرتووی ئیسلامی کوردی سەر بە خەلافەتی عەبباسی پێك بهێنن کە چەند مەملەکەیەکی وەك (وڵاتی شام و میسر و مەغریب و سودان و یەمەن و حیجاز و کوردستان)ی گرتبووەوە. کە مێژوونووسەکان بە (دەولە الاکراد)ی هەروەها پادشاکانیشیان بە پادشایانی ئەو ناوچانە ناوزەد کراون.

لە دوای ئەوە با ئێمە چەند پرسیارێك لە خۆمان بکەین، ئایا ئەگەر صەلاحەددین لە کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاست بەرەنگاری خاچییەکانی نەکردایە ئەو ناوبانگەی پەیدا دەکرد، گەر لە پارچە زەوییەکی کوردستان گۆشەگیربوایە ئەیتوانی ئەو سوودەی کە بە کوردی گەیاندووە بیکەیەنێت؟

ئایا گەر لە پێناوی ئیسلام نەبوایە ئەو هەموو ڕەگەزە جۆراوجۆرە بەشداری لە سوپاکەی دەکرد؟ ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستدەهێنا؟

لە دواییدا نەتەوەکی لەو پەڕی سەربەستی و سەربەرزییە جودابوونەوە لە خەلافەت مانای چییە؟

لە بەر ئەوەی من لەو بڕوایەدام کە ئەیوبییەکان زیاد لە پێویستی ئەو سەردەمە بایەخیان بە نەتەوەی خۆیان داوە و بە هیچ کلۆجێکیش ڕەوا نییە تانە و تەشەریان لێ بدرێت، هەروەها بۆ گەیشتن بە حەقیقەت پێویستە لاساییکەرەوە نەبین و خوێندنەوەیەکی ورد و واقیعیانەمان هەبێ بۆ ئەم مەسەلەیە.

هەر لەم ڕووەشەوە من هەستاوم بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبە مێژووییە خۆماڵییە باوەڕپێکراوەکانی کورد، وەك (شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی) و (خولاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان)ی محمد ئەمین زەکی و (مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)ی صالح قەفتان و (مێژووی کورد و کوردستان) ی شوکراللەی بابان و هەر یەك

لەو بناغە دانەرانەی مێژووی کوردمان کە لە بارەی ئەیوبییەکان و صەلاحەددینەوە کە وەك بەشێکی گرنگ لە مێژوومان لێی دواون، هێناومن وە هەروەها پاشکۆیەکیش بە ناوی (دەوری کوردەکان لە سوپای صەلاحەددیندا)ی د. محسین محمد بهێنم ئەمەش بە خاتری ئەوەی جارێکی تر نەوەی نوێمان بە مێژووی پڕ لە سەروەری خۆی ئاشنا بێتەوە و چیتر وا نەزانێت لەم سەردەمی ئازادی کورد و حوکمی خۆڕێبەرییەیدا نەبوونی باس و خواستی (صەلاحەددینی ئەیوبی) لە کایە ڕۆشنبیری و سیاسییە کوردییەکەماندا کارێکی ڕوایە بەرامبەر بە ئەو زاتە گیراوەتەبەر گوایە صەلاحەددین لە ڕابردوودا هیچی بۆ میللەتەکەی نەکردووە هەتا ئێستا پێویست بە باس و خواست و یادکردنەوە و فیستیڤاڵ بۆگرتنی بێت. نەخێر، بەڵکو ئەوە صلاحەددین بوو وەك کوردێکی موسڵمان و بە سوپایەکی زۆرینەی کوردەوە کە سەرۆکایەتی دونیای ئیسلام گەرای دەکرد بەرامبەر بە دونیای خاچپەرستی وەستایەوە و لوت بەرزی چەندین سەدەی ئەوانی دا لە زەوی و سەرزەمینی ئیسلامی لە داگیرکاری و زۆرداری ئەوان سڕییەوە،بەڵام زۆر حەیف لە دوای نەمانی ئەوو پەرتەوازەبوونەوەی میللەتانی ئیسلامو هاتنەوەی تەوژمی خاچ پەرستی بۆ جیهانی ئیسلام و کۆلۆنی کردنی خاك و نەتەوەکانی، باسو خواسێك لە سەلاحەدینی ئەیووبی بوو بە پێویستیەکی حەتمی لەبیرخۆ بردنەوە لەلایەن خودی نەتەوەکەی خۆشیەوە.

## پادشایی میسر و شام

## کە بە بنەماڵەی ئەییوبی بەناویانگن

چیرۆك بێژانی دەمڕاس و دیرۆك زانانی دورناس و مێژوونووسانی تەڕدەست و مێژووناسانی پیتۆڵ و لە سەرهەست، بۆ باسی ئەم مەبەستەمان بەم جۆرە دەست پێ دەکەن و دەڵێن:

با پیرانی پادشایانی میسر و شام بە بنەو بنەچەکە دەگەنەوە سەر شادی کوڕی مەروان[١] و لە هۆزی کوردەکانی رەوەندەن[٢] و لە مەڵبەندی ئازەربایجان، لە گوندی دوین[٣] دەژیان. گوندی دوین ئێستا وێرانە و لە شوێن ئەو گوندێك بە ناوی ((ضغور سەعد))ەوە ئاوەدان کراوەتەوە.

لە رۆژگاری دەسەلاتداری سولتان مەسعوودی سەلجووقیدا، یەکێك لە کاربەدەستانی سولتان پاراستنی قەلای تکریتی بە شادی - باپیرە گەورەی ئەییوبییەکان - ئەسپاردووەو بەو هۆیەوە شادی لە تکریت گیرساوەتەوەو هەر لەوێدا ماوەتەوە، هەتا رۆژی تینداری ژیانی کەوتۆتە خۆرنشینی مەرگەوە و شادی لە کەس و کاری بووە بەشین.[٤] لە پاش نەمانی شادی، کوڕی گەورەی - کەناوی نەجمەدین ئەییوب بوو-[٥] لەسەر کاری بابی دامەزراو ئەکی قەلاداری کەوتە سەر شانی. نەجمەدین ئەییوب برایەکی لە خۆی گچکەتری هەبوو ناوی ئەسەدەدین شێرکۆ بوو.[٦] لەو سەروبەندانەدا کە نەجمەدین ببووە دزداری تکریت، رۆژێك لە رۆژان نجمەدین و شێرکۆ پێکەوە بە ناو شاری تکریتدا دەگەڕان، لە نەکاو ژنێك بە زیڕەن و گریان و هاوار، هاواری بۆ هێنان و دەست و دامێنیان بوو، کە بیکەن لە راهی خودادا کابرایەك چاوی بڕیوەتە ناموسم و ئێوە نەمپارێزن ئاوڕووم دەبا! وا خۆن هاویشتە داڵدەو پەسیوی ئێوەوە.

ئەسەدەدین شێرکۆ بە بێ رامان و سێ ودوولێ کردن، رای کردەسەر کابرای بێ ئابڕووی ئابڕووبەر و ئەو نێزەی لەدەست دەرێنا کە گەفی پێ لە ژنەکە دەکرد و هەر بە نێزەکەی خۆی برینێکی وا حەستەمی لێ کرد کە بەبێ لینگەفرتەو نقەکردن، هەر دوو جاران دەمی پێك داداو مرد.

نەجمەدین وەك هەموو فەرمانداڕێکی خۆ نەبوێر و رێ و شوێن زان، شێرکۆی برای خۆی کۆت و زنجیر کرد و خستیە زیندان و کارەساتەکەشی چۆن دیبو، ئاوای دەنامەیەکدا نووسی و بۆ نایبی سوڵتان مەسعوودی سەلجۆقی نارد و چاوەنۆڕی فەرمانی بەغدا بوو.

نایبی سوڵتان مەسعوود لە وەڵامی نامەی نەجمەدیندا نووسیبووی: ئەو کابرایە کە برای تۆ کوشتوویە، دۆستێکی زۆر نزیك و خۆشەویستی من بوو، زۆری بۆ بە پەرۆشم. لە لایەکی تریشەوە هەواڵ و هۆگری تۆشم. زۆر دەترسم رۆژێك تووشم ببێ بە تووشی شێرکۆوە و خوێنم هەڵچی و خۆم بۆ رانەگیرێ و لە تۆڵەی دۆستی لە دەست چووما، شیری لێ بکێشم و لێمان ببێتە کێشە و دیسان خوێن بێتە سەر خوێن. من وای بە باش دەزانم تا تەمەنی ماتەمی ئەوم لەسەر دەڕەوێ، ئێوە لەو مەڵبەندەبارکەن، با چاومان بە یەکتر نەکەوێ[٧] نەجمەدین لە وەرامەوە زانی کە تازە لە تکریت مانەوە تامی نەماوە . دەگەڵ شێرکۆی برای دا نێومالّ و کەل و پەلی خۆیان پێچایەوە و باریان کردو روویان کردە مووسڵ و چوونە لای عیمادەدین زەنگی، کە فەرمانڕەوای موسڵ بوو[٨] عیمادەدین زۆری بەخێر هێنان و گەلێکی رێز لێنان و زۆر بە رووی خۆشەوە لە لای خۆی گل دانەوەو کردنیە باوەڕپێکراوی خۆی و لەسەر خواست و ئاواتی خۆیان دایمەزراندن.

کاتێ کە شاری بەعلەبەك کەوتە دەست عیمادەدینەوە، بە نەجمەدینی ئەسپارد کە بەسەر کاروباری رابگا و کارگوزاری ئەوبێ.

نەجمەدین کەڵە پیاوێك بووە لە پیاوە هەڵبژاردەکانی جیهان، بەمشوور و کارزان و ئازاو پاڵەوان و لەسەرخۆ و پشوودرێژ و بەرچاوفرەوان و دەست و دڵ پاك و ئاکاچاك و لە خواترس و پارێزگار و لاگری بێچارەو هەژاران و ئاگری سەرگیانی دوژمن و بەدکاران‌و جێگەی شانازی دۆست و یاران، لە هەر کوێیەك و لە هەر جێیەك ماوەیەك ماوەتەوە، بە دادگەری و هونەروەری دەنگی داوەتەوە.

لەو سەروبەندەدا کە بەسەر بەعلەبەك راگەیشتووە، خانەقایەکی بۆ سۆفیەکان دروست کردووە کە بەنەجمییە ناوی رۆیشتووە.

لە پاش مەرگی خوالێخۆشبوو عیمادەدین زەنگی، نەجمەدین و ئەسەدەدین شێرکۆ چوونە لای نورەدین مەحموود[٩] کە پادشای شام بوو. نورەدین بە هاتنی کوڕانی شادی، شادوشاگەشکەبوو، زۆری بەخێراتن کردن و گەلێکی بەرێز گرتن. شێرکۆی کردە سەرداری لەشکر و شاری حیمسیشی پێ سپارد[١٠].

عازدی ئیسماعیلی والی میسر[١١] – کە لە چەنگ فەرەنگان وەتەنگ هاتبوو –هانای بردەبەر نورەدین مەحموود کە بە هاواریەوە بچێ. نورەدین مەحموود سێ جاران شێرکۆی بە لەشکری گرانی خۆیەوە ناردە میسر و یاریدەی عازدی دا. لە جاری سێهەمیندا – لە سەر خواستی عازد– شێرکۆ، شاپووری وەزیری عازدی کوشت و لە جێگەی ئەو کرا بە وەزیر.[١٢] بەڵام هێشتا گوڵێکی لە گوڵزاری وەزارەت نەچنی بوو کە شەختەی سەختی مەرگی لە پڕ، بەرگ و پەلکی گوڵی ژیانی پەرپەڕ کرد و هەڵیوەراندو کۆچی بێوادەی ئەو ئازا و ئازادە – وەك دڕکەزی – چەقیە ناو جەرگی هەموو میسری‌و شاسیەکەوە، لە دوای تەنیا ٦٥ رۆژ وەزیرایەتی کردن، رۆژی دووشەممە، دووەمی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی ٥٦٤.ك (١١٦٩.ز) گیانی پاکی بە خودای تاك سپارد و لە پاش ئەو سەلاحەدینی برازای کرا بە جێنشینی.

سەلاحەدین لاوێکی ژێهاتی و ژیر و کارامە و پیاوێکی زیت و زۆرزان و بەزیپك و دەستگەرم بووە. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا زۆر خۆی رەپێش خست و هەموو کاروباری

میسری خستە ناو چمك و ژێر چۆکی خۆیەوە و کارێکی کرد کە هیچ کەسێك لە میسردا هیچ کارە نەبێ، خۆی نەبێ.

لە لایەن خەلیفە عازدەوە نازناوی مەلیك ناسری پێدراو لەو ساوە بە مەلیك ناسر سەلاحەدین ناو برا.

سەلاحەدین لە دوای ئەوە کە زۆر باش لە میسردا خۆی داکوتا و هەموو کاروباری رووبەڕا کردن، پیاوی بە نامەوە ناردە شام و وەڵامی بۆ نوورەدین بە ڕێ کرد و تیا درکاندی: گەورەم خۆت ئاگاداری کە چەندێکە لە دیدای ئێوە بەش براوم و چاوم بە کەس و کارو خزمانم نەکەتووە. بە تایبەتی زۆرم وەڕەزی باوکم کردووە و زۆری بە تاسەم. ئەگەر ئەو چاکەیەشم دەربارە بکەی و ڕێگەی بابم بدەی بێتە لام و بە دیداری شابم، هەرگیز لە سوپاسگوزاریت رزگاریم نایە.

نوورەدین ئاواتەکەی پێك هێناو نەجمەدین، بەرەو فرزەندی جگەرگۆشەی – کە دەمێك بوو بۆی بە پەرۆشەوە بوو – بەرەو میسر چوو.

ڕۆژی بیست و چوارەمی ڕەجەبە مانگی ساڵی ٥٦٥ك (١١٦٩.ز) نەجمەدین گەیشتە میسر و خەلیفە عازد – هەر خودی خۆی – تا دەرەوەی پاتەخت بە پیریەوە هات و زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە پێشوازی لێکرد.

نەجمەدین ئەییوب کە مینا یاقوب پێغەمبەر، لە سوێی ئازیزی لە بەردڵان و جگەگۆشەی پاڵەوانی، جگەربرژاو و چرژاو و لە تاوی دووره دیدەیی یۆسفی میسری جوانی، تانە لە چاو و بێ تین و تاو بوو، هەموو ئاواتی هەر ئەوەندەبوو جارێك لە کەنارێکەوە هەواڵێکی بزنەوێ یان لەباتی دەنگ و باسی، بۆ کراسی، وەبەر بێڤل کەوێ. ئەوا خوا کارێکی وای کردووە کە دووبەدوو، ڕووبەڕوو دەبنەوە و هەمبەر بە یەك خۆ دەنوێنن و تێر و پڕ دەبەژن و باڵانی یەك رادەمێنن و دەس دەملی یەکتر وەردێنن و تەمی سەردەمی تووشی جودایی دەڕەوێنن و دێو و خێوی حەستەمی ڕۆژانی لێك بڕان و چاوەنۆڕی دەتۆرێنن و دەتارێنن. لەو تووشی یەکتر هاتنەوەدا،

فرمێسکی شادی هەڵدەوەرین و پەلك و بەرگی چرۆی داری پەژارە و خەمباری —وەك گەڵا رێزانی ساردەپاییز — دادەوەرین.

باب و کورِ پێك شاد و شوکور بوونەوە و لە ناو چەپڵەرێزان و گوڵبارانی حەشاماتدا بەدڵی خۆش و چاوی روونەوە بەرەو ماڵ بوون و بۆ ناو شار چوونەوە.

سەلاحەدین لە بەرانبەر ئەو سەروەرە خاوەن ناوەی باویدا، هەر دەبوو بە تنۆکە ئاوێك و بە چاوێکی ئەوەندە بەرێزەوە سەیری دەکرد کە هەموو کەس سەیر دەما.

هەر کەنەجمەدین تۆزی رێگەی تەکاند و شەکەتی ڕەواند و پشووی داو حەسایەوە، سەلاحەدین کەوتە خاك و پایەوەو لەبەری پاڕایەوە کە وەزیرایەتییەکە خۆی بیکا و ئەمیش وەك بەندەیەکی ئاڵقە بە گوێ فەرمانبەرێکی بە گوێ و گوێ لە مست و راست و درووست، لەبەر دەستیدا راوەستێ و بە راوێژ و فەرمانی ئەو دانیشێ‌و هەستێ و نۆکەرێکی کەمبەرە بەستەی بێ. بەڵام نەجمەدینی وا پسپۆڕ و دورناس — کە دەیزانی نرخی کوڕەکەی چەندەو چەند هێژا و بە جەوهەر و هونەروەر و مەرد و رەندەو چاوی تێوە بوو کە چۆن ئەستێرەی بە گرشەی شکۆ و سەربڵندی، لە ئاسۆی هات و کامڕانیدا دەدرەوشێتەوەو سات بە سات پتر دەگەشێتەوە — باش تێ گەیبوو کاڵای خونکاری هەر بە باڵای ئەو بڕاوەو لە کەسی تر ناوەشێتەوە، بە هیچ ئاوایەك ملی نەدا جێگەی بگرێتەوەو بۆی لە خودا پاڕاوە کە هەر باڵادەست و کامڕەوا بێ، لە سەرەتاکانی مانگی محەڕەمی ساڵی ٥٦٧.ك (١١٧١.ز) دا، خەلیفە عازد بە نەخۆشی لەسەر جێگا کەوت و پتر لە دەرۆژی نەخاياند کە چاوی لە دنیای روون نوقاند و لە مەڵبەندی رابردوواندا لە ناو نوێنی گڵکۆدا بۆ هەمیشە لێی خەوت[١٣].

سەلاحەدین بوو بە یەکەمین کەلەپوورگری خەلیفەی خوالێخۆشبوو. هەر کە خەلیفە سەری ئاوا بوو، سەلاحەدین خۆی گەیاندە سەر گەندینەی گەواهیرات و کۆ — کۆ و ولودە— لۆدەزێر و زێو وەسەر یەك نرابوون و هەڵدرابوونەوە. چەند یەغدان و سندوق و

تێر و جەواڵ، لە خشڵ و خەمڵی دوڕ ویاقووت و زمڕووت و لاڵ، قەڵاپەچن و دارماڵ بوون، هیچ لێی رانەوەستا، سووکە دەستێکی پێدا هێنا و رایماڵی.

ئەو هەموو دراوە — لەسکە دراوە، لەزێر و زێوان — کە دەژمارە وپێوان نەدەهاتن و بە ساڵ و زەمانان کۆمەڵی ئیسماعیلی بەو نیازە کە رۆژێك دێت و دراو بۆ رۆژی وا بە کاریان دێت، قۆشە —قۆشە و چکە— چکە بە گردەوەکۆیی وەسەر یەکیان نابوو، لە خەزێنەی خەلیفەکەی خۆیان دانابوو، هەمووی مابوو، بە خڕوپڕی و سووك و هاسان کەوتە دەس گەڕناسانی کورد.

یافیعی لە تاریخەکەیدا دەڵێ: هێندێك لەو شتانەی کە دەگەنجینەی عازیددا بووە و دەست سەلاحەدین کەوتووە، دار عەسایەك لە زمرووتی رووت و سەدهەزار بەرگ کتێبی دەست نووسی زۆر هێژا و خۆشخەت بووە [١٤] ئیتر لە پاش مەرگی عازید ناوەکەشی لە ئاسۆ ئاوا بوو، کاروباری دنیاداری لە میسردا بۆ سەلاحەدین یکلا بۆوە.

سەلاحەدین ئەو جار دەستی کرد بە رێك وپێك کردنی دارایی و داهاتی میسر و لەشکری زۆر و تێری ساز کرد و ئەوەندەش بە دادگەری و دڵسۆزی رەفتاری دەگەڵ ژێردەستان و بێ دەستان دەکرد کە دڵی زۆبەی زۆری خەڵکی میسری بە لای خۆیدا هێنا و لە هەموو گۆشە و کەناران و گوند و شاراندا، باس هەر باسی پیاوەتی و کارچاکی سەلاحەدین بوو.

کە سەلاحەدین لە میسردا بوو بەو دەسەڵاتدارە، چاوچنۆك و چرووك و قرپۆکە پیاوان، لە لای نوورەدین بۆیان تێ چاند و پێیان راگەیاند کە سەلاحەدین وەك پادشا لە خۆی دەڕوانێ و خۆی بە پیاوی تۆ نازانێ. نوورەدین دڵی لە سەلاحەدین کرمێ بوو، لێ بڕابوو کە بۆ خۆی بچێتە میسر و یەکێکی تر لە جێگەی سەلاحەدین بکاتەوەزیر و ئەوی لەسەر کار لابەرێ. سەلاحەدین کاتێ بەم کەین و بەینەی زانیەوە، کۆڕێکی پێك هێنا و باوکی و خاڵی و خزم و کەسی خۆی کۆکردەوەو مەبەستەکەی

خستە گۆڕێ و داوای کرد کە لە هەموو سەرێکەوە لێی بتۆژنەوە و بیر و بڕوایان چییە دەری بڕن.

تەقیەدین — کە برازایەکی سەلاحەدین بوو— لە ناو کۆڕەکەدا هەستا و گوتی ئەگەر نوورەدین هەر پێی داگیرت و هاتە میسر، بە لەشکرەوە پێشی لێ بگرین و بەگژیدا بچین. ئێمە هەتا دەسمان چەك بگرێ و هەتا رەگی تەڕمان دەلەشدا مابێ، نابێ میسر لە دەست خۆمان بدەین.

نەجمەدین کە لای سەرووی هەمووانەوە رۆنیشتبوو، وتارەکەی نێوەچڵ بە تەقیەدین بڕی و گەلێکی جوێن پێدا و دەری کردە دەرەوە. ئەمجار رووی کردە سەلاحەدین و پێی گوت: کوڕی خۆم! من باوکتم و شەهابەدینیش خاڵتە، ئێمە تۆمان لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ. ئەگەر ئێستا ئیچمە هەردووکمان چاومان بە نوورەدین زەنگی بکەوێ، دەکەوینە خاك و پایەوەو دەستەونەزەر بە نۆکەری لە بەر دەسیدا دەوەستین. جا کە ئێمە باوك و خاڵت بین و وابین، کار بەدەستان و سەردارانی چەکدارانت دەبێ چۆن بن؟ ئەگەر بە راستی و بە وردی بیر بکەینەوە، ئەم وڵاتە پارچەیەکە لە زەوی و زاری نوورەدین مەحموود و ئێمەش هەموو نان خۆرو کۆیلەی ئەوین. ئەگەر ئارەزووی دەرکردنمان بکا، ناچارین بڕۆین و ئەگەر فەرمانی سزادانمان بدا، سەر بە فەرمانین. ئەگەر بە قسەی بابی خۆت دەکەی، وەرە و وەك پێت دەڵێم بە نامەیەك بۆ نوورەدین مەحموودی بنووسە: گەورەم! وەك من گوێ بیستبووم گوایە دڵی پڕ بەزەیی و پیرۆزت هاتۆتە سەر ئەو نیازە کە لەشکری نەبەز و هەمیشە سەرکەوتووەکەی خۆتان بنێرنە میسر، بۆ رزگار کردنی، وەك من بیری لێ دەکەمەوە لام وایە هیچ ئەمەی پێ ناوی و بۆ منیش لە مردن گرانترە کە ئێوە تۆزی رێگاتان لێ بنیشێ و خودا بەو رۆژە نەکا لە رێگەدا ئێوە شەکەت و ماندووبن.

من تا ئێستا هەرگیز لە کۆیلەیی و نۆکەری ئێوە سەرپێچیم نەکردووە و ناشیکەم. هەتا دەمرم و بگرە دوای مردنیش من خۆم و گیانم پاسەوانی پێچکی تەختی فەرمانڕەوایی ئێوە دەزانم.

تا تۆم ناسیوە من خۆم فڕێ دا          هەرچی بیفەرمووی سەرم لەڕێدا

ئەگەر خودا نەخواستە لە منی کۆیلەی ئاڵقە بە گوێوە ئاکارێك سەری هەڵدابێ، یان کارێکی وا رووی دابێ کە بەهۆیەوە تۆز و گەردێك لە دڵی رۆشنی ئێوە نیشتبێ و من خۆم پێم نەزانیبێ، دیسان پێویست بەوە ناکا رەنجی سەفەرت بدەمە بەر باری گوناهم لەسەر خۆم سەنگینتر بکەم لەوێوە نۆکەرێکی بەردەستی خۆتان بنێرن، با لێرەوە بە دەستی خۆی زنجیر بخاتە گەردنمەوە و رەکێشم کا هەتا دەمهێنێتە بەر ئاستانەی دەرگانەی خانەدانی سایە چەورت.

بەندەی سەرکز و شکستە باڵم          خۆڵی بەر دەرگات بە چەم دەماڵم

سەلاحەدین لە ئامۆژگاری بابی دەرنەچوو، نامە نووسرا و بە رێ کرا. کۆڕ بڵاوەی کرد و لە بێگانە هەڵوەژێرا. نەجمەدین و سەلاحەدین دوویەدوو مانەوە. باوك رووی کردە کوڕی خۆی و گوتی: کوڕم! تۆ هێشتا لاوی و سەرت گەرمە و زوو هەڵدەچی! هێمان سارد و گەرمی ژیان، قاڵی نەکردویت و لەکڵی دەرنەخستویت و لە بەروارد کردنی سوود و زینتدا پوخت و پاراو نەبوویت. دەبێ ئەوەندەبزانی هەر وەك گەف و هەڕەشەی نوورەدین لە شامەوە بۆ تۆ گەیشتووە، هەرا و گوڕەشەی تۆش بە نوورەدین دەگاتەوە. ئەوی سرتەی خەڵکت بۆ دێنێ، لای خەڵکیش بۆت تێ دەچێنێ، سبەی رۆژ نوورەدین دەیزانیەوە کە تۆ چنگت بە سەر میسردا گرتووە و ناتەوێ بەشی ئەوی لێ بدەی، هەچی لە هێزو توانایدا بوایە و دەستی پێ راگەیبایە، دەیهێنا کایەوەو لەشکری شام و موسڵی لێ دەنگ دەداین و دەهاتە سەرمان بۆ شەڕمان و سا بە هەر نرخێك بۆی بکرایە و بە هەر جۆرێك بۆی ژبلوایە، ئەوەندەی زیان پێدەگەیاندین، ئەگەر بۆشی دەر نەکرابایین هێز و گوڕی زۆر لێ هەڵدەقرچاندین بەڵام وەك دەڵێن: مار بە

فیتوی نەرم لە کون دێتە دەر، ئەم باریك رستنەی ئێستامان ئەو گشتە کە گشتە وەها خاو دەکاتەوە کە باو ناخواتەوەو ئاو بە ئاگردا دەکرێ و کێشە دادەمرکێتەوە.

کوڕم! ئێمە لە باتی ئەوە کە شەڕی نوورەدین بکەین، زۆر ئەکری گرینگترمان لە پێشەو دەبێ بەرەو پێشی ببەین و ئەنجامی بدەین و دوا رۆژی خۆمان قایم کەین[١٥].

لە راستیشدا هەر وەك نەجمەدین بەراوەردی کردبوو، راست هاتەوە. کاتێ نامەی سەلاحەدین و باس و خواستی ناو کۆر و گفت و لفتی نەجمەدین گەیشتەوە نوورەدین، پشووی هاتەوە سەخۆ و ژەنگی دڵتەنگی مشت و ماڵ کرا و وەرامی نامەی سەلاحەدینی بە رووخۆشی و پڕ لە دڵخۆشی دانەوە نووسیەوە و تیا درکاندی کە : ((جگە لە تۆ کەس لە سەر میسر نابێ و تۆ دەستی راست و دڵسۆزی بە راستی منی و لەوە بەو لاوە کەس رای ناکەوێ بەدگۆیی تۆم لە لا بکاو رێگە نادەم لە گوڵ کاڵترت پێ بڵێن)).

ساڵی ٥٦٨.ك (١١٧٢.ز) نەجمەدین ئەییوب رۆژێك لەسەر ئەسپ هەڵدێرا و چەند رۆژێك لە ناو نوێن و باندا بە نەخۆشی مایەوە، ئەوسا گیانی بێ تاوانی بە بینایی چاوان سپارد.

کورشی پایەبەرز و خاوەن شکۆی، لە بەرێکردنی تەرمەکەیدا، داربەستی خستە سەرشانی خۆی و لە شوێنێکدا کە شایانی ئەوباوکە بێ وێنەیە بوو، بە خاکی سپارد و پرسە و سەرەخۆشی شاهانەی بۆ دانا.

نەجمەدین ئەییوب شەش کوڕی لە پاش بەجێ ما: سەلاحەدین یوسف، سەفەدین محەمەد ئەبوبەکر، شەمسەدەوڵە تورانشا[١٦]، سەفەلئیسلام توغرولتەگین، شەهەنشاه، تاجەلملووك بوری[١٧].

نورەدین مەحموود ساڵی ٥٦٩.ك (١١٧٣.ز) سەرزەمینی بەجێ هێشت و بە مردنی ئەو سەلاحەدین بەبێ لەمپەرو بەرگر پادشایەتی میسری بۆ رەخسا و هیچ کۆسپی لەو

بارەوە لە سەر ڕێ نەما و هەر بەوەندەشەوە نەوەستا، دوای ماوەیەکی کەمیش شامیشی خستە ژێر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی خۆیەوە و ئاڵای دەوڵەتی ئەییوبی بەسەر وڵاتی شامیشدا شەکایەوەو هەناسە سارد و بێ دەرەتان و شەکەتی ئەرکی ژیانی، لە ژێر سایەدا حەسایەوە.

سەلاحەدین کەسی بێ کەسان و فریاڕەسی بێ دەسان بوو. بەدکار نەویست و هەژار خۆشەویست بوو. ڕووی لە هەر لایەك بکردایە، ئاهۆی پیسی و بێ فەڕی و نەگریسی لێ دەتاراند و هەر شوێنێك سایەی ئەوی پێدا رابردایە، پیت و بڕەوی بەرێژەوی بەسەر دانیشتوانیدا داباراند.

لە دوای شامیش زۆری نەخایاند کە شاری قودس و خەلیلە رەحمانیشی لە فەرەنگان پاکردەوەو خوار و خاچی راست و یەکلا کردەوە.

## تەرابلوس و یەمەن:

لە لایەکی تریشەوە سەلاحەدین بەهائەدین قەراقوشی برازای خۆی[١٨] بە لەشکرەوە بەرەو خۆریشین بەڕێ کرد و ئەویش خاچ پەرستەکانی لە تەرابلوسی غەرب وەدەر نا، کە دەمێك بوو چەپاویان دەکرد.

تیرێژی ئەستێرەی بەختی سەلاحەدین سات بە سات پتر و زۆرتر سەرزەمینی دەتەنیەوەو سروەی ئازادی لە سایەی ئەو خانەدانەدا، دەم بە دەم خۆشتر دەشەنیەوە، هێشتا هەواڵی گرتنی تەرابولس کۆن نەببوو، کە مزگێنی هات وا توورانشاش یەمەنی گرت و ئەو لە دین دەرچووەی کە بە زۆر دولینگەی بە سەر یەمەندا بەردابۆوە و ناوی عەبدولنەبی بوو، لە شەڕگەدا بە دەستی پیاوەکانی توورانشابە کوشت چوو.[١٩]

وەك باسمان کرد زۆربەی زۆری وڵاتی شام –بە دەمشقی پاتەختەوە– کەوتە ژێر دەستی سەلاحەدین مەلیك ساڵح ئیسماعیل کوڕی نورەدین مەحمودیش فەرمانڕەوایەتی حەلەبی بە دەستەوە مابوو، بەویٚ دامەزرابوو.[٢٠]

سەلاحەدین ساڵی ٥٧٢.ك (١١٧٦.ن) فەرمانیدا دیوارێك بە درێژایی بیست و نۆ هەزار و سێسەد گەز لە رووکاری بیابانەوە بە هەر چواردەوری قاهیرەدا بکێشریٚ. لە هەموو لایەکەوە وەستا و فەعلەیان لیٚ کۆکردەوە و دەست بە کار کرا و هیچ وەخت کار رانەگیرا و پشوی تیٚ نەکەوت و وچانی لیٚ نەدرا و هەتا دوارۆژەکانی ژیانی سوڵتان ئەو قوڕەکاریە دوایی هەر پیٚ نەهاتبوو.

## شەڕی ڕەملە :

ساڵی ٥٧٣.ك (١٢٧٧.ن) سەلاحەدین بە لەشکری زۆرەوە هێرشی بردەسەر شاری عەسقەلان و قەڵاکانی دەورو بەری تاڵان و ماڵێکی زۆری لە خاچپەرستەکان گرت. نیازی وابوو ڕەملەش بگریٚ. ئەو لە ڕێگەی ڕەملەدا بوو، لە پڕونەکاو لەشکرێکی گەورەو گران و لە ژمار بەدەری خاچپەرستان، وەك لێشاو بەوناوە وەربوون و لەشکری سەلاحەدینیان دەناوە خۆ گرت و دەرەتانیان بۆ نەهێشت و بوو بە کوشت و کوشتارێك لەو ڕۆژەدا باب وئاوڕی وە سەر کوڕی خۆی نەدەداوە. لەبەر تۆزی سواران، ڕۆژی ڕووناك و تاووساو، ببووە شەوەزەنگێکی ئەنگوست لە چاو. دەم و دووخی شیران وەك راخوشینی ئەستێران دەبریسکانەوە. لیزمەی بارانی تیران وەك تەرزەی خاکەلێوە لەو نێوە، کەی کەم ئیسەی کەم دای دابوو. لە هەر چوار کەنارانەوە، لە سۆنگەی خوێن بارانەوە، جۆی خوێن جۆخینی جەندەکی کوژراوانی گرتبووە بەر خۆی و رایدابوو. هەر گۆشتی تەڕ بوو بە دەم دەبانانەوە زوێلٚ دەبوون و هەروا گیان بوون و بە دەم هەنیسکانەوە دەردەچوون. هەتا رمبی حەیزەرانی هەژدەقەفی بەگەل دەلەرین، سەری سواران لە دەشتی شەڕگەی بەریندا، وەك سێوی باوەرێن دادەوەرین.

هەر چەندە سوارچاکانی فەرەنگ یەکجار زۆر و زۆر ئازاو لە شەڕدا نەهەنگ و خاوەن زۆریش بوون، بەلام لەشکری پەروەردەی دەستی سەلاحەدین کە ترسان و هەلاتنیان بەوپەڕی شوورەیی و نەنگ دەزانی، کۆی کەمی خۆیان وەبەر چاو نەدا و لە هەموو لایەکەوە هەر گوڕە و هەرا بوو. ڕۆژ ڕۆژی کوڕانە و شەڕ شەڕی فەرەنگ و کوردانە، پیاو لاشەی لە ناو گۆڕ بێ، نەك بمێنی و سەرشۆڕبێ. کەس لەو هەنگامەیەدا خۆی نەوەشارد و لە جەنگ خۆی نەبوارد.

لەشکری سەلاحەدین قارەمان هەتا شیری بڕی و تا هێزی تێدا ما، لەشەڕدا ما و لە شەڕ، دانەما و دوژمنی خۆی زۆر شپرێو کرد، بەلام لە زۆرانی کەم دەگەڵ زۆرەدا، زۆری زیان پێ گەیشت و بەشی هەرەزۆری بەسەربەرزی چوون. برازای سەلاحەدین کە ناوی تەقیەدین و تەمەنی لە بیست بەهاری تێ نەپەڕاندبوو لەو شەڕەدا خونچەی ژینی پەرپەر کرا و لەسەر رووپەڕی سیایی ڕیزی مەردەنەمرەکاندا جێی خۆی کردەوە.[٢١] تەنانەت سەلاحەدین خۆشی زۆر جاران لەو شەڕەدا کەوتە تەنگ و چەڵەمەوە و درایە بەر گەمارۆ و خرایە شوێنی بەرتەنگ و مەودا کەمەوە و بەهەزار ناری عەلی و بە زەبری شیر و بە نووکی خەنجەر، لەمپەری پەڕاند و ڕیزی دڕاند و ڕێی بۆ خۆی کردووە و بە لەشکر شکاویخۆی گەیاندەوە میسر.

خاچپەرستەکان لە دوای ئەو سەرکەوتنەیان لەشکریان بردەسەر حەماو لە دەوری قەلاکەیدا چوار مانگ مانەوە.

لە بڕانەوەی ساڵی ٥٧٣ك (١١٧٧ز) دا قەلای حەڵەب بە بێ شەڕ و لە ڕێی ئاشتیەوە کەوتە دەست سەلاحەدین و ئەویش فەرمانڕەوایی حەڵەبی بە مەلیك زاهیری کوڕی خۆی سپارد.

## هێرشی سەرشام:

خاچپەرستەکان ساڵی ٥٧٤ك (١١٧٨ن) بە نیازی داگیر کردنی شامەوە هێرشیان هێناو لەو دەمەدا فەڕوخ شای[٢٢] برازای سەلاحەدین —لەباتی مامی— بەسەر شام راگەیشت، خۆی لێ ساز دان و ڕێبازی لێ بڕینەوە دەڵێن: نانێکی خواردووە بەو ڕۆنەوە، هاتووە بەو پێ و شۆنەوە. فەرەنگ لایان وابوو لە هەموو هەوران هەر دەبارێو جارێ سەرکەوتوون تازە دانابەزنەوە، بەڵام کە فەڕوخ شا خۆی دەرخست، بۆی دەرخستن کە بە تاقەگوڵێك بەهار دانایە و ئەو کوردەی ئەوان نەیانناسیوە بە تێشکانێك ورەیان بەرنەدایە و هەرگیز ترسیان بە دڵدا تێنەپەڕیوە. دوو لەشکر پێك وەربوون و دەگژ یەك راچوون و هەنگامەیەکی زۆر بەسام روویدا. ئەو ڕۆژە لەشکری ژێر سەرکردەیی فەڕوخی کورد، کارێکی بە فەرەنگان کرد با بە دەواری شرِی ناکا. هەر خاچ بوو دەسینگی فەرەنگاندا دادەپاچان و خوار دەبوونەوە و هەر خاچپەرست بوون بە سەر قەڵپوزی زیندا لار دەبوونەوە و بەرەو بەهەزاری مەرگ گلار دەبوونەوە. فەڕوخ تۆڵەی رەملەی دەقات لێ ساندن و زۆر پیسی شکاندن و تێی گەیاندن کە خەونی بەراوەژوویان دیوە، تەنانەت سەرکردەکەشیان لە کۆڵ دنیایەك کردەوە.

هەر لە ساڵی ٥٧٤ك (١١٨٧ن)دا شەهابەدین لالۆی سەلاحەدین —کە فەرمانڕەوای حەما بوو— ڕۆژی لەسەر زەوی نەمابوو، دنیای روونی بەجێ هێشت و مەلیك موزەفەر تەقیەدین کوڕی شەهەنشای کوڕی نەجمەدین لە جێگەی ئەو کرا بە فەرمانڕەوای حەماو تا ساڵی ٥٧٧ك (١١٨١ن) فەرمانڕەوایی کرد و ئەویش رووی کردە بارەگای خودا و دنیای بێ تان و پۆی بەخۆی ڕەوا نەدی.

ساڵی ٥٧٦ك (١١٨٠ن) شەمسودەوڵە توورانشا کوڕی نەجمەدین، ئەو ئازا و فیلەتەنەی بە زەبری شیر هەمو شار و گوند و چیا و چیمەن و دەشت و بەندەنی یەمەنی سەند و چووبووە ئەسکەندەرییە، گێژاوی مەرگ وەك گێژی ئەسکەندەر دەناو

خۆی گرت و روو بە نەمان رۆی هێشت. تەرمەکەیان هێنایەوە شام و لە فێرگەیێکی بنیاتی خوشکیدا نێژرا. لە پاش نەمانی توورانشا سەیفەلئیسلام تغتەگین توغرول تەگینی برای کرا بە جێنشینی و بوو بە فەرمانڕەوای یەمەن.

## شەڕی تەبەریا (طبرية)، کە بە شەڕی حوتتین بەناوبانگە:

ساڵی ٥٨٣.ك (١١٨٧.ن) ڕۆژێکی هەینی، لە ڕۆژەکانی مانگی مەولوود، لەشکری سەلاحەدین و لەشکری خاچپەرستان، لە دەشتی تەبەریا گەیشتنە یەك و بەرانبەر بەیەك وێستان.

ئەوە ئەورۆژە بوو کە سوڵتان سەلاحەدین بۆی دەگەڕا و پاڵەوانە داخ لە دڵەکانی مەگیرانیان پێوە دەکرد[٢٣] هەموو بە دڵ لێ بڕابوون کە ژەنگی جەنگی ڕەملە بە یەکجارەکی لە مێشکی فەرەنگان بکرێنن و وایان لەبەر یەك هەڵدڕێنن کە لە مێژووی تازە و کەونیشیاندا گرینگترین بەسەرهات و نەهتیان بێ.

لێك مۆڕبوونەوەی دووربەدوور زۆری نەخایاند، خێوی خوێنخوازی رووبەندی لە سەرچارەی درێوی لاداو بە چڕنووکی تیژ و نینۆکی درێژی پڕ قرێژی، لە شەپێلك و لاڕانی شۆڕەسوارانی شەڕانی ڕەبادا و لە پڕ دوو لەشکر وەکوو دوو دەریای لە گۆشتەو ئاسن، بە یەکا هاتن و پێکیان دادا. گوڕەو هەوهەوی سواران و کۆڕەو حیلەی کەحێلانو هابگرەی شیروەشێنان و دەبمرەی نێزەداران و ئاخ و ناڵەی برێنداران لەو دەشتەدا مەحشەرێکی وای بەرپا کردبوو ساوای بەر مەمکانی دەکردەپیرو زۆرهانێك. عیزراییل هەر چنگ و پلێکی ببووە هەزار پەل و بە تەرزێك لە گیانکێشان کەوتبووە پەلەوە، نەیدەپەرژا سەری خۆی بوخرێنێ و بە هیچ لایەکدا لا بکاتەوە.

ئەسپی دووبادی عەرەبی نەژاد، خاك و خۆڵی بۆ سمکۆڵی وە بەر نەدەهات و لە خوێناودا وە مەلە کەوتبوو. لە بەر پاکۆی لاشەو گیشەی جەندەك و گالێش و تەرمەکی تەرمان، نە بۆی دەلوا بۆ پێش بڕوا و نەلۆی دەکرا باو بخواتەوە. هەر سوارێك لەسەر

ئەسپی بپەڕیباو مەلـەی نـەزانیبا، تـازە لـە گـۆمی خوێنـدا دەرنەدەهاتـەوە. لەشـکری خاچپەرستان شکان، بەلام چۆن شکانێك؟ ئـەوی بـە بـیری خـۆی ڕێگـەی هـەلاتنی بـۆ خـۆی دەدۆزیـەوە و بـە خـەیاڵ بـۆی دەردەچـوو، وای سـەر لێ شـێوابوو کـە بـە سـەر دەچوو، بەرەو دوژمن رای دەکرد و نـووکی خەنجـەری مووکـار و شـیری جەوهـەرداری کورد وهەر لە ڕێوە دەیقۆزیەوە. ئەو لەشکرە گەورە و گرانەی فەرەنگ لەو رۆژەدا، لـە هەشتێك مشتێك و لە دیوارێك خشتێکی مابوو. شکستەی شەل و کوت و شکستیان بـە خـوێن و خـوڕەوە و لەشـی پـڕ لـە برینـەوە، ملیـان لـەو دەشـتە بەرینـە نـابو. هـەموو زەندەقی چووبوو، هیچی زراوی پێ نەمابوو. تەنانەت سوپاسـالاری هەرەگەورەشـیان، نەشیا دەربازبێ و بە دیل گیرا و زنجیری خرایە پا و پیلەوە.

هەلە و هەلکەوتووە:

سـەلاحەدین نەیهێـشت دوژمـن پـشوو بـدا و برینـی خـۆی بلێـسێتەوە و گۆشـتەزون بێنێتەوە. وای بە بشا زانی هەتا گەرمەبرینیان سارد نەبۆتەوە و بەخۆدا نەهاتوونـەوە، باشتریان سەرو گوێلاك بو کتێتەوەز هەلیکوتایە سەر بازێڕی عەکا و لەنەکاو ئابلۆقـەی داو لە خاچپەرستانی پاك کردەوە و چوارهەزار موسولمان —کە دیلی دەسـتی فـەرەنگ بوون — بەدەستی سەلاحەدین ئازاد کران.

ئـەو سـەرڕەوی هەلیکرتبوویـە، خـاوی نـەکردەوە و بـە پانـەوە هێرشـی بردەسـەر شارەکانی نابلوس و حەیفا و قیساریە و ناسرە و عەسقەلان و گـەلێك قـەلاو دژ و ئـاوی بەژ و دەشت و تەلانی تریشی لێ گرتن و ئەوسا فەرمانی دەرکرد کە چونکە لەشکر لـەو ماوە زۆرەدا هەر لە شەڕدا و شەکەت بووە، با وچان بداو مانـدووی بحەسـێتەوە و خـۆ بگرێتەوە و وەگورد بێتەوە. شەڕی لە وەدوامـان شـەڕی بەرانانـە و ئامـانج و مەبەسـت رووگەی پیرۆزی خاچپەرست و موسولمانانە.

## گرتنی قودس:

لە پاش ماوەیەك وچان و سانەوە، شەیپووری ئامادەبوون لێدرا و لەشکری سەلاحەدین بەرەو دەوروبەری شاری قودس کەوتەڕێ و گەیشتە جێ. سەر لە هەوەڵەوە لە لای خۆرنشینی شارەوە لەشکربەزی کرد. دوای چەند رۆژێك پلانی گۆڕیو بنکەی بردەلای خۆرهەڵاتی شارەوەو لەوێوە پەلاماری شار درا و شەڕی مان و نەمان دامەزرا. شاری قودس شێست هەزار خاچپەرستی تێدابوو، هەمووی بە گیان و دڵ لێ بڕابوو هەتا شیری ببڕێ و تاهێزی تێدا مابێ، شەڕی رووگەپارێزی بکا. زۆر چالاکانە چاکی مەردانەیان لێ بەلادا کرد و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و ملیان نا لە پتەوکردنی سەنگەرو دابەستنی چەپەر و شانیان دایە بەر بۆچین و مۆرەی دیواران و سەنگچن و هەڵنانی حەشارو پیواران و دڵیان دایە سەر سەربەخت کردن و شار بەدەستەوە نەدان.

سەلاحەدینیش بڕیاری دابوو بە هەر نرخێك لەسەر تەواو بێ، ئەو کارە گرینگە تەواو کا و کاری شەڕی خاچپەرستان بە یەکجاری یەکلا و یەکچاو بکاتەوە و قەدسیان لێ بستێنێ و موسوڵمانی لێ دابمەزرێنێ. لە هەر چوارلاوە بەرەوقانی قەڵاگر و مەنجەنیقی ئاگرپژێنی خستەکار و بەربووە کوچك پێدادان و بەردەباران و سووتمان نانەوە. دەم بەدەم و سات بەسات ئاڵقەی لە شار تەنگ دەکردەوەو هێچکی لە فەرەنگ دەکێشاو هیچزی بەربەرەکانی لێ هەڵدەقرچاندن و وای دەماڵی کولێ کردن، کە ئاواتەخواری مردن بن. رێگەی پشوودانی لێ بڕیبوون، هەرکێ سەرێکی هێنابا دەرێ، نەیدەبردەوە و کێ بەقەد بەرگە نوشتەیەکی دیار با، تیری ساردەکەوان ساردی دەکردەوە.

ئەم دەورەدانە فرەی نەخایاند و رۆژی هەینی بیست و حەوتەمی رەجەبی مانگی ساڵی ٥٨١.ك (١١٨٧.ز) خاچپەرستان توانای بەربەرەکانێ کردنیان بڕا و داوایان لە سەلاحەدین کرد کە لە خوێنیان خۆش بێ و بە دیلیان نەگرێ، شار دەدەن بە دەستەوە سەلاحەدین بەڵێنی پێدان و دەرگای شاری قودس کرایەوە و موسوڵمان بە شاگەشکەیی بە نێو قودس وەربوون و بەرلە هەموو شتێك چوون ئەو خاچە

زەبەلاحەیان ورد و خاش کرد کە لە سەر گومەزی بەردی سەخرەتوڵڵا قوتیانەوە کردبوو.

هەر ئەو ڕۆژە سەلاحەدین و هەواڵانی نوێژی هەینیان لە مزگەوتی بەیتولموقەدەسدا بەجێ هێنا و دەنگی سوپاس و شادومانی گەورە و گچکەی موسوڵمانان –لەو ڕۆژە مێژووییندا– گوێی فریشتەی عاسمانی[٢٤] دەزرینگاندەوە. ئاوا ماڵ بە ماڵ خۆ گیشتەوە و شاری قودس، کە لە ساڵی ٤٧٢.ك ڕا تا ئەو ڕۆژە دەبەردەستیان دابوو، سەلاحەدین بۆ موسوڵمانانی ساندەوە[٢٥]

ئەمجار سەلاحەدین و خاچپەرستان لە سەر ئەوە پێك هاتن کە هەر پیاوێك لە خاچپەرستەکان بیست دینار و بۆ هەر ژنێك دینارێك لە زێڕ سکەی شاری سوور سەرانە بدەن و ئازاد بن. هەر کەسیش ئەو دراوەی بۆ هەڵنەسوڕا، بە بارمتە بمێنێتەوە تا دەیدا یان بۆی دەدرێ. لە کۆ کردنەوەی ئەو سەرانەیە دراوێکی لە ئەندازە بەدەر کۆ کرایەوە و هەمووشی هەر لەوێ بەسەر لەشکرچی و مەلا و فەقێ و دەروێش و سۆفیاندا بەشرایەوە.

## قەڵای سەور:

لە پاش گرتنی قودس، سەلاحەدین لەشکری بردە سەر قەڵای سەرو و دەوری دا. قەڵا زۆر دژوار و حەستەم بوو، هەروا بە سووك و هاسانی نەدەگیرا و پشووی درێژەی دەویست. زستانێکی زۆر سەخت بەسەردا هات و لەشکر خۆی لە سەرمان لە دەرەوە پێ نەدەگیرا. بەند و بەستەڵەك پیاوەکانی کەسیرە کردبوو، لە بنەوە کەوتبوونە پرتەوە. لە سەر ئامۆژگاری ئامۆژگاران، سوڵتان دەستی لەو قەڵایە هەڵگرت و لەوێوە بە هێرشێکی گورج و گۆڵانەوە لە نەکاو پەلاماری شاری تەرسووسی داو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا گرتی و ماڵێکی زۆری لە خاچپەرستان دەسکەوت و لە پاش تالان،

شارەکەی سووتاند و بەرەو مەڵبەندەکانی تری خاچپەرستانی بزووت و وەك بزووت بە پووشەوە بنێی، شار لە دوای شار قەڵا لە دوای قەڵا دەکەوتنە دەست سەلاحەدین و لە هەموو لایەکەوە فەرەنگی راو دەنان تا گەیشتە قەڵای بەرزیە.

## قەڵای بەرزیە: (٢٦)

ئەو قەڵایە بۆ سەختی و هەڵەمووتی و رژدی ناوبانگی دەرکردبوو، بەرزایی دەگەڵ دیوارەکانی لە پێنسەدوحەفتا گەز تێپر بوو. بەڵام لێبڕانی سەخت و پتەوی سەلاحەدین، زۆر لەوە پتەوتر بوو کە قەڵایەکی بەدینە خۆی لە بەر بگرێ دەستی لێ هەڵنەگرت هەتا قەڵای بەرزیەش لە سەربەرزی کەوت و ملی بۆ سەلاحەدین چەماند و ئەوێشی لە دوژمن داتەکاند.

ئەمجار هێرشی بردەسەر ئەنتاکیا. خاچپەرستانی ئەوێ لە رێگەی ئاشتیەوە دەگەڵی پێك هاتن و هەرچی دیلی موسوڵمانانیان لە لا بوو هەموویان ئازاد کردن.

بەسەرکردنەوە:

لە پاش گەڕانەوە لە ئەنتاکیا، سوڵتان لەسەر بانگهێشتنی مەلیك زاهیر شای کوڕی چووە حەڵەب. مەلیك زاهیر پێشوازیەکی شایانی شانی میوانی مەزنی خۆی کرد و لە خۆشیان شاگەشکە ببوو.

سوڵتان بۆ ماوەی سێ رۆژان لە میوانداری رۆڵەی شیرینی مایەوەو لەوێوە چوو بۆ سەردانی تەقیەدینی برازای و ڕووی کردە شاری حەمایە. ماوەیەکیش لە لای ئەو مایەوە و زۆری دڵی تەقیەدینی دایەوەو لاواندیەوە و ناوچەی جەبەلە[٢٧] و چەند شوێنێکی تریشی پێ بەخشی و خستنیە ژێر فەرمانیەوە.

لەوە دوا سەلاحەدین گەڕایەوە بۆ دیمەشق چەند رۆژێکیش لەوێدا حەسایەوەو ئەمجار هێرشێکی بردە سەر شاری سەفەد[٢٨] و ئەوێشی بە بێ شەڕ و خوێنڕێژی دەسکەوت و لە سۆنگەی گرتنی سەفەدەوە، کەرەك و کەوکەبیش[٢٩] —کە سەر بەوێ

بوون- کەوتنە سەر قەڵەمڕەوی سەلاحەدینەوە. لەوێشەوە هاتە شاری قودس و نوێژی جێژنی قوربانی لە (بیت المقدس)دا کرد و پاشان چووە عەسقەلان و مەلیك عادلی برای لەوێ لابرد و ناردیە سەر قەڵای کەرەك و ئەمجار هاتە عەکاو فەرمانیدا شوورە کاول کراوەکەی نوێ بکرێتەوە و کۆنە و رزیو و بن خزیوی لێ دوور بخرێتەوە و عەکا بە وارشێکی قایم و پتەو دەورە بدرێتەوە.

## قەڵای شقیف [٣٠]:

لە پاش ئەو گەشت و گوزارە، سوڵتان هەر خۆی بە لەشکرێکەوە ڕکێفی هێنایە و چووە جەستەی قەڵای شقیف، کە قەڵایەکی زۆر رژد و سەخت و ڕەوەزێکی ماه و حەستەم بوو. دەوری لێدا و گێچەڵی تێهاڵاند.

خاوەنی قەلاکە خاچپەرستێکی زۆر پیتۆڵ و لە بنەوەبڕ بوو. دەیزانی ئەوە سەلاحەدینە و دیارە، تا دژەکەی نەستێنێ وازی لێ ناهێنێ و ئەویش ئەوەندەی بە بەرەوە نیە کە بتوانی هەتا سەر بەربەرەکانی سوڵتانی پێ بکرێ. رۆژێك هەر بە تاکە سوارە لە قەڵاکەی دەرکەوت و خۆی گەیاندە سەلاحەدین و گوتی وا خۆم هاوێشتە پەنای تۆوەو خۆم و ماڵ وخێزانم بە پیاوەتی تۆ دەسپێرم. سوڵتان زۆر بە رووخۆشی بەخێری هێناو لە وەرامدا گوتی، هەرچی تۆ ئارەزووتە بڵێ تا بۆت بکەم. کابرای خاچپەرست -کە زمانی عەرەبیشی زۆر باش دەزانی- عەرزی کرد من خۆم هاویشتۆتە خاك و پای تۆوە، دەزانم مەردایەتی تۆ لە هەموو نیاز و ئاواتێکی ئێمەی تێپەڕاندووە و ئاشکرایە کە تۆ لە بەڵێنی خۆت پاشگەز نابیەوە. من هەر ئەوەندەم دەوێ خۆم و ماڵو خێزانم لە دیمشق دا بمەزرێنی و بژێوێکی وامان بۆ دەبەرچاو بگری کە نەمر و نەژی پێی بژین و سەری خۆمان راگرین. ئەگەر ئەو ئاواتەم بێتە دی ئەوا منیش بە خۆشی خۆم لە تەهی دڵەوە قەڵا بۆ پیاوەکانی سوڵتان جێ دێڵم و بە شانازییەوە هەتا دەمرم نانخۆری سوڵتانم.

سولتان بەو قسانە گەردی لە سەر دڵ نەماو دەگەڵی رێك کەوت و بڕیار درا کابرا بچێتەوە کارسازی خۆی بکاو ئەوسا بە ماڵ و منداڵەوە بەرەو شام بارکا. سولتانیش ــ وەك پەیمانی دابوو ــ لەشکری لە دەوری قەڵا دوور خستەوەو لە دوورەوە چاوەنۆڕ بوون کەنگێ قەیران بەسەر دەچی و کابرا لە قەڵا دەردەچێ، ئەو سایە بچنە ناویەوە، رۆژ هاتن و شەوگار چوون، کابرای تاین نەهاتە دەرو بەڵێنی نەبردە سەر و هەرچی گوتبووی هەمووی بە درۆ دەرچوو.ئەو رێوی بازی و فەندەڵ و فێڵەی هەر بۆیە کرد کە لەشکری سولتان هیچ نەبێ بۆ ماوەیەك سەر و دڵی بەردەن و رێی دەستی ببێ و دیوارە رووخانوان چاکاتەوەو کەل و قوژبنان داداتەوە و بورجان گورج کاتەوە و دانەوێڵە و تێشوی زۆر وەسەر یەك نێ و چەکی لە کارکەوتوو نوێ کاتەوە و کەللە لە کەللەی دوژمن بداتەوە.

سەلاحەدین هەستی کرد کە دەستی بەزاخەدا کراوە و بەزمانێکی لووس و دوو قسەی خۆش، فریو دراوە. زۆری لەبەر گران هات و فەرمانی بە لەشکری گرانی دا کە هەتا قەڵای شقیف دەگەڵ زەوی رێك نەخرێ نابێ وازی لێ بێنرێ. دەوری قەڵا درایەوەو سەر لە نوێ مەنجەنیقی ئاگرپژێن و کەرستەی قەڵا رمێن دامەزرایەوە. بەڵام هێشتا کڵی شەڕی بە گوڕوتاو بە تەواوی نێڵ نەدرابوو، نامە و ڕاسپاردە بە هەڵەداوان گەینە سەلاحەدین وخەبەریان دایە وا لەشکرێکی زۆر و زەبەندەی خاچپەرستان کە سەروبنی دیار نیە و کاری هەزار و دەهەزار و سەد هەزایش نیە و بەدەر لە هەژمارن و خوا نەبێ کەس نازانێ چەندن و چەند تەیارن و چییان پێیە، گەیشتوونەتە سەر بەندەرگەی عەکا و دەوری قەڵاکەیان داوە و زۆریان زۆری بۆ مەلیك عادل و دانیشتووانی شار هێناوە و کار گەیشتۆتە ئاڵۆزی و کزی و تەنگایەکەوە کە مەلیك عادل بە ناچاری ملی داوە شاری عەکا بە هەموو چەك و جبەخانەو گەمیە و کەلەك و بارەبەرانەوە بخاتە دەست فەرەنگانەوە و سەربارێش دووسەدهەزار دیناریان کاڵەدڕانە بۆ ببژێرێ و سەد دیلی خاچپەرستی گەورەشیان دەگەڵ پێنج سەد دیلی رەمەکی

سەربەوان ئازاد بکا و بەوانی بسپێرێ و ئەوانیش پیاوەتی بکەن رێگەی موسوڵمانەکانی شارەکە بدەن، لە شار دەرکەون و لە رێگەی خۆیان تێ نەگەیەنن و ئەوسا شارەکەش ببێتە مۆڵگەی فەرەنگان (٣١).

سەلاحەدین لە بیستنی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە گەلێك تەزووی سارد و گەرمی بە لەشدا هاتن و دەماری رێك هاتن و لە حیرسان گرژ بوو. هەرگیز چاوەنۆڕی ئەو رۆژەی نەدەکرد کە بنەماڵەی ئەییوبی بەو جۆرە سەرشۆڕیە مل بدەن و سەربۆ دوژمن دانەوێنن. لە عەیبەتان ژانی دەدڵ وێستان و لێ برِا کە ئەم پەرۆشینە لە شان بکاتەوە.

پسپۆڕانی لە شەڕزان و راوێژکەرانی زۆرزانی کۆ کردەوە و کۆڕیان بەست و مەبەستەکەی خستە بەردەستەوە. بیرو بڕوای هەموویان ئەوە بوو قەڵای شقیف واز لێ بێنن و هەرچی زووە فریای عەکایە بکەون. سەلاحەدین فەرمانی دا بە مەلیك ئەفزەڵی کوڕی  کە لە باتی بابی بە سەر دیمشق راگەیشت– بچێ و عەسقەلان وێران کا، چونکە دەترسا خاچپەرست دەستیان بگاتە عەسقەلان و پووڕ و تالانی بکەن و ئەوەندەیان لێ دەسکەوێ کە بۆ گرتنی شاری قودس خۆی پێ سازدەن.

مەلیك ئەفزەڵ بە خەڵکی عەسقەلانی راگەیاند کە شڕو شتاڵ و سڕو سیپاڵیان بپێچنەوەو عەسقەلان بەجێ بێڵن و روو بکەنە ناوچەی ترەوە. خەڵکی عەسقەلان کڵۆڵو چارەرەش دەستەپاچە ببوون و سەرە ودەرایان نەدەکرد کە چ بکەن و روو بکەنە کوێ؟ دەستیان کرد بە هەراج کردنی ئەو کەل و پەلانەی کە بۆیان وەدەرنەدەخرا. نرخی هەموو شت لە دەوە ببووە یەك و هێشتا کڕیاریشی نەبوو. لە تاریخی مراۃالجنان دادەڵێ: (( عەسقەلانیەك دوازدە مریشکی دەدا بە درهەمێك)). ئیتر بەو پێیە لێکی دەرەوە و بیری لێ بکەرەوە.

پوختەی مەبەست حەشامات و ئاپۆرەی زۆر –لە بۆرە پیاگ و لەشکری– بەربوونە خاپوور کردنی شارو لە رۆژی بیستەمی مانگی شابانەوە هەتا رۆژی نیەتی رەمەزان، داریان بەسەر بەردەوە نەهێشت و داروپەردوویان بەسەر یەکدا داو سەرەڕای کاول

کردنی، ئاگریشیان پێوەنا و لە خۆڵەمێش و مشکی بەولاوە –لە شوێنەواری ئەو شارە بەخت وەرگەڕاوەی تەخت کراوە– شتێك نەمابوو کە پێی بڵێن شت.

هەر لە سەر ئەو پلانە، شاری لودد و قەڵای رەملەشی بە مەرەدی عەسقەلان برد و بە سووتاوی و کاول کراوی بەجێ هێشتن.

بە لەشکرەوە بەرەو عەکا دەچوو، نامەیێکی لە مەلیك عادلەوە بۆ هات بۆی نووسیبوو خاچپەرستان ئێستا خاوتر قسە دەکەن و هاتوونەتە سەر ئەوە ناوچەی کەنار دەریا بدرێ بەوان و ئەوانیش دەست لە شەڕ و خوێنڕێژی بەر بدەن و ببنە دۆستی یەکجاریمان. تۆ فەرمانت لە سەر چییە؟ سەلاحەدین بەوە ڕازی بوو. مەلیك عادلی سپارد کە دەگەڵیان ڕێك بکەوێ. ئیتر هیم و بناخەی ئاشتی و شەڕ بەربەست کردن لە نێواندا دامەزرا و پەیماننامە نووسرا و بە سوێند و بەڵێنی پیاوانەش دابەسترا. هاتووچۆی بازرگانی برەوی سەند و هەر دوولا بۆ سارد و سەودا و کالا بە کالا دەچوونە ناو یەکتر و دنیایەکی کڕ و ئارام هاتە ڕوو.(٣٢)

سوڵتان ئەوسا مەلیك ئەفزەلی کوڕی بە لەشکرەوە ناردەوە شام، کە پشوو بدەن و بحەسێنەوە بۆ خۆشی چووە شاری قودسی و ماوەیەك لەوێ مایەوە و بەرەو دیمەشقی پاتەختی گەڕایەوە.

لە رۆژی بیست و حەوتەمی شەشەکانی ساڵی ٥٨٨ك (١١٩٢ز) گەیشتەوە دیمەشق و هەر کە خەبەری هاتنەوەی بلاو بۆوە، هەموو خەڵکی شام بە ژن و منداڵ و پیرو کاڵەوە، کەس نەمابوو نەچێ بە پێشوازی ئەو خۆشەویستەوەو هەموو کەس لەو رۆژەدا گەشە لە چاو و بزە لە سەر لێوان و مزگێنیان بە یەکتر دەدا و بە شانازی هەرەبەرزیان دەزانی کە چاویان بە دیداری ئەو نەبەرد و مەردەبەناوودەنگە روون دەبێتەوە.

## کۆچی یەکجاری:

ساڵی دوایی کە دەبووە ساڵی ٥٨٩.ك (فیبرایر ١١٩٣.ن) ڕۆژی هەینی پازدەی سەفەرە مانگ، سوڵتان سەلاحەدین بۆ پێشوازی حەجاجان -کە لە مەکە دەگەڕانەوە- لە شار دەرکەوت. لە گەڕانەوەدا تایەکی زۆر گرانی هاتێ. ئیتر بەو تایە کەوت و بەری نەدا و زۆریشی مەودا نەداو لە پاش دوازدە ڕۆژ، واتا ڕۆژی یەکشەممە بیست و حەوتەمی سەفەری ساڵی ٥٨٩.ك (٤ی مارس ١١٩٣.ن) ئەو خوداپەرستە خۆشەویستە، بەهەشتی بەرینی لە سەرزەمینی بەرتەنگ بە باشتر زانی و جیهانی بەرچاوتەنگی بەرەڵدا کرد و خێوەتی سەربەرزی لە بەر بارەگای یەزدانی دڵاوادا بەرپا کرد.

لە ڕۆژی مەرگی سەلاحەدین ئەییوبیدا وا بیر دەکرایەوە کە هەرچی خۆشی و شادیە سوڵتان لە پێش خۆیدا بە پێشباری بەڕێ کردووە، یان هەمووی بە شوێن کۆچباری ئەو نازدارەدا باری کردووە.

حەشاماتی شام و حەول و حەوشی، هەرچی لەو کارەساتە بە ئاگا بوو، بە خڕی و بە پانەوە جمابوون و تێکڕا گەورەو گچکە و پیر و منداڵ و ژن و پیاو لاو و کاڵو شارستانی و دەشتەکی و دارا و هەژار و خانەدان و ڕەمەکی و کاسبکار و جووتیار، قوڕبەشان و سەربەهەش و جەرگڕەش و دڵ بریان و چاو بە گریان بوون. جۆی فرمێسکی سوێر و سوور لە چاوانەوە سەری کردبوو. ئەو ئاپۆرەی لە ناشتنا بەشدار بوون و ئازیەتبار بوون، لە ئەندازە بەدەر بوون و لە شین و شەپۆرگێڕان و لە خۆدانەدا، لە ئەندازەیان بردەدەر. خۆ نەخوازە کە داربەستی تەرمی پیرۆزی دەرکەوت، دەنگی گریان و هاوار و ڕۆرۆ و شڵپەی دەستی لە خۆدەران و کوتەی لاقی لە پێش تەرما سەماکەران، گای ژێر زەمینی سڵ دەکرد و دڵی فریشتەکانی عاسمانی سەشینی دادەچڵەکاند و دادەخورپاند و رایدەتڵەکاندن. تەرمی پیرۆزی لە نزیک مزگەوتی ئەمەوی لە شاری دیمشقدا بە خاك سپێرا و لەشی کەوتە بن گڵ، بەڵام هەتا

دنیا دنیایە، سەلاحەدین نەمردووە و نامرێ و ناوی ئەو مەردە لە سەر زاری خەڵکی هەموو دنیا، هەموو زەمانان بە هەموو زمانان، هەر دەمێنێ و لە ناو ناچێ.

وا لە دنیا بژی ئەگەر بمری — هەرچی ناوت بزانێ بۆ بگری

پیاوی ئازا نەمان سەری نادا — ناوی چاك هەر دەژی لە دنیادا

## ئاکارەکانی:

سوڵتان سەلاحەدین هەر چەندی خوا حەزکا پادشایەکی دادگەر و بەلەنگازپەروەر و بەدەست و دڵ و ئازاد و ئازا و سەنگین و گران و رەزا سووك و خوێن شیرین و رووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو. پیاوی دەست رەنگین و هونەروەری زۆر لە لا هێژا بوو. دۆستی هەرە نزیکی پیاوی خوێندەوار و زانا بوو. رێزی لە بوێژ و نووسەران دەناو بۆ شیرینکار و بەجەوهەران سەروەر و پشت و پەنا بوو. هۆزان و پیتۆڵ و هونەرمەندی لە خۆی خڕ دەکردنەوە، کەمایەسی و کەم و کۆڕی ژیانی بۆ پڕ دەکردنەوە. لە هیچ چاکەیەك خۆی نەدەبوارد، با زۆریشی تێ چووبا. دەسەر هیچ خراپەیەکەوە نەدەچوو با زۆریشی پێ چووبا. لە رۆژگاری ئەودا کەس نەیدەوێرا بە خەیاڵیش خراپە بکا. هیچ دەستدارێك تە تیتوش دەس نەدەکەوت کە لە سەر بێ زۆران بادی هەوابێ. یان بیری زۆرکاری بە دڵدا بێ. لە ودم و پیتی ئەو سەرداره سەرزەمینی میسر گەیشتە چڵە پۆپەی گەشەداری و ببووە نموونەی ئارامی و خێر وخۆشی و هەرزانی. هێندێك لەو شوێنەوارە بەهرەدارانەی کە لێی بەجێ ماون هەر ماون و ئەمانەن:

١ و ٢ – مەدرەسەی قەڕافەی گەورە و مەدرەسەی قەڕافەی گچکە. کە لە نزیك گۆڕی پیرۆزی ئیمام شافعین.

٣– مەدرەسەی قاهیرەی موعیززی. نزیك بەو زیارەتگایەیە کە دەڵێن ئیمام حوسێنی تێدا نێژراوە.

کردووە و لە فێرگەی فازلیەدا لە قاهیرە کراوەتە فێرکار و دەرسی گوتۆتەوە و روویان لێ ناوە کە بیکەنە قازی. حەزی لێ نەکردووە و لە ترسی قازیەتی، لە میسر رای کردووە و پەنای بە دیمشق بردووە. دەپێشدا لەسەر شۆپی شافعی رۆیشتووە و لە شام رچەی مالکی رەچاو کردوە لە مزگەوتی گەورەی دیمشقدا کراوەتە مامۆستا و گەلێك کتێبی زۆر هێژای داناون و لەوانە نامیلەکەیەکە بۆ برەو پێدانی مەزەبی مالکی، شافیە لە سەرف و کافیە لە نەحودا بە شەرحەوە ئەو نووسیونی و شرح المفصل ومختصر المنتهی لە اصولی فقه و گەلێك شتی تریش هەر بەرهەمی ئەوە. لە پاشان کەوتە ئەسکەندەریەوە و رۆژی پێنجشەمە بیست و شەشی شەشەکانی سالّی ٦٤٦.ك (١٢٤٨.ز) لە تەمەنی ٤٦سالّیدا مردووەو لە دەری بابولبەحر لە گۆرستانی سالّح کوری ئەبووشامە نێژراوە.

باوکی ئیبنوحاجب بەرلەوە بێتە میسر، پەردەداری ئەمیر عیزەدین سەلاحی کورد بووە ولە شاری سند (زاخۆ) لە لای ئامێدیەوە ژیاوە و لەبەر ئەو پەردەداریەی باوکی ناوی ئیبنوحاجبی بەسەردا براوە. جەمیل.

٦٧- لە رووپەڕ ١٦٩ی اخباروالدول دا دەلّێ: مەلیك سالّح (نەجمەدین) ئەییوب نیازی وابوو بەرەو شام بچێ . دەترسا لەو بەینەدا عادلی برای، گێچەڵێك بکا. ویستی بینێرێتە قەلاّی شوبەك، عادل ملی نەدا کە دەرکەوێ. سالّح هێندێك کۆیلەی خۆی ناردن لە زینداندا خنکاندیان و بلاّویان کردەوە کە بە مردنی خۆی مردووە. جەمیل.

٦٨- مەلیك موعەززەم، تورانشایان پێ گوتووە. جەمیل.

٦٩- سانت لویس (سانلویی) ئیمپراتووری فەرانسە سوپا سالاری ئەو هێرشە بووە. جەمیل.

٧٠- زیانی سەلیبیان لەو شەڕەدا سەدهەزار کوژراو بوو. جەمیل.

٧١- مەلیك موعیز، عیزەدین ئایبەگ (ئاغابەگ) مێردی شەجەرەتوددورڕی ئەییوبی، لە سالّی ٦٥٣.ك (١٢٥٥.ز)دا خۆی کردەپادشای میسر و حەوت سالاّن

حوکمێکی سەربەخۆی کرد و میرات گرانی لە دوای ئەو بە چینی کۆیلە (تەبەقەی مەمالیك) ناو براون. جەمیل.

٧٢- ئەمین زەکی دەڵێ: سان لویی بە هەشسەد هەزار دینار خۆی کڕیوەتەوەو شاری دمیاتیشی داوەتەوە بە موسوڵمانان. جەمیل.

٧٣- زیرنۆف پرسەك (؟)ی لە سەر داناوە. رەنگە لەبەر هەڵەی ناوەکەی بێ، چونکە مووسا کوڕی عادل هەرگیز حیمسی بە دەستەوە نەبووە. تەنیا بەسەر میسر راگەیشتووە و ئەمەش زۆر لە دوای ئەوە بووە و راستەکەی ئەشرەف موزەفەرەدین موسای کوڕی مەنسوورە کە لە نێوان سالآنی ٦٤٤.ك (١٢٤٥.ن) و ٦٦١.ك (١٢٦٢.ن) پادشای حیمسێ بووە.

٧٤- لە تاریخی دووەل و ئیماراتی کوردی دا دەڵێ: ساڵی ٦٥٢.ك (١٢٥٤.ن) خەلیفەی بەغدا دەستی تێخست و ناسر و عیززەدینی ئاشت کردەوە. جەمیل.

٧٥- ئەمین زەکی دەڵێ: ساڵی ٦٥٣.ك بووە. جەمیل.

## حکومەتی ئەیوبی تا دامەزراندنی

## باپیر و باوکی مونەسیسەکەی کێن و لەکوێوە هاتوون:

ئەم دەوڵەتە، هەرە گەورەی ئەو حکوومەتانەیە، کە کورد دایمەزراندوە. لەبەرئەمە زۆر پێویستە، کە باش لە ئەصڵ و فەصڵی تێبگەین.

ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام، ئەڵێ: باپیری صەلاح ئەددین، مونەسیسی ئەم دەوڵەتە (شادی=شاژی) کوڕی مەروانە. کە لە کوردانی خێڵی (روِدای=راوندا) ی (دوین) بوو، ئەم خێڵە بەشێکی عێلە گەورەکەی (ئەزبەنی=هازبەنی) بوو. مەنسوبیەتی شاد، بە شاری دوین، نوقتەیەکی زۆر موهیمە، چونکە ئەیزانین کە حکوومەتی شدادی کورد، لە دوین[1] دا دامەزراو هەڵبەت لە زەمانی شادی دا، هێشتا شۆرەت و باسی ئەو حکومەتە لە فیکر نەچووبۆوە.

بەعزێ لە موئەریخینی عەرەب، ئەصڵ و نەسەبێکی دوورو درێژیان بۆ شادی هەڵبەستووە. مەسەلەن وەکوو ئیبن خەلدوون، کە نەسەبەکەی ئەباتەوە سەر (عوف ئەلحەمیر ئەلدوسی) بەڵام ئەمانە هیچیان جێگەی باوەڕ نییەو راستیەکەی ئەوەیە کە تأریخ، باپیری شادی ناناسێ.

کوڕانی شادی (ئەیوب، شێرکۆ)، لە گوندی ئەجدانکان=ئەجدنکان[2] هاتۆتە دنیاوە، صاحێبی (النوادر السلطانية) کە قازی ئیبن شەدادە، وە موصاحیبی تکریت بوو، صاحێبی (كتاب التأريخ)، کە تاج ئەددین شهنشای ئەیوبییە، ئەڵێ شادی خەڵکی (دوین)ە.

بەڕیوایەتێکی تر، نەجم ئەددین ئەیوب لە (شێختان)[3] هاتۆتە دنیاوەو لە موصڵ دا گەورە بووەو خزمەتی سولتان محەمەدی ملکشاهی کردووەو لە تەرەف ئەوەوە کراوە بە محافظی تکریت (الحروب الصليبيه ل١١٢)

خولاصە وەکوو ئینسیقلۆپەدیا، ئەڵێ: شادی لەگەڵ بەهرۆزی رۆمی، دۆستایەتی هەبوو، ئەم بەهرۆزە مامۆستای کوڕی سەلجوقیەکان بوو. لە پڕێکدا بەهرۆز (دوین)ی بەجێ هێشت و چوە بەغدا. وە بەهێزو مەعریفەتی خۆی زۆر پێشکەوت و لە تەرەف سوڵتان مەسعودی کوڕی ملکشاهەوە کرا بە محافظی بەغدا. لە دوای ئەمە خەبەری بۆ شادی ناردو بانگی کردە لای خۆی.

## چۆن پێشکەوتن:

باپیری سوڵتان صەلاح ئەددین، بە هیوای مجاهد ئەددین بەهرۆز، وڵاتی خۆی بەجێ هێشت و بەماڵەوە هاتە بەغدا. لەدوی بەینێك کە سوڵتان مەسعود، تکریتی بە موڵکانە دا بە بەهرۆز، ئەمیش شادی دۆستی بە وەکیلی ناردە سەر ئەو موڵکە. لە پاش چەند ساڵێك، شادی ئەمری خوای کردو لە تکریت نێژرا. وە نەجم ئەددین ئەیوبی کوڕە گەورەی لە جێگەی دانرا.

لەساڵی ٥٢٦هـ دا[٤]، ئەتاپکی موصڵ عیمادەدینی زەنگی، لە جنوبی تکریت لەگەڵ ئۆردووی سەلجووقی بەغدا، شەڕی کرد و شکاو بە حاڵێکی خراپ خۆی گەیاندە تکریت، نەجم ئەددین ئەیوب میوانداری خۆی و تەوابیعی کردو کەڵەك و بەلەمی بۆ پەیاکردو لە شطی دیجلە پەڕاندیەوە. حکوومەتی بەغدا لەم معاونەتی نەجم ئەددین ئەیوبە عاجزبوو.

لە دوای بەینێك و قوعاتێکی تریش قەوما. ئەسد ئەدیین شێرکۆهی برای ئەیوب، یەکێ لە ظابطی قەڵای تکریتی کوشت و بەم تەرحە جێگەیان لەق بوو. وە مجاهد ئەددین بەهرۆز بە ئەندێشەی مەوقیعی خۆی، نەجم ئەددین ئەیوبی لە وەکیلی خست و تەمێی کردبوو کە لە تکریتدا نەمێنن. نەجم ئەددین ئەیوب بە ناعیلاجی لەگەڵ براکەی‌و ماڵیانا بەشەو تکریتی بەجێهێشت و بە ئومێدی چاکەی عیمادەدینی زەنگی رووی کردە موصڵ.

ئەڵێن سوڵتان صەلاح ئەددین لە تکریت و لە ساڵی ٥٣٢هـ ( بە گوێرەی ئیستانلی لیمپول ١١٣٧م) دا هاتبوە دنیاوەو حەتتا بەعزێ کەس گوتوویانە ویلادەتی تەصادفی ئەو ڕۆژەی کرد کە مجاهد ئەددین بەهرۆز ئەمری بە دەرچوونیان لە تکریت کردبوو. بە گوێرەی قسەی کاتبێکی گاوور، کە لە خزمەت نەجم ئەددین ئەیوبدا بوو، ئەو شەوەی کە لە تکریت دەرچوون، سوڵتان صەلاح ئەددین تەوەلودی کردوە. وە چونکە باوکی زۆر عاجزبوو، وە لە طالعی خۆی بێزاربوو، لە تەوەلودی ئەم کوڕەی و گریانی زۆری، سەغڵەت بوو. بەو تەرحە تکریتیان بە جێ هێشت.

نەجم ئەددین و براکەی، کە گەیشتنە موصڵ، عماد ئەددین زەنگی، چاکەی ئەیوبی هێنایە بەرچاوی و بە رووخۆشی و مەمنونی قبوڵی کردن. وە ئیرادێکی موناسیبی بۆ تەخصیص کردن. دووبرا بە حورمەت و عیزەت، لە سەرای زەنگیدا مانەوەو لەگەڵیا چوون بۆ بەعزێ شەڕیش. وە قتێك کە عیماد ئەددین چوە سەر سوریاو (بەعلەبەك)ی داگیرکرد (٥٣٤هـ)، نەجم ئەددین ئەیوبی کرد بە محافظی ئەوێ.

لەدوای وەفاتی عماد ئەددین، موڵکەکەی کەوتە دەست کوڕەکانی. لەشکری شام هاتنەسەر بەعلەبەك. نەجم ئەددین ئەیوب زانی کە لەو پاشاگەردانیەدا، لەشکری شام، هەرچۆنێ بێ، بەعلەبەك زەوت ئەکا بە فیکرێکی دووربین، لەگەڵیانا رێك کەوت و چوە شام دانیشت و بەرەبەرە پێشکەوت، تا بووە سەرداری لەشکری شام. شێرکۆهی برای کە لەلای نور ئەددین مەحمودی کوڕی عماد ئەددین مابووەوە، ئەویش بە خزمەت و ئازایی و عەقڵ و کەماڵ خۆی، تەرەقی کرد و بوو بە سەرلەشکری نور ئەددین.

نەجم ئەددین ئەیوب، وەقتێك کە ئەهلی صەلیبی دووەم شامی موحاصەرەکرد، مودافەعەیەکی مەردانەو بەرزی کردو لافاوی صەلیب شکاولە شام دوورکەوتەوە.

ئەمیری شام هەرچەندە تابیعیەتی نورئەددین مەحموودی قبوڵ کردبوو، بەلام سوڵتان نورئەددین دیسان وەکوو باوکی هەرچاوی لە شام بوو. وە بە فیکری داگیرکردنی، لە ئیدارەی شێرکۆهدا، لە ساڵی ٥٤٧ دا لەشکرێکی ناردە سەر شام. ئەم

حاڵە نەجم ئەددین ئەیوبی خستە موشکیلاتەوە، چونکە حەزی نەئەکرد کە بەرامبەر بە براکەی بوەستێ و حەزی نەئەکرد لەگەڵ لەشکری کوڕی ولی نیعمتیا شەڕ بکا. بەم فیکرە باشە، ویستی ئیشەکە بە ئاشتی ببڕێتەوە. لەگەڵ شێرکۆهدا بەرەسمی کەوتە موخابەرەوەو لەدوا شەش رۆژ لەشکری شێرکۆه، داخلی شام بوو. لەدوای بەینێك سوڵتان نورالدین، صەلاح ئەددین کوڕی ئەیوبی نارد بۆ میصر، حاڵ بە نەوعە دەوامی کرد.

## ئەمیر صەلاح ئەددین چۆن پێگەیشت:

بەعزێ سالانی منداڵی، لە بەعلەبەکدا رابوارد. بەلام دائیر زەمانی منداڵی، تاریخ هیچ نازانی ستانلی ئەڵێ: ئەبێ صەلاح ئەددینیش وەکوو ئەمیر زادەکانی تر، لە حوجرەدا قورئانی خوێندبێ و فێری خوێندن و نووسین بووبێ. دیسان هەر لە بەعلەبەکدا کتێبی صەرف و نەحوی تەواو کردبێ و مەبادیی شیعرو ئینشاو عیلمی حدیث و بەعزێ شتی تر، فێربووبێ چونکە باوکی پیاوێکی زۆر گەورەو بلند بوو، بە تەبیعەت مامۆستای هەرە بەناوبانگی بۆ پەیاکردوە.

کتێبی ( طبقات الشافعیة) دەرحەق بە دەوری جاهیلی ئەڵێ صەلاح ئەددین عیلمی حدیثی لە لای حافظ ئەبو طاهر ئەلسەلەفی، و ئەبو طاهر بن عوف و شێخ قوطب ئەددین ی نیشاپووری و عەبدوڵلا بن بری ئەلنەحوی و بەعزێ مامۆستای بە شوهرەت خوێندوە. قورئان و فیقهی (تنبیە)ی لەگەڵ بەعزێ داستانی خبکاوری لەبەربوو.

دەرحەق بەو زەمانەی کەلە شامداو لە پێش چوونی بۆ میصردا، رایبواردوە، لە تەرەف موئەریخینی عەرەبەوە، هیچ نەبێژراوە. ئەمما موئەریخینی غەرب بەعزێکیان ئەڵێن: صەلاح ئەددین، دەوامی مەجلیسی سوڵتان نورئەددینی ئەکرد، وە بە سیفەتی ئەمەی کە کوڕی حاکمی شام بوو، حورمەت و عیزەتی ئەبینی. جوانێکی عاقڵ و شارەزاو بە ئەدەب بوو، ریعایەتی دینی زۆر ئەکرد و رەنگە وەکوو ئەمیرزادەکانی ئەو

زەمانە مەیلی راوو شکاریشی بووبێ. بێ شوبهە یاری ( گۆ و گۆچان)ی ئەکرد. بەعزەن لەگەڵ سوڵتان نورئەددین دا ئەم یارییەی ئەکرد.

بە گوێرەی کاغەزێك، کە لەدوای گرتنی شام، بۆ خەلیفەی عەباسی (مستضيء بیئەمریللاه)ی نووسیوە، لە پێش سەفەری میصردا، لەگەڵ باوکی و مامی لە هەموو غەزایەکدا، حازربووە. وەکوو صاحێبی کتێبی ( حیاة صلاح ئەددین الایوبی) ئەڵی بە مقتضای قەومیەتی کوردی، سوارێکی چاك بوو، وە لە شەجاعەت و شەهامەتدا، سەرفراز بوو.

قاضی ئیبن شەداد، لە ( النوادر السلطانية) دا ئەڵێ، کە لەگەڵ باوکیا لە بەعلەبەکەوە هاتە شام، دایمە لە خزمەت باوکیا بوو. وە لە فەزڵ و کەماڵی ئەو ئیستیفادەی ئەکرد، تا شۆرەتی سەند، لە دواییدا سوڵتان نور ئەددین حەیرانی زەکاو کەمالاتی بوو، رۆژ بە رۆژ مەقامی گەورەتر کرد.

## ئەوەڵ سەفەری میصر:

کە شاوری وەزیری خەلیفەی میصر، داوای کۆمەکی لە سوڵتان نور ئەددین کرد، سوڵتان شێرکۆهی بە لەشکرێکەوە نارد بۆ میصر (٥٦٢ھ[٥] و ئەمیر صەلاح ئەددینیش بە ئەمری مامی لەگەڵ ئەم لەشکرەدا چووە قوماندانی فیرقەی پیشدار. ئیبن شەداد ئەڵێ: ئەسەدەددین شێکرکۆه هەرچی ئەکرد بە پرس و رای ئەمیر صەلاح ئەددین ئەیکرد، چونکە زۆر عەقڵ و حوسنی تەدبیری ئەمین بوو.

شێرکۆه کە گەیشتە میصر، لەشکری (ضرغام) ی لە (بلبيس)دا شکاند و ئەم وەزیرەی لە قاهیرەدا موحاصەرە کرد. وە لە دوای (فسطاط)، قاهیرەش دەست شاور کەوت و (ضرغام) کوژرا، شاور، رووی لە شێرکۆه وەرگێراو نەیهێشت بێتە قاهیرەوە. لەسەر ئەمە، شێرکۆه ئەمیر صەلاحی بە لەشکرەوە ناردو بلبیس و شرقییەی زەوت کرد. شاور کە وایزانی، خەبەری بۆ (ئملريك)ی قەڕاڵی (قودس) و میصر، شێرانە، سێ

مانگ موودافەعەی کردو لە لایەکی تریشەوە سولتان نورئەددین بۆ کۆمەکێکی دووراو دوور چووە سەر مەملەکەتی قودس و قەلآی (بنیاس)ی موحاصەرە کرد. قەڕاڵی قودس، کە ئەمەی بیست، ترسی لێ نیشت و لەگەڵ شێرکۆه رێك کەوت و قەرارياندا کە لەشکری شام و قودس لە خاکی میصر، بچنە دەرەوە، وە لەسەر ئەم قەول و بڕە شێرکۆه بە لەشکرەوە گەڕايەوە شام.

لە دوای شێرکۆه شاوری فێڵباز، لەگەڵ فەڕاڵی قودس رێك کەوت لەشکرێکی بچوکی قودسی لە میصردا دانا، ئەمە بە تەبیعەت خیلافی موعاهەدەبوو، سولتان نور ئەددین لەگەڵ شێرکۆهدا قەراری گرتنی میصريان داو خەلیفەی عەباسی بەغداش بەمە رازی بوو.

## دووەم سەفەری میصر:

لە دوای سەفەری ئەوەڵ بە سێ ساڵ، شێرکۆه بە خۆی و ئەمیر صەلاح ئەددین و لەشکرێکی دوو هەزار کەسی هەڵبژاردەوە، رووی کردە میصر، وە لەدوای زەحمەتێکی زۆر گەیشتە (ئطفح) کە چل میلێك لە قاهیرەوە دوور بوو، وە لەوێشەوە خۆی گەياندە (جیزە). لەشکری مەلیکی قودسیش لە بارامبەرو لە قەراغی چەمی نیل بوو، مەلیك ئاموری، موعاهەدەیەکی لەگەڵ خەلیفەی فاگیمی ئیمزا کردو بەگوێرەی ئەم موعاهەدەیە، میصر کەوتە ژێر حیمايەی مەلیکی قودسەوە. لەدوای ئیمزای ئەم موعاهەدەیە، مەلکی قودس بە خۆی و لەشکریەوە، لە پرێکا لە نیل پەڕیەوە، شێرکۆه کە ئەمەی چاوپێکەوت، چوو بوو (صعید)و لەشکری قدس تەعقیبی کرد، شێرکۆه لە (بابین) راوەستاوە کە لەشکری قودس نزیکی بووەوەو لەگەڵیانا کەوتە شەڕەوەو بە جەسارەت و ئیدارەی باشی ئەمیر صەلاح ئەددین، لەشکری قودس زۆر خراپ شکا، وە لە دوای ئەم غەلەبەیە، لەشکری شام ئەسکەندەرییەی زەوت کردو شێرکۆه ئەم قەلآ گەورەو بە ئەهەمیەتەی دایە دەست ئەمیر صەلاح ئەددین ئەمە ئەوەڵ حاکمیەتی

ئەمیر بوو. لە دوای ئەمە، شێرکۆهـ نیوەی لەشکرەکەی بۆ ئەمیر صەلاح ئەددین بە جێ هێشت و لەگەڵ نیوەکەی تری چوو بۆ (صەعید).

مەلیکی قودس، لە دوای شکانی، گەڕایەوە قاهیرە و لەوێ لەگەڵ حکومەتی میصردا قەراریان بە موحاصەرەکەردنی ئەسکەندەریەدا، لە تەرەف بەحریشەوە (دوننما)یەکی قوردس رەفاقەتی موحاصرینی ئەکرد. ئەمیر صەلاح ئەددین بەرامبەر بە دوننماو لەشکری میصرو قودس، قەهرەمانانە مودافەعەی کرد. مەهارەت و جورئەتێکی زۆر بێ ئەمسالی نواند. حەفتا رۆژ بەم نەوعە بەرامبەر بە تەعەڕوزاتی بەحرو بەڕ، وەکو شێر وەستا.

لەولاشەوە شێرکۆهـ رووی کردە پایتەختی میصر و لە (برکە ئەلحەبەشە)وە دەستی کرد بە موحاصەرەی ئەم دەستوبردەی شێرکۆهـ ترسی خستە بەینی دوشمنەوەو تەڵەبی صوڵحیان کرد بە شەرتێ کە لەشکری قودس و شام، میصر بەجێ بهێڵن و ئیتر دەخلی ئیشوکاری میصر نەکەن.

لەدوای ئەم صوڵحە، ئەمیر صەلاح ئەددین چەند رۆژێك لە ئۆردووگاهی قەڕاڵی قودسدا بوو، بە تەبیعەت تەدقیقی ئوصوڵی عەسکەری ئەو قەومەی کرد بە گوێرەی ئەم صوڵحە، هەردوو لەشکر، لە میصر چوونە دەرەوە.

خیلافی صوڵح، ئەوەندەی پێ نەچوو کە قەڕاڵ (ئیملریك) گەمعی زەوتی میصری کردو، بە لەشکرێکەوە رووی تێکرد، (بلبیس)ی گرت و کۆشتارێکی زۆری لە خەڵکی میصر کردو منداڵ و ژنیش لە قەتڵ و عام نەجاتی نەبوو.

ئەمجارە خەلیفەی فاطیمی، بە نەفسی خۆی، کەوتە هاوارو کاغەزێکی بۆ سوڵتان نور ئەددین نووسی و رجای حیمایەی لێ کردو پرچی ئافرەتی موسوڵمانی بۆ ناردو ئەمەش عەلامەتی پاڕانەوەیەکی فوق ئەلعادەبوو.

شاوری وەرزیری خەلیفە، کە لە خائینی و درۆزنیدا ئەمسالی کەم بوو، بە ئومێدی پارە، مەلیکی قودسی تەفرەداو لەگەڵی کەوتە موخابەرەوە، مەقصەدیشی وەقت

رابواردنبوو، تا ئیمدادای سوڵتان نور ئەددینی دی، خولاصە بەم ئومێدە مەلیکی قودس، لە پێنج میلێکی قاهیرەدا راوەستا.

## سێیەم سەفەری میصر:

سوڵتان نور ئەددین، لەسەر پاڕانەوەی خەلیفە، قەراری خۆی دا، بە ظاهیری بۆ یارمەتی خەلیفەو لە حەقیقەتدا بۆ زەوت کردنی میصر لەشکێکی بە قوەتی کۆکردەوەو لە قوماندای شێرکۆهدا ناردی بۆ میصر. ئەم لەشکرە، هەشت هەزار کەسێك بوو، وە گەلێ ئومەرای مەشهووری تیا بوو، ئەمیر صەلاح ئەددین ئارەزووی چوونی نەبوو، بەلام بەرامبەر بە ئەمری سوڵتان و مامی نەیتوانی راوەستێ و لەگەڵ مامی چوو.

(ئملریك)، کە خەبەری هاتنی شێرکۆهی بیست شڵەژاو ئەوەڵەن ویستی نەهێڵێ لەگەڵ لەشکری میصردا یەکدگیربێ، بەڵام پێی نەکراو نیهایەت لە ربیعالثاني ٥٨٤ دا (کانوونی پانی ١١٦٩م) بە نائومێدی گەڕایەوە قودس.

لەولاوە، شێرکۆه گەیشتە بەردەمی قاهیرەو خەلیفەو خەڵکی میصر هاتن بە پیریەوەو بەیان شوکردو بەخێرهاتنیان کرد. لە دواییدا لەبەردەمی قاهیرەدا خێوەتی هەڵدا، لەپاشدا خەلیفەش هاتە ئۆردوگاو شێرکۆهی زیارەت کردو بەیانی شوکرو مەمنونیەتی کرد. شاوریش هاتە لای شێرکۆه و زۆر ئەپەری مەمنونیەت و مەحیبەتێکی درۆی نواند.

عادەتەن هەموو رۆژێك، بە سواری ئەهاتە لای شێرکۆه و وەکوو دۆستێکی چەند ساڵەو موخلیس، بێ تەکلیف ئاموشۆی ئەکرد. فیکری وابوو کە زیافەتێك بۆ شێرکۆه و ئومەرای شام بکاو لە فرصەتێکدا هەموویان لە ناوبەرێ، بەلام (کامل)ی کوڕی پێیزانیو هەڕەشەی لێ کرد و گوتی: " بەخوا شتێکی وا بکەی خەبەر بە شێرکۆه

ئەدەم !" لەگەڵ ئەمەشدا بۆ خیانەت کردن، لە فرصەت ئەگەڕا، ئومەرای لەشکری شێرکۆهـ هەموو، حسی خیانەت و درۆزنیی شاوریان کردبوو.

ڕۆژێکی جومعە، بە عادەتی خۆی شاور هاتە ئۆردووگاهـ شێرکۆهـ لەوێ نەبوو، ئەمیر صەلاح ئەددین لەگەڵ بەعزێ ئومەرای تر، لەگەڵیا سواربوون و لە سوارەکانی دووریان خستەوەو لە پاشدا خستیانە خوارەوەو قۆڵیان بەست و ناردیان بۆ خەلیفە. وە خەلیفە ناردیەوە دواوە تا سەری ببڕن و ئەم ئەمرەیان بەجێ هێنا و سەرەکەیان نارد بۆ خەلیفە. بەم تەرحە، وجودی ئەم وەزیرە خائینە، کە ئەوەندەی نەمابوو میصر بخاتە دەست فەرەنگ، هەڵگیرا.

لە دوای ئەمە خەلیفە عاضد، ئەسد ئەددین شێرکۆهی بانگ کرد و خەڵاتی وەزیریو لەقەبی (مەلیك ئەلمەنصور ئەمیر ئەلجیوش) ی دایە. ئەسد ئەددین شێرکۆهـ بە صیفەتی وەزیری خەلیفە، دەستی کرد بە ڕێکخستنی ئیشوکاری میصر، بەڵام وەزارەتی، ئەوەندە دەوامی نەکرد و لە ڕۆژی شەممە ٢٢ی جەمادی ئەلئاخر ٥٦٤دا ئەمری خوای بەجێ هێنا. لە مودەتی وەزارەتی شێرکۆهدا ئەغلەبی ئیشی موهیم، حەواڵەی ئەمیر صەلاح ئەددین کرابوو.

## وەزارەتی ئەمیر صەلاح ئەددین:

ئەمیر لەدوای سێ ڕۆژ تەعزییەی مامی، فەرمانی خەلیفە بۆ وەزارەتی، صادیر بوو. بەعزێ لە ئومەرای شام لەمە مەمنوون نەبوون و گەڕانەوە شام و ئەمەش ئەسەری حەسوودی بوو. بە تەبیعەت بۆ ئەو مەقامە، هیچیان بەقەد ئەمیر صەلاح ئەددین لایەق نەبوون، خەلیفە لەقەبی (مەلیك ئەلناصر ئەبو المظفر صەلاح ئەددنیا و ئەدین یوسف بن ئەیوب)ی دایە.

مەلیك ناصر، لە عومری بیست و دووساڵیدا و، لە دوای تەکامولێکی سیاسیی و عەسکەری، گەیشتە ئەم مەقامە بڵندە. بەڵام کە تەماشای ئەترافی خۆی کرد، کەسی

وای لە ئومەرای نەدی، کە بەگیان و دڵ یارییەی بدا، وە وای موناسیب زانی کە باوك و براکانی و خزمانی لە خۆی کۆ بکاتەوە. کاغەزی بۆ نووسین و هاتن. کە باوکی هات، خەلاتی وەزارەتی لەسەر شانی هەلگرت و تەقدیمی باوکی کرد، بەلام باوکی قبوولی نەکرد و گوتی: " ئەگەر تۆ لایەق نەبویتایە، خوا ئەمەی نەئەدایتیّ".

مەلیك ئەلناصر، ویستی خەلکی میصر لە خۆی مەمنون بکاو زۆر ئیحسانی دانیّ و چاکەی لەگەلّ کردن و هەرچەندە خۆی سوننی و خەلکی میصر شیعە بوون، هیچ دەخلی ئیشوکاری مەزهەبی نەکردن و تەنیا لە خوگبەدا لە دوای ناوی خەلیفە ناوی " نورئەددین" یش ئەبرا.

لە وەقتی وەزارەتیدا، ئەهلی صەلیب (دمیاط)یان داگیر کرد. مەلیك ئەلناصر لەشکری لێکردن و شارەکەی سەندەوەو لە میصر دەریکردن و بێجگە لەمەش، قەصەبەری (عقبە)شی، کە لەسەر رێگەی حەجاجای میصر بوو، زەوت کردن و ئەم دوو زەفەرەی، تأثیری گەورەی بەسەر خەلکی میصردا بوو. وە موحیبەتێکی زۆریان لە حەقی پەیاکردن و مەوقیعی مەلیك رۆژ بە رۆژ لە دلّی خەلکی میصر و ئومەریدا لە بلندیدابوو.

بەینێك (مؤتەمن ئەلخیلافە)، کەوتە خیانەتەوە لەگەلّی، وە حەتا فەرەنگی لیّ هاندا کە بێتە سەر میصر، تا مەلیك ئەلناصر بکەوێتە بەینی دوژمنی خاریجی و داخلییەوە. (مؤتەمن ئەلخیلافە) بە لەشکری سۆدان کە پەنجا هەزار کەسێك بوو، پشت ئەستوور بوو. مەلیك لە فرصەتێکدا، ئەم خائینەی لەناوبرد. وە لەسەر ئەمە لەشکری سۆدانی، عوصیانی کرد.

مەلیك ئەلناصر شەمس ئەدەولە تورانشاهی برای، بۆ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرە مەمنور کرد و حەقیقەتەن ئەم برا ئازاو دلّسۆزە، باش لە عۆدەیان هات و لە فەرفی دوو سیّ سالّدا، رەچەلّەکی برینەوەو لە خاکی میصردا سۆدانیی نەهێشت و زۆری لیّ

کوشتن، باقیش رای کردن بۆ سۆدان. لەوێش لە تەرەف (عادل) ی برایەوە، تەفرو توونا کران.

لە دوای کوشتنی مۆتەمن ئەلخیلافە (جەوهەر)، مەلیك ئەلناصر مەشهوور (بهائەدین قرەقوش)ی کرد بە مۆتەمن ئەلخیلافە.

مەلیك الناصر، هێشتا تازە هەرای سۆدانی بڕیبووەوە، کە ئەهلی صەلیب هاتە سەر دمیاط. مەلیکی قودس، لەگەڵ حکوومەتی رۆمدا، قسەی کرد بەیەك و ویستی میصر داگیر بکاو لەپێش هاتنی مەلیك الناصرەوە، زۆر باش بۆ مودافەعە حازر کرابوو. لەبەر ئەوە دوننما و لەشکری قودس لە دوای پەنجا رۆژ شەڕو موحاصەرە، بە حاڵێکی خراپ گەڕانەوەو هیچیان پێ نەکرا، بێجگە لەمەش بە تەقدیری خوا فەرتەنەیەکیش لە بەحردا پەیابوو، وە بەقایای دوننمای رۆمی غەرق کرد.

لە دوای ئەم غەلەبەیە، مەلیك ئەلناصر، حاڵی مودافەعەی تەرك کردو بە لەشکرێکەوە رووی کردە لەفەسگین و دەستی کرد بە تەچیق و تاڵانیان. گۆڕانی وەظیفەتی عەسکەرییە و سیاسییەی میصر، بەم تەرحە تەعەڕوزی ئۆردووەکەی بە فەلەسطین، بۆ خەڵکی میصر، حادیسەیەکی فوق العادة بوو. دەمێك بوو لە ژێر نفوذو وەحشەتی فەرەنگدا دامابوون و ئەیانناڵاند، بەڵام بە سایەی حوسنی ئیدارەو دەهای مەلیك ئەلناصرەوە کەوتنە حاڵێکی ترەوە، مەجا فەرەنگ لە تەعەروضی ئەوان ئەترسا. تەبەدولی وەضعیەت بەم نەوعە، موحیببەتی مەلیك ئەلناصری لە دڵی میصرییەکاندا زیاتر جێگیر کرد و مەوقیعی مەعنەوەی مادی مەلیك، رۆژ بە رۆژ لە بڵندیدا بوو.

مەلیك ئەلناصر، لەگەڵ ئەمەدا کە وەزیری خەلیفە عاضد بوو، لە تەرەف سوڵتان نورئەددینیشەوە مەنصەبی (سپهسالار)ی بوو. وە زۆر موخلیصی سوڵتان بوو.

مەشهوور قاضی الأفضل و عماد ئەددین اصفهانی، هەردووکیان لە مەعییەتی مەلیك ئەلناصردا، مەئمووری موخابەراتی رەسمیەو مشاوری خاص بوون. قاضی ئیبن شەددادیش لە دواییدا (٥٨٤هـ) بوو بە کاتبی خصوصی سوڵتان صەلاح ئەددین.

مەلیك ئەلناصر، لە دوای کوژاندنەوەی ئیختیلالی داخلی و غەلەبە بەسەر فەرەنگدا، ویستی بۆ تەئمینی سەربەخۆیی، وردەوردە، مەزهەبی سوننی لە بەینی میصریەکانا بلاّویکاتەوە. بەم فیکرە باشە، دوو مەدرەسە (حوجرە)ی گەورەی کردەوە، یەکێکیان ناصرییەو ئەوی تریشیان کاملییەی ناونرا. ئیبن ئەپیر ئەڵێ حەبسخانەی (دار المعونە)ی رووخاندو مەدرەسەیەکی بۆ مەزهەبی شافیعی، لە جێگەی دروستکرد. (دار العدل)یشی کرد بە مەدرەسەی شافیعی. قازیانی شیعەی میصر عەزل کردو لە جێگەی ئەوان قاضی شافیعی دانا.

سوڵتان نور ئەددین، بۆ خوبە خوێندنەوە، بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە، زۆر ئیلحاحی ئەکرد ئەفکاری عومومییەش ئەمەی ئەویست. بەلاّم مەلیك ئەلناصر هەڵەشەیی نەکرد و ویستی ئەووەڵەن مەوقیعی خۆی باش قایم بکاو لە دواییدا دەست بداتە ئەم ئیشە. لە دوای بەینێك، بە عادەتی خۆی، مەجلیسێکی ئیستیشارەی کۆکردەوەو موزاکەرەی لەگەڵ کردن و لە پاشدا لەسەر قەراری مەجلیس، خوگبە بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە خوێنرایەوە. خەلیفەی فاطیمی (العاضد)لەو وەقتەدا نەخۆش بوو. بە ئەمری مەلیك ئەم خەبەرەیان لێ شاردەوە، واقیعەن لەدوایچەند رۆژێك (العاضد) وەفاتی کرد (٥٦٧هـ) مەلیك لە وەفاتی زۆر عاجز بوو، چونکە بۆ سیاسەتی بەرامبەر سوڵتان نو ئەددین، مەصڵەحەت نەبوو.

مەلیك الناصر، لە دوای دفن و تەعزییەی ئەلعاچد، نەتەوەی و خانەدانی فاطیمی، لە قەسری خەلیفە هێنایە دەرەوەو، لە خانوویەکی تریشدا ئافرەتەکانی داناو زۆر باش تەماشی کردن. لەم جویێ کردنەوەیەش مەعنا زاوزێیان بوو.

خەزێنەی قەسری خەلافەتی بەسەر ئومەراو پیاو ماقولان و موحتاجینا دابەش کرد.
لە دوای وەفاتی ئەلعاچد، مەلیك ئەلناصر بوو بە حوکمداری سەربەخۆی میصر.
ئەووەلێ ئیش دروستکردنی قەلاّی قاهیرە بوو. لەو وەقتە ئەم پایتەختە عیبارەت بوو
لە چەند پارچەیەك: فسطاط، گەڕەکەکانی کە ئەحمەدی گولّۆن دروستی کردبوو،
قاهرە ئەلمەعزیە. مەلیك ئەلناصر بە دەوری ئەمانەدا، دیوارێکی مەحکەمی دروست
کرد و قەلاّیەکیش بەناوی خۆیەوە, بۆ حیمایەو موحافظةی شارەکە بینا کرد. وە لەناو
ئەم قەلاّیەشدا سەراو دەوائیر و بەعزێ خانووی موناسیبی، بۆ خۆی و دەست و
پێوەندی دروست کرد.

مەلیك الناصر صەلاح ئەددین، نەی ئەویست کە سولّتان نورئەددین لێی بکەوێتە
شوبهەوە، لەبەر ئەمە لە خوتبەو لە دوای ناوی خەلیفە، ناوی سولّتان نورئەددین، زیکر
ئەکراو سککەی بەناوی ئەوەوە لێدا وە لە خەزێنەی قەصری خولەفای فاطیمی
دیارییەکی زۆر بە قیمەتی بۆ هەلّبژارد و ناردی.

بەینێك مەلیك ئەلناصر، بۆ فەتحی قەلاّی (شوبك)، کە لە فەلەسگینداو لەسەر
ڕێگەی تیجاری میصرو شامدا بوو، چوو. بەلاّم کە بیستی سولّتان نورئەددین رووی
کردۆتە ئەو ناوە، نەیویست تووشی بێ و زاری لە قەلاّکە هێناو گەڕایەوە.

بەعزێ ئومەرای سولّتان نورئەددین کە لە فەتحی میصردا لەگەلّ شێرکۆو مەلیك
ئەلناصردا نەمابوونەوە، چووبوونەوە لا سولّتان نور ئەددین. ئەمانە، دایمە سەعیان
ئەکرد کە دلّی سولّتان نور ئەددین لەگەلّ مەلیك ئەلناصر بگۆڕن، حەتا ئەلّێن کە
لەدوای گەڕانەوەی مەلیك، لە قەلاّی شوبك، سولّتان نور ئەددین، رووی کردە میصرو
ویستی بیگرێ، کە مەلیك ئەلناصر ئەم خەبەرەی بیست مەجلیسی شورای کرکردەوەو
موزاکەرەی لەگەلّ کردن و یەکێ لە ئەعضای مەجلیس گوتی لازمە شەڕ لەگەلّ سولّتان
بکەی. نەجم ئەددین ئەیوبی باوکی کە ئەمەی بیست توڕەبوو، وە گوتی: ولاّتەکە
ولاّتی سولّتانەو هەموومان عەبدو تەبەعەی ئەوین، وەلەسەر ئەمە، مەجلیس بلاّوەی

کرد و لە پاشدا نەجم ئەددین ئەیوب لەگەڵی لۆمەو نەصیحەتی مەلیك ئەلناصری کوڕی کرد.

واقیعەن سولتان نور ئەددین، لەبەر بەعزێ ئیشوکاری مەهیمی جەزیرە، نەیتوانی بێ بۆ میصر. مەلیك ئەلناصر، لە دوای چەندێك، توانشاهی برای بۆ تەئمینی سۆدان و تەدقیقی ئەحواڵی نارد.

سولتان نورالدین، لە دوای ئەمە کە کاغەزی ئیطاعەت و تابعیەتی لە مەلیك ناصر وەرگرت و ئیشوکاری جەزیرەشی تەواو کرد. خەبەری نارد بۆ مەلیك ناصر کە بە لەشکریەوە بێ و لە فەلەستین یەکدگیربن و شەڕ لەگەڵ مەلیکی قودس بکەن. واقیعەن مەلیك ناصر ئیطاعەتی کرد و چوو، بەڵام لە پێش چاوپێکەوتنی سولتان بە سەبەبی نەخۆشی باوکیەوە، گەڕایەوە میصر.

واقیعەن ئەمیر نەجم ئەددین ئەیوب لە نزیك باب ئەلنەصر لە ولاخ گلابوو، وە لەدوای چەند رۆژی وەفاتی کرد.

سولتان نورئەددین، لە گەڕانەوەی مەلیك ناصر عاجز بوو. وە قەراری دا کە بە لەشکرێکەوە، بچێتە سەر میصرو داگیری کاو مەلیك ناصر عەزل بکا، بەڵام ئەجەل مەیدانی نەدایەو لەو رۆژانەدا وەفاتی کرد ( رۆژی چوار شەممو، ٢١ شوال ٥٦٩هـ).

لەپێش وەفاتی سولتان نورالدین، مەلیك ناصر زۆر فاعلیەتی نواند، لە لایەکەوە لە ژێر نضارت و ئەمری باوکیا لەشکری میصری تنظیم و تەربیە کرد. وە لە قەراغ بەحری سپیشەوە تا شاری (قابس) هەموو (تەرابلسی غەرب) و (تونس)ی داگیر کرد. لە لایەکی تریشەوە بۆ فەتحی یەمەن توانشاهی برای نارد (رەجەبی ٥٦٩هـ) و ئەو ولاتەو عەدەن، کەوتنە ژێر ئیدارەی میصرەوە.

لەو بەینەدا تەرتیب کرابوو، وە ئەمانە لەگەڵ مەلیکی فەرەنگیشدا قسەیان کردبوو بەیەك، بەڵام لە پێش وقوعیدا، مەلیك خەبەری زانی و سەبەب کارەکانی هەڵواسی. لەو

بەینەدا دوننمای (سجلیا) هاتبووە سەر ئەسکەندەرییە، مەلیك ناصر، زوو دەفعی کردو لەو بەینەدا قەراڵی قودسیش مرد کە دوژمنێکی بە قوەتی مەلیك ناصر بوو.

لە دوای وەفاتی سوڵتان نورالدین، بۆ سەربەخۆیی بۆ مەلیك ناصر، ئیتر مانعێك نەما، وە بە تەبیعەت حاکمیەتی مطلقەی شەرق و سەرداری ئیسلام، کەوتە عۆدەی مەلیك ناصر صەلاح ئەددینەوە، رەقیبێکی وای بۆ نەما کە بتوانێ بەرامبەری راوەستێ. کورە منداڵەکەی سوڵتان نورالدین، وە سەیف ئەددین حاکمی موصڵ و سوڵتانی سەلجوقی رۆم لەناو دا هەبوو، بەڵام ئەمانە هیچیان حەدی ئەوەیان نەبوو کە بتوانن رەقابەتی لەگەڵ کبەن. مەلیك ناصر، چونکە شەڕی فەرەنگی و دەرکردنیانی لە وڵاتانی ئیسلامی بە وەزیفەیەکی دینی ئەزانی، ویستی کە لەگەڵ ئەم حاکمانی موسڵمانانەدا ئیتیفاق بکاو هەموو قوەتی ئیسلام بەرامبەر بە دوژمنی دین کۆ بکاتەوە. ئەم فیکرە باشە ئەساسی سیاسەتی موستەقبەلی مەلیك ناصر صەلاح بوو، واقیعەن لەسەریشی رۆیشت.

## لەدوای وەفاتی سوڵتان نورئەددین:

مەلیك صالح ئیسماعیل، کە هێشتا منداڵێکی یانزە ساڵە بوو، هاتە جێگەی سوڵتان نورئەددینی باوکی و ، بە سەبەبی بێ ئیدارەیی ئومەرای باوکی، غەلەبەیان لێ سەند، سەیف ئەددینی ئامۆزای، کە حاکمی موصڵ بوو، وڵاتانی جزیرەی سوڵتا نورئەددینی داگیر کرد، وە ئومەراکانی تریش هەریەکەو لە جێگەی خۆیدا، کەوتە هەوای سەربەخۆیی. مەلیك ئەلناصر، کە ئەم حاڵەی بیستەوە، کاغەزێکی بۆ وەزیری مەلیك صالح، کە (شەمس ئەددین محەمەدی کوڕی عەبدولمەلیك کورشی موقەدەم)بوو، نووسی و لۆمەی کردن و گوتی ئەگەر ئێوە باش خزمەتی مەلیك صالح نەکەن و موڵکەکەی موحافەڤە نەکەن، خۆی بیلزات دێ و محافظەی حقوقی ئەکا، ئومەرای مەلیك صالح، گوێیان نەدایە ئەم نەصیحەتە.

حاکمی حەڵەب ( شەمس ئەددین بن دایە) ، (سەعد ئەددین کمشتکین)ی ناردە لای مەلیك صالح و بانگی کردە حەلەب، بۆ خاتری ئەمەی مەلیك ناصر دەسی نەیگاتێ، خەڵکی شام، ئەووەڵەن نەیانهێشت مەلیك بچێ بۆ حەڵەب، بەڵام دەفعی دووەم، کمشتکین هات و تەفرەیداو بردیە حەڵەب و لەوێ شەمس ئەددینی گرت و لەگەڵ خزمو کوڕەکانیا حەپسی کر. لە دوای ئەوە، کمشتکین، بۆ قایم کردنی جێگەی خۆی، لەگەڵ حکوومەتی فەرەنگی قودسدا، لەحەقی مەلیك ناصر، ئیتیفاقی کرد، لەسەر ئەم ئەحواڵە، مەلیك ناصر کاغەزێکی بۆ خەلیفە عەباسی (المستضيء بيلاه) نووسی و شکایەتی لەم شۆڕش و پاشاگەردانییەی مەملەکەتی مەلیك صالح کرد.

واقیعەن، لەو بەینەدا وەضعیەتی سیاسییە بۆ مەلیك ناصر زۆر موساعید بوو. مەملەکەتی فەلەسگین و سوریە بەدەس دوو منداڵی بێ کارەوە بوو، ئەمانەش (بالدوین چوارەمی بەلەك)ی کورشی مەلیك ئاموری و مەلیك صالح ئیسماعیل بوون.

لازم بوو، ئیستیفادە لەم فرصەتە بکاو ئەم ئەم مەملەکەتانە، بێنێتە ژێر دەستی خۆی، لەگەڵ ئەمەشدا مەلیك ناصر هەڵەشەیی نەکرد، چونکە نەی ئەویست خەڵکی شام، لە خۆی عاجز بکا، لەبەر ئەوە دایمە کاغەزی بۆ مەلیك صالح ئەنووسی و حورمەتی ی ئیطاعەی خۆی عەرز ئەکرد و سکەی بەناوی ئەوەوە، لێ ئەداو خوتبەی بەناوی ئەوەوە، ئەخوێندەوە.

کە مەلیك صالح چوو بۆ حەڵەب، کمشتکین بوو بە ئامری سەربەخۆ، ئیبن موقەدەمو ئومەرای تەرەفداری، کەتنە ترسەوەو کاغەزیان بۆ سەیف ئەددینی حاکمی موصڵ نووسی کە بێت و یارییەیان بدا. وەلحاڵ، سەیف ئەددین بڕوای پێ نەکردن و لە دوای تەڕەدودێکی زۆر بالعکس، لەگەڵ مەلیك صالح رێك کەوت. ئومەرای دیمەشق، کە ئەمەیان چاوپێ کەوت، ئینجا، رجانامەیان بۆ مەلیك ناصر نووسی، تا بیانگاتێ و لەم تەهەلوکە نەجاتیان بدا.

مەلیك ناصر، دەمێك بوو دەعوەتێکی وای لە خوا ئەویست، دەست بەجێ هەڵساو بە لەشکرەوە دەشتی (تیە)ی بڕی و لە خاکی قودس، بەبێ خۆف، تێپەڕی و گەشیتە خاکی سوریە. لە پێش حەرەکەتیدا، زاتەن بۆ خەلیفەی بەغدای نووسیبوو، کە زۆر پێویستە سوریەشی بەدەستەوەبێ، تا بتوانێ لەگەڵ حکوومەتی فەرەنگدا، خەریك بێ‌و مودافەعەی ئیسلامیەت، بکاو ذاتەن حکوومەتی بێکارەی مەلیك صالح ئەم خزمەتەیان پێ ناکرێ و نەیان کردوە، بەڵکو لەگەڵ دوژمنی دیندا ئیتیفاقیان کردوە.

مەلیك ناصر بەم تەرحە موساعەدەی لە خەلیفە وەرگرت و لەلای هەموو کەس، بە مودافیعی ئیسلام، ناسرا. لەبەر ئەوە، نە ك ئەمەی کە تووشی مقاوەمەتێك بێ، بەڵکوو لە هەموو لایەکەوە، ئیمدادو معاوەنەتی بۆ هات.

خولاصە، مەلیك ناصر گەیشتە (بصری) و حاکمەکەی چوو بە پیریەوە و ئیگاعەتی کرد، لەم شارەوە راستەو راست رووی کردە شامو لە ئەواخیری رەبیعوئەوەلی ٥٧٠هدا، گەیشتە ئەوێ و داخلی شاربوو، چووە مالی باوکی و لەدوای ئیستراحەت، لەوەێ قەلاکەی تەسلیم کراو خەزێنەو مالی زۆری تیابوو. هەمووی بەسەر خەلکی شامدا دابەش کرد و هەموو کەسێك لە قدوومی مەمنون و مەسرور بوو.

مەلیك ناصر، بە فیکرێکی داهییانە، دایمە لە موخابەرەو موعامەلەیدا خۆی وا ئەنواند کە تەنیا بۆ معاوەنت و خزمەتی کوری وەلی نیعمەتی، لە مەلیك صالحە، هاتووە.

وەلە بەر ئەم حالە، هەموو کەس زیاتر خۆیشی ویست و ئومەراو ئەشرافی شام بە دڵ و بە گیان، تابیعی ئەمرو نەهی بوون.

مەلیك ناصر لە دوای رێکخستنی ئیشوکاری شام، (سەیف ئەلئیسلام طغتکین)ی برای، بەسەریەوە داناو رووی کردە حمص. شارەکەی گرت و مقدارێ قوەتیشی بۆ موحاصەرەی قەلاکەی بەجێ هێشت و رووی کردە حەمما. حاکمی ئەم شارە ( ئەمیر عزئەددین جوردیك) بوو کە لە سەفەری سێهەمی میصردا، لەگەڵ ئەمیر صەلاح ئەددین

بوو، بەلام لە دوای وەزارەتی نەیویست لە مەعییەتیدا بێ و گەڕابووەوە شام. ئەم ئەمیرە، ئەووەڵەن نەیویست ئیطاعەتی بکا، بەلام لە دواییدا مەلیك ناصری ئەمین کردەوەو شارەکەی تەسلیم کر

. تەنیا قەلاکە بەدەس براکەیەوە ما، وە لە تەرەف مەلیکەوە بە مورەخەص بۆ حەلەب نێررا. لەوێ نوسەرا بەردەن و مەیدان بە رژانی خوێن، لە بەینی ئیسلامدا نەدەن. بەلام ئەمیر عزئەددین کە گەیشتە حەڵەب، کمشتگین حەپسی کرد. لە دوای ئەمە، مەلیك رۆیی بۆ حەڵەب و لە سێیەم رۆژی جەمادی ئەلئوخرە ٥٧٠ھ دا، شارەکەی موحاصەرە کرد و ئیعلانیشی کرد کە بە دوژمنایەتی نەهاتوە، بەڵکو بۆ خەلاص کردنی پادشا لە دەس کمشتگین و بەعزێ ئومەرای عاصی هاتۆتە ئەم ولاتە.

کمشتگین کە چاوی بەو حالە کەوت، ویستی بە واسیطەی فیدائیی، ئیسماعیلی مەلیك ناصر، لەناو بەرێ و ساعیی مەخصوصی ناردە لای مورشیدی ئیسماعیلی (شێخ ئەلجەبل راشد ئەدین سنان) و لە تەرەف ئەم شێخەوە چەند فیدائیەك، نێررا. بەلام مەلیك ناصر پێیزانی و هەمووی کوشتن.

لە دوای ئەمە، بە تەضیقی کمشتگین، مەلیك صالح، خەڵکی لە عەلەیهی مەلیك ناصر، تەشویق کرد بۆ شەڕ. وە واقیعەن قەلای حەڵەبیان بە شیددەت، مودافەعە کرد.

کمشگین، لە لایەکی تریشەوە (ریاموند)ی حاکمی تەڕابلسی، کە لە زەمانی سوڵتان نور ئەددینەوە حەپس بوو، بەرەلاکرد، تا بەرامبەر بە مەلیك ناصر یارییەیان بدا. ئەم قوماندانەی فەرەنگە، لە دوای بەربوونی، بوو بە وەصی مەلیك ( بالدوین)ی قودس و، تەڵەبی معاوەنەتی کمشتکینی بە فرصەت زانی، تا حەق لە ئیسلام بسێنێتەوەو بە لەشکرێکەوە رووی کردە حمص. مەلیك ناصر کە وایزانی، وازی لە موحاصەرەی حەڵەب هێناو رووی کردە لەشکری قودس. بەلام ریاموند، نەیوێرا راوەستێ و گەڕایەوە. مەلیك ناصریش، بەعلەبەکی زەوت کردو چووە شام.

مەلیك صالح، تەڵەبی ئیمدادی، لە سەیف ئەددین حاکمی موصلّ، کردو ئەم حاکمە دەستبەجێ بە خۆی و لەشکریەوە هات و لەگەڵ لەشکری حەڵەب یەکدیگر بوو، وە هەردوولا روویان کردە مەلیك ناصر، بەڵام مەلیك چونکە حەزی نەئەکرد فەساد لە بەینی ئیسلامدا بێ و فەرەنگ ئیستیفادە بکا، تەکلیفی رێك کەوتنی لێ کردن و خەبەری بۆ ناردن کە بە غەیریشام، ئەو ولاتانەی کە زەوتی کردوە، هەموویان بۆ رەد ئەکاتەوەوتەنیا بە وەکالەتی مەلیك صالح، شام بۆ خۆی ئەهێڵێتەوەو ئەگەڕێتەوە میصر. بەڵام سەیف ئەددین و مەلیك صالح قبووڵیان نەکرد. لەدوای ئەمە مەلیك ناصر رووی تێ کردن و لە نزیك حەمما لە ١٩ی رەمەزانی ٥٧٠ دا شەڕێکی قورس قەوما. وە مەلیك ناصر غەلەبەی بەسەر دوژمندا کردو زۆر خراپ شکاندنی و تا حەڵەب راوی نان. لەو شارەدا موحاصەرەی کردن. سەیف ئەددین خۆی دەربازکردو چوەوە موصلّ، بەڵام لەشکری مەلیك وازیان لێ نەهێناو روویان کردە موصلّ، ناچار سەیف ئەددین لەشکرێکی شەش هەزار کەسی، بە پیرەوە ناردو لە ( تەل ئەلسولّتان) دا تووشی لەشکری مەلیك بوون و مەمجارەش لەشکری موصلّ پەرێشان بوو، وە زۆریان لێ بەدیل گیراو تالانێکی زۆر دەس لەشکری میصر کەوت. بە قییەی لەشکری موصلّ، رایان کردە حەڵەب. مەلیك ناصر لە دوای ئەم ظەفەرە، لە رێگە دا قەڵای (بزاغە) و (منبج) و (ئعزاز)ی زەوت کردو دەستی کرد بە تەچیق کردنی قەڵای حەڵەب.

لە وەقتێکدا کە مەلیك ناصر، لەگەڵ موحاصەرەی قەڵای (ئعزاز) (نزیك حەڵەب)، خەریك بوو، رۆژێك فیدائیەك لە پڕێکا هجومی کردە سەری و شیرێکی لەسەری دا، بەڵام لەبەر کلاوزری، کەم تەئپیری کردو دەستەو دائیرەی مەلیك، بە فریادا گەیشتن و کابرایان کوشت. وە زۆری پێ نەچوو، یەك لە دوای یەك، چەند فیدائیەکی تر، هەڵیان کوتایە سەر مەلیك، بەڵام هەموویان لە ناوبران.

ئەم قاتیلانە لە تەرِقف (کمشتکین) ی خائینەوە، نێررابوون، مەلیك ناصر لە دوای ئەم حادیثەیە قەلاَی حەلەبی زیاتر تەضیق کرد و نیهایەت خەلَکی شارەکە نەیانتوانی بەرامبەر بە شیددەتی مەلیك، راوەستن و بە بەعزێ شروط، صولَحیان ویست.

لەو بەینەدا کچێکی سولَتان نورئەددین و خوشکی مەیلك صالح، بۆ شەفاعەت هاتە لای مەلیك ناصر، وە مەلیك زۆر قەدرو حورمەتی گرت و لەبەر خاطری ئەو، کەسی ئازار نەدا، ئەسیرەکانی حەلەبی بەرەلاَ کرد و بریندارەکانی تەداوی کرد.

نیهایەت مەلیك صالح، لەسەر مەیلی خەلَکەکە، بە صولَح راچی بوو. وە وازی لەو ولاَتانە هێنا کە دەستی مەلیك ناصر کەوتبوو، وە بەم تەرحە، غەیری حەلەب و أطرافی، هیچ جێگەیەك بۆ مەلیك صالح نەمایەوەو هەموو کەوتە ژێر حوکمی مەلیك ناصرەوە.

لەدوای ئەم صولَحە، مەلیك لە شەوالی ئەو سالَەدا گەڕایەوە شام و لەوێ خەلاَتی خەلیفەی عەباسی، گەیشتێ و بەناوی خەلیفەوە، بوو بە صاحێبی میصرو شام و عینوانی (سولَتان)یشی درایە. وە لە ئیعتیباری ئەو رۆژەوە ناوی مەلیك صالح لە سکەو خوگبە هەلَگیراو سکە بەناوی (مەلیك ناصر یوسف بن ئەیوب)ەوە لێدرا. لە دوای ئەمە لەو سەفەرەدا هەرچی تالاَنێك دەس کەوتبوو، هەمووی بەسەر لەشکردا دابەش کرد.

## دەوری سەلَتەنەتی:

سولَتان صەلاح ئەددین لەدوای رێکخستنی ئیشوکاری سوریە، فیرقەی ئیسماعیلییەی تەربیە کردو لەدوای حەسانەوە لە شام، تورانشاهی برای کە لە یەمەنەوە بۆ دیدەنی هاتبوو کرد بە وەکیل و لەسەر سوریەی داناو گەڕایەوە میصرو دەسی کرد بە بینای شوورەی دەوری قاهیرە و قەلاکەی، واقیعەن ئەم شوورەییە زۆر

جار تەعمیر و تەغییر ئەکرا، بەڵام عەلامەتی بەیاخی سولْتان ، کە (هەڵۆ) یەکی سوور لەسەر زەمینێکی زەرد بوو، ئێستاکەش بەسەر یەکێ لە دیوارەکانی قەڵاکەوە ماوە.

لەدوای گەڕانەوەی سولْتان بۆ میصر، فەرەنگ بە فرصەتیان زانی و لە دوو قۆڵەوە روویان کردە شام و بەعلەبەك و ئەوناوەیان تالان و بڕان کردو تورانشاهیشیان شکاندو زۆریان لە موسڵمانان بە دیل گرت.

سولْتان صەلاح ئەددین، کە ئەمەی بیست بە لەشکرێکی بچووکەوە، رووی کردە فەلەسگین و تا (رملە) هات و لەوێ تووشی لەشکرێکی بە قوەتی فەرەنگ بوو وە کەوتنە شەڕەوە، بەڵام ئەم غەلەبەیە بۆ دوژمن بوو، وە سولْتان لە تەهلەکەیەکی گەورە، نەجاتی بوو (٥٧٣هـ). (ئەمیر عیسا)ی حەکاری لەم شەڕەدا کەوتە دەس فەرەنگ و لە دواییدا سولْتان بە پارە کڕییەوە.

سولْتان صەلاح ئەددین گەڕایەوە میصر و ئەمجارە لەشکرێکی بە قوەتی کۆکردەوەو لە دوای سێ مانگ، رووی کردە سوریە، وە لەشکری شامیشی خستە تەك خۆی و تەنگی بە فەرەنگ هەڵچنی، لەو بەینەدا لەشکری گاوور حەممایان تضیق کردبوو، وە لە دواییدا چوونە سەر (حارم) کە لە ژێر حاکمی حەڵەبدا بوو، وە لە دوای سەندنی پارەیەکی زۆر لە مەلیك صالح گەڕانەوە دواوە.

فەرەنگ بەرامبەر بە سولْتان، خۆی بە چەعیف دی و بە ترسێکی دوایی، دەسی کردی بە قایم کردنی سەرحەدی خۆی و دروستکردنی قەڵایەك لە نزیك (بەیت یەعقوب).

ئەم قەڵایە بۆ ئیسلام خراپ بوو، لەبەرئەوە سولْتان ویستی بە تەماعی ماڵ وازیان پێ لێ بێنێ، بەڵام فائیدەی نەبوو، وە تەواویان کردو بوو بە مەرکەزێکی موهیمی حەربی.

مەلیکی قودس، لە دوای تەواوکردنی ئەم قەڵایە، لەشکرێکی ناردە سەر سوریەو سولْتانیش (ئەمیر فەرەخشاه)ی برازای بە لەشکرێکەوە ناردە بەرامبەریان.

فەرەخشاه، فەرەنگی خراپ شکاندو ئەوەندەی نەمابوو مەلیکی قودس ئەسیرکا، بەلام شوالییەکی گاوور، کە ناوی (همفری)بوو، مەلیکی رزگار کرد.

لە لایەکی تریشەوە، سولتان صەلاح ئەددین، خۆی بە لەشکرەوە، چووە سەر قەلای یەعقوب و موحاصەرەی کرد و دەسی کرد بە تالان کردنی أطرافی صەیداو بەیروت.

مەلیکی قودس، بۆ ئینتیقام لە سولتان و مەنعی تالانی موسلمانان، بە لەشکرێکی زۆر بەقوەتەوە رووی کردە لەشکری سولتان و لە (مبرج ئەلعیون)دا.

شەڕێکی زۆر قورس لە بەیندا قەوما و فەرەنگ زۆر خراپ شکاو زۆریان لێ بەدیل گیرا حاکمی طەرابلس (ریاموند)، حاکمی رملە (بولدوین)و حاکمی طەبریە (هرج)و بەعزێ پیاو ماقولانی تری فەرەنگیش، لەناو ئەسرادا بوون (٢ی موحەڕەم ٥٧٥، ١٠ی حوزەیران ١١٧٩).

سولتان، لە دوای ئەم زەفەرە بلندە بە دوو مانگ، هاتەوە سەر قەلای یەعقوب و لە ظەرفی پێنج رۆژدا گرتی و محافیظانی فەرەنگی ئەسیر کرد و قەلاکەی تێکو مەکاندا.

بە سەبەبی لەدەست چوونی قەلای یەعقوب، فەرەنگ کەوتە ترەسەوەو تەلەبی موتارەکەیەکی دوو سالیی و سولتان قبوولی کرد. بە غەیری حاکمی (ئنطاکیة) هەمووی ئومەرای فەرەنگ داخلی ئەم صولحە بوون.

سولتان صەلاح ئەددین ویستی لەم فرصەتەدا، ئیشوکاری جەزیرەش ساغ بکاتەوە، حاکمی حصن کیف (نورئەددین) کە زاوای (قلیج ئەرسەلان) ی حاکمی سەلجوقی رۆم بوو، لەگەلٚ خەزوریدا تێك چوو بوو، وە لەسەر ئەوە قلیج ئەرسەلان ئیعلانی حەربی لەگەلٚ کردبوو, وەلحالٚ ئەمیر نور ئەددین موتەفیقی سولتان بوو، هەرچەندە سولتان صەلاح ئەددین لە وەقعەی (حصن رعبان)ەوە رقی لە قلیج ئەرسەلان بوو، بەلام دیسان نەیویست خوێن لە بەینی موسلمانانا برژێ و رێکیخستن و خۆشی چووە سەر حاکمی ئەرمەنییەی بچووک کە (روبین) بوو، وە شکاندی و مەجبووری صولحی کرد.

لەم ظەفەرانەی یەك لە دوای یەکەی سولْتان، هەموو کەس ئاگادار بوو. وە دەرەجەی شەوکەت و قودرەتیان ئیقرار کرد، وە هەموو حکومەتە بچکۆلەکان بۆ دۆستایەتی، هەوڵیانداو گەورەیی سولْتان صەلاح ئەددنیان قبوڵ کرد و لە بەینی خۆیان و و سولْتاندا ئیتیفاقێکیان کرد کە لە ئیعتیباری جەماژی ئەلئەوەل ٥٧٥هـ (تشرینی ئەوەلی ١١٨٠م) وە ئەبوایە دوو ساڵ دەوامی بکردایە.

حاکمی موصڵ و جەزیرەو هەولێرو حصن کیف و ماردین و سولْتانی رۆم و مەلیکی ئەرمەنییەش، داخلی ئەم ئیتیفاقیە بوون. وە قەول و بڕیان کرد کە لەم مودەتەدا، شەڕ لەگەڵ یەك نەکەن. بەم نەوعە شەڕی بەینی موسڵمانان دوای هات و شۆرەتی گەورەیی سولْتان، بەناو وڵاتانی بەحری رەش و خلیجی فارس و بەحری سپیدا، بڵاوبووەوە بە واسیطەی ئەم ئیتیفاقەوە، ئیمکانی ئیستیعمال کردنی هەموو قوەتی ئیسلام بەرامبەر بە فەرەنگ، حاصڵ بوو.

لە دوای ئەمە، سولْتان بە دڵێکی ڕاحەتەوە، لە رەجەبی ٥٧٦هـ دا، گەڕایەوە میصرو ئەمیر فەرخشاهی برازای بەسەر شامەوە، بە جێ هێشت.

سولْتان کە گەیشتە میصر، دەسی کرد بە رێکخستنی ئیشوکاری ئەوێ و کردنەوەی مەکتەب و مەدرەسەو چاککردنی رێگەوبان و تەحکیم کردنی ئەسکەندەریە. توانشاهی برای، کە لە دوای بەعلەبەك، ئەسکەندەریەی درابوویە، لە پێش گەیشتنی سولْتان بە میصر، وەفاتی کردبوو.

لە وەقتێکدا کە سولْتان لەگەڵ ئیشوکاری میصر خەریك بوو، خەبەری بۆ هات کە رینۆڵد (ارناط)، بە خیلافی شروطی موصالەحە، کاروانێکی تیجاری ئیسلامی، کە لە نزیك (کرن)ەوە تێئەپەڕێن، تاڵان کرد.

تەصادوف لەو وەقتەدا گەمییەکی حەجاجی مەسیحی لای دابوە دمیاط، سولْتان بۆ بەرامبەریی بە معامەلەی حاکمی کرگ، ئەو حەجاجانەی گرت.

هەر لەو بەینەدا، حاکمی موصڵ و جەزیرە ئەمیر سەیف ئەددین غازی، وەفاتی کرد. جەزیرەی ئیبن عمری دابوو بە سەنجەرشاهی کوڕی و عەقری حەمیدیشی دابوو بە ناصرەدین کشك و باقی وڵاتانی موصڵ و جەزیرەشی وەصیەت کردبوو بۆ عزئەددین مەسعودی باری.

لە دوای چەند وەقتێکی تر . مەلیك صالح ئیسماعیلیش وەفاتی کرد (٢٥ی رەجەبی ٥٧٧) وە حەلەبی وەصیەت کردبوو بۆ عزئەددین مەسعود. ئەمیر عزئەددین لە دواییدا حەلەبی بەرامبەر بە سنجاردا بە عماد ئەددینی برای (١٣ی محرەمی ٥٧٨).

سوڵتان صەلاح ئەدین، لە وەفاتی مەلیك صالح و لە زەوت کرانی حەلەب لە تەرەفی عماد ئەددینەوە، زۆر سەغڵەت بوو، بەڵام بە سەبەبی ئیتیفاقی دوو ساڵەوە، مومکین نەبوو بچێتە سەری و حەلەبی لێ بسێنێ. واقیعەن سوڵتان زۆر ریعایەتی شەرت و عەهدی ئەکرد و قەت عەهد و میثاقی نەئەشکاند و نەیشکاندوە. لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا بۆ تەواوبوونی مودەتی موعاهەدە، چوار مانگ مابوو، کەچی خەبەری بۆ هات کە بەعزێ لە موتەفیقەکانی لەگەڵ شێخی جەبەل و فەرەنگدا لە عەلەیهی سوڵتان، خەریکی رێك کەوتنن.

لەسەر ئەم ئەحواڵ و ئەخبارە، سوڵتان صەلاح ئەددین بە لەشکرەوە، رووی کردە شام. بارگرانی لەگەڵ (تاج ئەلملوك بوری)ی برایدا، نارد بۆ شام و خۆی بە لەشکرەوە دەسی کرد بە تاڵان کردنی وڵاتی فەرەنگ و دوشمن نەیوێرا رێگەی پێ بگرێ و بە بێ زەحمەت لە صەفەری ٥٧٨ دا گەیشتە شام.

لە دوائیستیراحەتی چەند رۆژێك، دیسان هەڵی کوتایە وڵاتی فەرەنگ، زۆری لێ کوشتن و (بیسان)یشی گرت و گەڕایەوە شام. لەدوای مانگێك چوو بەیروتی لە جیهەتی بەحرو بەڕەوە، بە ئۆردوو، دوننما موحاصەرەی کرد، بەڵام لە پێش گرتنی ئەم شارە لەسەر دەعوەتی (گوگبوری)ی حاکمی حەڕان، رووی کردە جەزیرە. لەم بەینەدا مودەتی ئیتیفاق تەواو بوو وە ئەغلەبی حاکمانی جەزیرە ئەیانویست بچنە ژێر

ئیتاعەتی سولْتانەوە، وە ئەم ئارەزوەشیان عرض کردبوو. ئەم حاڵە بۆ غەلەبەی سولْتان، موقەدیمەیەکی خێر بوو، وە ویستی لەمە ئیستیفادە بکا و موصلْ بگرێ و واقیعەن چوو وە موحاصەرەی کرد، بەلاّم لەدوای دوومانگ موصلْی بەجێ هێشت و چوو سنجاری گرت (٢ی رەمەزانی ٥٧٨).

لەو بەینەدا، خەبەری زانی کە فەرەنگ خەریکی خۆ حازرکردنە بۆ تالاّنی جنوبی سوریە، سولْتان ئەهمیەتی نەدایەو گوتی، فەرەنگ لەوێ بەلْکو بەعزێ گوندو موند زەوت ئەکا وەلحالْ ئێمە لێرە شاران ئەگیرن، هەرە وەقتێ گەڕاینەوە ئەوێ، مومکینە فەرەنگ بشکێنین و لە ولاّتەکەی دەرکەین. واقیعەن مەقصەدی سولْتان، ئەووەلْ و ئاخیر هێنانە ژێر ئیتاعەتی ئومەرای ئیسلام و ئیستیفادە لە قوەت و ئیتیحادیان بوو، بەرامبەر بە فەرەنگ، بۆ سەندنەوەی قودسی شەریف، بەم فیکرە ویستی ئەووەلْەن ئیش جەزیرە تەواوکا.

سولْتان صەلاح ئەددین لە دوای سنجار ڕووی کردە قەلاّی ئامەد (دیار بکر)و لە دوای موحاصەرەیەکی هەشت رۆژی، ئەو قەلاّ مەحکەم و گەورەیەی گرت. لەو بەینەدا خەبەری بۆ هات کە عماد ئەددینی حاکمی حەلەب، لە عەلەیهی، لەگەلْ فەرنگدا ئیتیفاقی کردوەو ئەیانەوێ تعرض بکەنە ولاّتانی سولْتان. لەدوای ئەم خەبەرە، دەست بەجێ لە فورات پەڕیەوەو لە ڕێگەدا (غیتان)ی لە ١٦ی موحەڕەمی ٥٧٩دا گرت و لە پاشدا چوو حەلْەبی موحاصەرە کرد.

عمادئەددین کە زانی ناتوانێ خۆی رابگرێ، تەلْەبی لە سولْتان کرد کە لە باتی حەلْەب، سنجاری لەگەلْ تەوابعیدا ( وەکو نصیبین، خاپوور، رقەو سەروج) بداتێ، سولْتان صەلاح ئەددین ئەم گۆڕینەوەی قبوولْ کرد و لە ١٧ی صەفەری ٥٧٩ ( ١٩ی حوزەیرانی ٨١٣)دا، داخلْی حەلْەب بوو. وە خەلْکی ولاّتەکە بە ئاهەنگ وشادی، ئیستیقبالیان کرد و زۆر مەمنون بوون.

لە وەقتی موحاصەرەی حەڵەبدا بوو، کە خەبەری وەفاتی مجد ئەددین بوری برای بۆ هات و زۆر صەغڵەت بوو.

قاضی شام (محی ئەددینی کوڕی زەکی) ، لە دوای فەتحی حەڵەب قەصیدەیەکی مەدحییەی بۆ سوڵتان نووسی کە ئەم بەیتە لەوە:

وفتحكم حلبا بالسيف في صفر

مبشــر بفتــوج القدس في رجب

حەقیقەت فەتحجی قودس، بە فاصیلەیەکی چوار ساڵی تەصادوفی مانگی موحەرەمی کرد.

لە دوای فەتحی حەلەب، شۆرەت و گەورەیی سوڵتان بە تەبیعەت زیاتر بوو، وە بە گەورەی هەموو ئومەرای ئیسلام ناسرا، بە غەیری موصڵ لە جەزیرەوە تا رملەو لەوێوە تا تەرابلس و یەمەن، هەمووی تابیعی ئەمرو نەهی بوو. تەنیا فکری لەگەڵ زەوت کردنی قودسی شەریف و دەرکردنی فەرەنگ لە وڵاتی ئیسلام، خەریك بوو.

سوڵتان صەلاح ئەددین لە ٣ی جەمادی ئەلئەوەلی ٥٧٩ دا لە حەڵەب جویێ بووەوە. لەو بەینەدا، فەرەنگ لە وەفاتی فەرخشاهی نائیبی سوڵتان لە شام، ئیستیفادەیان کرد وتا نزیکی شام وڵاتیان تاڵان کرد. لە لایەکی تریشەوە ئەمیری کرگ، تا مەدینەی منەوەرە ئەو ناوەی وێران کرد و حەتتا ئەوەنەدی نەمابوو کە مەدینەش بگرێ، بەڵام ئەمیر لۆلۆ بە فریا گەیشت و لەشکری کەرەکی شکاند و زۆری لێ بە دیل گرتن، سوڵتان، لەم ئەحواڵە عاجز بوو، وە ویستی زۆر باش فەرەنگ تەربییەت بکا، بە لەشکرەوە لە چەمی ئەردەن پەڕیەوەو گەیشتە (ببسان) و سوتاندی، وە لە ژووری (الفوله – عفوله) تووشی لەشکری فەرەنگ بوو، بە عەکسی زۆریی، نەیانوێرا بکەونە شەڕەوەو لەدوای بەنێك گەڕانەوە تەرەفی (حضورية).

لەدوای ئەمە سوڵتان چووە سەر کرگ و موحاصەرەی کرد، بەڵام فائیدەی نەبوو. ساڵی دواییش هاتەوە سەری و دیسان نەگیرا.(٦)

لە پاش ئـەم حادیساتە ئومـەرای فـەرەنگ، بـە موتـەفیقی تەڵـەبی صـوڵحی چوار ساڵیان، لە سوڵتان کرد و ئەم تەکلیفەش قووڵ کرا سوڵتا گەڕایەوە شام.

لـەو بەینـەدا، حـاکمی موصـڵ بـە موافەقـەتی خەلیفـەی عەباسـی، ویستی لەگـەڵ سوڵتاندا صوڵح بکاو بەم مەقصەدە بەهائەددین کوڕی شـەدادی کـە لـەلای سـوڵتا زۆر خۆشەویست بوو، لەگەڵ شێخ ئەلشیوخ صەدرئەددیندا، ناردە شام،

بـەڵام سـوڵتان صـەلاح ئـەددین بـە مەصـڵەحەتی نـەزانی، وە لـەدوای بـەینێك بـە لەشکرەوە رووی کردە موصڵ وموحاصەرەی کرد (٥٨١ھ)، حـاکمی موصـڵ بـۆ رجـای صـوڵح، کـچی سـوڵتان نـورەددینی مـامی کـە دایکـی بـوو، نـاردە لای سـوڵتان بـەڵام فائیدەی نەبوو.

سوڵتان کە خەبەری بـەعزێ ئـەحواڵ و ئیختیلافـاتی ئەمەنیـشاتی بیـست، وازی لـە موحاصـەرە هێنـا و چـوو میافـارقینی گـرت (رەبیعـو ئـەلئاخر ٥٨١). وە لـە پاشـدا گەڕایەوە سەر موصڵ، بەڵام نەخۆش کەوت و ناعیلاج ما، گەڕایەوە حەڕان.

لە ڕێگە تووشی مورەخەصێکی تری حاکمی موصڵ هات، بەعزێ شرووگی، باش، وە کوو خوگبە خوێندن و سکەلێدان، بەناوی سوڵتانەوەو تەرك کردنی بەعزێ وڵاتانی تـر، ڕجای ئاشتی کرد.

سوڵتا صەلاح، کە گەیشتە حەڕان نەخۆشـیەکەی قورسـتر بـوو، وە حـەتتا بـەعزێك ئومێـدیان لـە ژیـانی بـڕی و سـوڵتانیش وەصـیەتی کـرد، بـەڵام زۆری پـێ نەچـوو، نەخۆشیەکەی چاك بووەوەو لەو وەقتەدا ئیبن شەداد گەیـشتە حـەڕان (ئـەواخیری ذی ئەلقعدە ٥٨١) و بەناوی حـاکمی موصـڵەوە صـوڵحنامەی مۆر کـرد، بـە گـوێرەی ئـەم صـوڵحە، سـوڵتان صـەلاح ئـەددین بـووە حوکمـداری جـەزیرەی شـیماڵی و بەشـێکی کوردستان.

سوڵتان لە دوای ئەم صوڵحە، لە حەڕان هەڵساو چەند ڕۆژێك لـە حمـص دا مایـەوە، لـەوێ ناصـرەددینی کورشـی شێرکۆهی مـامی کوشـت، چونکە لـە وەقتـی نەخۆشـی

سوڵتاندا لە بەینی ئومەرادا سەعی بۆ حوکمدارییی خۆی کردبوو، لە جێگەی ناصرەدین کوڕەکەی کرد بە حاکمی حمص و لە موحەڕەمی ٥٨٢دا هاتەوە شام.

## سوڵتان صەلاح ئەددین و ئەهلی صەلیب:

سوڵتان صەلاح، لە دوای ئەمە ئیشوکاری سوریەو جەزیرەی بڕییەوە، ئاگری حەسادەت و نیفاقی ئومەرا یئەو ناوەی کوژاندەوەو هەموو تابیعی ئەمرو فەرمانی خۆی کرد, قوەتە بڵاوەکەی ئومەرای موسلمین، کە ئەغلەب بۆ شەڕو دەعوای ناوخۆیان صەرف ئەکرا، کۆکردەوەو بۆ گەیشتن بەو مەقصەدەموبارەکەی خۆی، کە فەتحی قودس و دەرپەڕاندنی ئەهلی صەلیب لە فەلەستین بوو، توانی بە عەمەلی بهێنێو لەم وەحدەتەو نفوزی حاکیمەی خۆی بە تەواوی ئەمین بوو.

ئینجا قەراری بە ئیعلانی جیهادی موقەدەس بەرامبەر بە فەرەنگدا، تەفرەقەو ئیفاقی ئومەرای فەرەنگ لە فەلەستیندا بۆ تەگبیقی ئەم قەرارە زۆر موساعید بوو، با خصوص لە دوای مردنی مەلیك (بالدوین)ی چوارەم، ئیشوکاری حکوومەت بەینێك بە وەکالەت بەدەس (ریاموند)ی حاکمی تەرابلسەوە بوو، لە دواییدا (سیبیل)ی خوشکی پادشا مردوە، کە شووی کرد بە (جۆی) ناو ئەمیرێکی فەرەنگ و تاجیشی نایە سەر سەری. ئەم (جۆی)ە لەشکری کردە سەر ریاموند کە لە گەبریە بوو، وە ئەم ریامودەش داوای کۆمەکی لە سوڵتان کرد. بەڵام سوڵتان ئارەزووی نەئەکرد کە لە پێش تەواوبوونی مودەتی موعاهەدە، هەڵکوتێتە سەر فەرەنگ.

ئەم نقضی عەهدە، ئەمجارەش، لە تەرەف فەرەنگەوە، وە بە واسیطەی رینۆڵدی ئەمیری کەرگەوە، کرا. واقیعەن لە ٥٨٢ هـ دا، کاروانێکی گەورەی ئیسلام، لە وەقتێکدا کە لە نزیك کەرگەوە تێپەڕ ئەبوو، تووشی تەعەڕوزێکی فەرەنگ بوە، وە هەموو ماڵیان لەدەس چوو، پیاوو ئافرەتی ئەم کاروانەش ئەسیر کرا، بە ریوایەتێك خوشکی سوڵتانیش لەناو ئەم ئەسیرانەدا بوو. رینۆڵد بەمەش رازی نەبوو، وە بەعزێ

تەحقیراتو تەعەرروزاتی بە دینی ئیسلامیش کرد. ئەم خەبەرە کە گەیشتە سولتان، زۆر سەغلەت بوو، وە سوێندی خوارد ئەگەر رۆنۆلد بگرێ ئەبێ بە دەسی خۆی بیکوژێ لە دوای ئەم وەقیعەیە، سولتان ئیعلانی غەزای کردبوو، محافەظەی حەجاجیش ئەوەی پێویست بوو کردی، وە لە قەصری سەلامە کە لەنزیك (بصری)ەوە بوو، ئۆردووگای دامەزراند. زۆر ی‌پێ نەچوو لەشکری میصریشی گەیشتێ، وە مەلیك (أفضل)ی کوڕیشی لە جیهەتی عەککاوە، شکستێکی باشی بە بەشێکی ئۆردووی فەرەنگ، دابوو. ریاموندیش لەگەڵ فەرەنگ ئاشت بووەوەو بەم تەرحە قوەتی فەرەنگ زۆر بوو.

سولتان صەلاح ئەددین مەجلیسی شورای حەربی کۆکردەوەو ئەم مەجلیسە، قەراری بە شەڕی فەرەنگدا، رۆژی پێنج شەممو ١٦ رەبیعولئەوەلی ٥٨٣ﻫ، لەشکری ئیسلام بە بەردەمیدا رابوارد، وە رۆژی دوای لەدوای نوێژی جومعە لە خوار طبریة وە، لە چەمی ئەردن پەڕیەوە، وە ناردی بۆ کەشفی لەشکری دوژمن، کە لە صخوریووە بوو. لە دواییدا قوەتێکی بەرامبەر دوژمن داناو خۆی چووە سەر طبریةو زەوتی کرد، بەڵام ماڵ ومنداڵی ریاموند، خۆیان هاویشتە قەڵاکەوەو تەڵەبی معاوەنەتیان لە مەلیك (جۆی)کرد.

لە دوای موزاکەرەیەکی دوورو درێژ، فەرەنگ قەراری شەڕی دا، وە ویستی رێگەی ئەو لە سولتان ببڕێ، بەلام بە غەڵەت چوو، چونکە سولتان ئەم خصوصەی تەئمین کردبوو، رێگەی ئاوی لە لەشکری فەرەنگ بڕیبوو، رۆژی ئەووەڵ، لەشکری فەرەنگ هەوڵی بۆ بڕینی رێگەی ئاودا، بەلام موەفەق نەبوو. وە لەو رۆژە گەرمایەدا خۆیان لە بێ ئاوی شپرزە بوون و گەڕانەوە ئۆردووگای خۆیان. رۆژی دوایی لەشکری ئیسلام بە هەڵمەتێکی شێرانە روویان کردە لەشکری فەرەنگ و تەفرو تونایان کردن، لە لایەکەوە حەملەی ئیسلام و لە لایەکی تریشەوە تەئسیری تینویەتی، فەرەنگی بە تەواوی لەکار خست و ئەم رۆژی (٢٦ی رەبیعولئوخرە ٥٨٦)ە، رۆژی رووخانی بناغەی ئیماراتی

فەرەنگی لەفەستین بوو. مەلیك جۆی، ئەمیری کەرگ، برای مەلیك و بەعزێ ئومەرای تریش، لەگەڵ فەرەنگێکی زۆر بەدیل گیران. داری صەلیبی موقەدەسیش لەناو تالانا بوو. وە لەو ڕۆژەوەی کە فەرەنگر هاتبووە ئەم ناوە، تا ئەو ڕۆژە تووشی شکستێکی وا گەورە و بە تەئسیر نەبووبوو.

لەدوای شەڕ خێوەتێکیان بۆ سوڵتان هەڵداو لەگەڵ ئومەراو پیاو ماقوڵانا تیا دانیشت. مەلیك جۆی و ئەمیری کەرگیان هێناو دانیشتن. مەلیك داوای ئاوی کرد، دەس بەجێ بەفراویان بۆ هێنا، تۆزێکی لێ خواردەوەو دای بە ئەمیری کەرگ، بەلام سوڵتان دەس بە جێ مەنعی کرد و گوتی "ئێمە ئەم ئاوەمان بەو نەداوە تا لە ئینتیقامی ئێمە ئەمین بێ". لە دوای ئەمە باسی وەحشەت و غەدداریی ئەمیر کەرگی، دەرحەق بە کاروان و حەجاجی موسڵمانان کرد و لە پاشدا بە دەسی خۆی سەری بڕیو سوێندەکەی هێنایە جێ.

مەلیك جۆی، لەم معامەلەیە ترسا، بەلام سوڵتان دڵخۆشی دایەوەو لەگەڵ باقی دیلەکانا بە حورمەت و عیززەت ناردنی بۆ شام. تەنیا لە بەینی ئەمانەدا دووصەد کەسێکی هەڵبژارد کە بە خراپەو زوڵمیان، دەرحەق ئیسلام مەشهوور بوون، ئەم دووصەدەی کوشت.

لە دوای چەند ڕۆژێ، سوڵتان چووەوە سەر طبریەو ژنەکەی ریانموند، مەئیوس بوو، قەلاکەی تەسلیم کرد. لە دوای ئەمە، سوڵتان صەلاح ئەددین، ڕووی کردە باقی ولاتانی فەلەستین، زاتەن قوەتێکی وا نەمابوو بەرامبەری ڕاوەستێ و گەیشتە بەرامبەر هەر قەلاو شارێك دەس بەجێ قاپی بۆ ئەکرایەوە. وە دەرحەق بە ئەهالی دایمە ڕووخۆشیو عەدالەتێکی بەرزی ئەنواند.

لە دوای گەبریە ڕووی کردە عەککا. بەلام ئەم قەلایە تەسلیم نەبوو. وە مودافەعەیەکی کورتی کرد، لە پاشدابە ئومێدی لوتفی سوڵتان، تەسلیم بوو. بوە خەڵکی ڕۆیشتن و ڕۆژی ٢ی جەمازی ئەلئولای ٥٨٣، لەشکری ئیسلام داخڵی ئەم

قەلایە بوو. وە لە مزگەوتەکەیدا کە گاوورەکان کردبوویان بە کلێسا، نوێژی جومعەیان کرد. لێرە ماڵ وغەنائیمێکی زۆر دەس ئیسلام کەوت.

لەدوای ئەمە سوڵتان، مەلیك عادلی برای نارد تا لە حدودی میصرەوە دەس پێ بکاو مەلیك عادل (حصن مجدليانا)و (یافا)ی گرت و دیلێکی زۆری دەس کەوت.

سوڵتان خۆشی لە عەککاوە، بەعزێ قۆڵی ناردە (ناصرە) ، (قیساریە)، (صەیفا)،(صەفوریە)، (شەقیف) و (الفولە — عەفولە)ی داگیر کرد. لە لایەکی تریشەوە (نابلس) و(سبسطية)و بەعزێ قەصەبەی تری ئەو ناوەی گرت.

لە دواییدا خۆی بلزات، چوە سەر (تینین)ی گرتی، لەوێوە رووی کردە (صەیدا)و ئەم شارەی بێ شەڕ گرت و (بیروت)ی لە دوای هەشت رۆژ موحاصەرە زەوت کرد.

لە دواییدا سوڵتان ویستی (عەسقەلان) بگرێ، چونکە لەسەر رێگەی میصرو عادەتا قاپی قودس بوو. حەیف کە لەو وەقتەدا ئەهمیەتی نەدایە (صور). وەلحاڵ گاورەکان وردە وردە لەوێ کربوونەوە، بەلام بێ رەئیس بوون. بە هیممەتێکی جوزئی ئەگیرا، وەلحاڵ ئەهمیەتی نەدایەو لە پاشدا، ئەم قەلایە بوو بە ئوس ئەلحەرەکە بۆ گاوورەکانو زۆری پێ نەچوو (مارکیز کونارد)، لە قوستنگینیەوە بە ماڵ وئەسلیحەیەکی زۆرەوە، هات ئەم قەلایەو مودافەعەی تنظیم کرد بوو بە ئوس ئەلحەرەکەی ئەهلی صەلیبی سێیەم و سەبەبی فەلاکەتێکی زۆر بۆ موسڵمانان. ئیهمالی صور خەتایەکی سەوقی جەیش و سیاسیی سوڵتان بوو.

لە پێش هاتنی ئەم مارکیزە، خەڵکی صور خەریکی تەسلیم بوون، بەلام کە (کونارد) هات فیکریان گۆڕی.

سوڵتان صەلاح ئەددین ویستی بە واسیتەی باوکی کونارد کە لە شام ئەسیر بوو، مەنعی مودافەعەی صور بکا، بەلام ئەم تەدبیرە سەری نەگرت.

سوڵتان لە دوای ئەمە رووی کردە عەسقەلان و موحاصەرەی کرد و چواردە رۆژ لەگەڵی خەریك بوو. ویستی بە واسیطەی مەلیك (جۆی)ەوە، ئەم قەلایە بگرێ، بەلام

فائیدەی نەبوو، وە لە نیهایەتی جەمادی ئاخردا بە شیددەت هجومی کردە سەری و گرتی. لە دوای ئەمە غازە، رەملە، خلیل ئەلرەحمان و بیت ئەللەحم و چەند جێگەیەکی تریشی گرت.

ئەم هەموو فتوحاتە، لە زەرفی دوو مانگدا بۆ سوڵتان مەیسەر بوو، وە بە راستی ئەمە بە قیسمەتی هیچ پادشایەد نەبووبوو. لە دوای ئەمە، رێگەی (قودسی شەریف) بۆ ئیسلام کرابووەوە. سوڵتان صەلاح ئەددین ئەیزانی کە ئەهمیەتی ئەو شارە موبارەکە لەلای ئیسلام و گاوور زۆر گەورەیە، لەبەرئەوە نەیئەویست بە زۆر و بەشەڕ بیگرێ و تووشی موحاصەرەو تەخریبی بکا. بەم فیکرە هەیئەتێکی نارده قودس، تا بۆ تەسلیم بوونیان قسە لەگەڵ خەڵکەکەی بکەن. فەرەنگی ئەوێ تەکلیفی تەسلیمیان قبووڵ نەکرد، لەو وەقتەدا قوماندانی قودس، حاکمی (رەملە) بلبان بوو، کە لە شەڕی (حطین)دا ئەسیر بووبوو، وە ئیزنی لە سوڵتان خواستبوو کە بچێتە قودست وماڵەکەی بهێنێ و شەوێك زیاتر لە قودسدا نەمێنێتەوە. بەڵام ئەم قوماندانە بێ شەرەفە، بیلعەکس، لە قودسدا مایەوەو بوو بە فۆماندانی مودافەعەی شارەکە و شەست هەزار کەسێکی لێ کۆبووەوە، وە گەورەی قەشەکانی قودس، خەزێنەی کڵێسای بۆ کردەوە، تا بۆ مودافەعە صەرفی بکا.

سوڵتان صەلاح ئەددین کە وایزانی بە لەشکرەوە رووی کردە قودس و لە ۱۵ی رەجەبی ۵۸۳ھ دا گەیشتە ئەوێ و دەورەی دا. وە لەدوای کەشف و سەرنجێکی پێنج رۆژی، لای شیمالی بۆ هجوم بە موناسیب زانی، وە نەقڵی ئەوێی کردو جەبەل ئەلزەیتونی کرد بە مەرکەزی ئۆردوو، وە لە وێوە دەسی کرد بە تضیقی شارەکە. لەشکری ئیسلام وردە وردە پێشکەوتن، لە چاڵەکەی دەوری تێپەڕ بوون و شوورەی وڵاتەکەشیان کون کرد. ئەم حاڵە بووە سەبەبی مەئیوسیەتی مودافیعینی فەرەنگ و تەڵەبی ئەمان و تەسلیمیان. لە دوای موزاکەرەیکەی دوورو درێژ بە شەرتی ئەمەی

کەلە زەرفی چل ڕۆژدا، فەرەنگ بە سەربەستی لە شارەکە دەرچن، وە هەر پیاوێك دە دینارو ژن پێنج و منداڵ دوو دینار فدیەی نەجات بدەن.

بەم قەول و بڕیدەیە، قەراری تەسلیمی شارەکە درا. لە ئیعتیباری ڕۆژی جومعەی ٢٧ی رجبی ٥٨٣وە، ئەهالی دەسی کرد بە دەرچوون لە قودس. بەم تەرحە، فەتحی قودس مەیسەر بوو وە هەروەکوو قاچی شام محی ئەددین لەدوا فەتحی حەڵەب تەخمینی کردبوو، لە مانگی رەجەبدا واقیع بوو. فیلحەقیقە سوڵتان ئەم قازیە فازیڵەی بانگ کردە قودس تا لە ڕۆژی فەتحیدا وظیفەی خەتیبی بەجێ بهێنێ، وە ئەو جومعەیە نوێژکەر ئەوەندە زۆر بوو کە مەسجدی ئەقصا نەیئەگرت.[٧]

ئەم فیدیەیەی سوڵتان صەلاح ئەددین تەڵەبی کردبوو، تەنیا بۆ مەنسوبینی لەشکری فەرەنگ بوو وە موساعەدەی کردبوو کە گاوورەکانی قودس وەکوو خەڵکی گاووری شارانی تر لە جێگەی خۆیانا بە صیفەتی تەبەعە بمێننەوە.

سوڵتان صەلاح ئەددین لە دوای دەرچوونی ئومەراو لەشکری فەرەنگ، ئینجا داخڵی قودس بوو. بێجگە لەوەش سوڵتان حەوت هەزار فەقیری لەسەر تکای مەلیك عادلی برای و خۆشی دە هەزار کەسی لە فدیە عەفوو کرد. ڕۆژێکیش لەو سبەینێوە تا ئێوارە بەبێ فدیە موساعەدەی دەرچوونی فەقیرو فوقەرا کرا. ئیزنی بە قەشەکان و مەئمورینی روحانیش دا کە تا ئەتوانن شت و مەك لەگەڵ خۆیانا بەرن.

خولاصە گەورەیی و مەرحەمەت و عەدالەتی سوڵتان، لە فەتحی قودسدا لە حەدبەدەر بوو، وە موحەڕیڕین و موئەریخینی گاووران، هەموو تصدیقیان کردوە.

زۆر حورمەتی ضعفاو با خصوص ئافرەتی گرت و زۆر یاریەی دان و مەلکە سیبیلی بە حورمەت و ئیکرام و لەسەر ئارەزووی خۆی ناردە لای مەلیك جۆی مێردی کە لە نابلس ئەسیر بوو.

بەعزێ لە ئافرەت، لە وەقتی دەرچوونیان، کە گەیشتنە لای سولتان، رجای بەردانی مێردو کوڕو باوکیان لە ئەسارەت کرد وسولتان زۆر موتەئەسیر بوو وە رجاکەی بەجێ هێنان.

ئەم موعامەلەی ئینسانانەی سولتان دەرحەق بە فەرەنگی فەلەستین و قودس بە تەواوی عەکسی موعامەلەی ئەوان بوو دەرحەق بە موسڵمانان.

واقیعەن کە لە ساڵی ١٠٩٩م دا کە (غودفری) قودسی گرت، ئەنواعی شەناعەت دەرحەق موسڵمانان کراو بە ئیعترافی موئەریخینی عیسەوی، نزیکی حەفتا هەزار موسڵمان قەتڵ و عام کرا.

سولتان صەلاح ئەددین نزیکی مانگێك لە قودسی شەریفدا مایەوەو ئیوشوکاری رێکخست و مزگەوتەکانی تەعمیرو ئەحیا کردەوەو مەدرەسەکانی دامەزراندەوەو باقی نوقصانی ئیکمال کرد. لەدوای ئەمە بە لەشکرەوە رووی کردە صور. دوژنمای میصریش بە ئەمری سولتان رووی کردبووە ئەم قەلایە. مارکیز کونارد، لە فرصەت ئیستیفادەی کردبوو، وە ئەم قەلایەی زۆر باش تەحکیم کردبوو، هەرچەند لە بەحرو بەڕەوە تەچیقیان کرد، فائیدەی نەبوو. وە زاتەن زستانیش بەسەرا هات و لەسەر تەکلیفی بەعزێ ئومەرا صەرفی نەزەر لە موحاصەرە کرا، بەلام سولتان لەم حاڵە زۆر پەشێو بوو، چونکە ئومەرای لەشکر ئەهمیەتی ئەم قەلایەیان بەقەدەر سولتان تەقدیر نەکردبوو، وەلحاڵ لازم بوو هەرچۆنێ بێ ئەم قەلایەش لەدەس فەرەنگ بسێنن و فەلەستین بە تەواوی پاك بکەنەوە. حەیف کە خیلافی ئارەزووی سولتان ئیصراریان لەسەر گەڕانەوە کرد.

ظاهیر وایە کە لەم جیهەتەوە سێ غەڵەت کراوە ئەووەڵی، لە وەقتی خۆیدا وە لە پێش فەتحی قودسدا ئەبوایە ئەم قەلایە لەدەس فەرەنگ بسێنرێ. دووەمی، ئەبوایە سولتان صەلاح ئەددین نەیهێشتایە ئەوانەی کە شەڕیان پێ ئەکرێ وە لە ئەسیری بەرەڵا کران وە یا لە شارە زەوتکراوەکان دەرچوون، لە صوردا کۆببنەوە، وە

مانیعەیەکی تازە بۆ ئیسلام تەشکیل بکەن. سێیەمی، ئەبوایە لە دوای فەتحی قودس کە لەشکری ئیسلام هاتەسەر ئەم قەلایە، وازی لێ نەهێنن و هەرچۆنێ بوایە زەوتیان کردایە.

خولاصە فەتحی قدس لە تەڕەف موسلمانانەوە ئەورووپای خستە تەعەصوب و تەلاشەوە، قەشە موتەعەصیبەکان داوێنیان لێ هەلکردو دەسیان بە تەحریکات کرد وبە نەتیجە قوەتێکی عەڤیم کۆبووەوە و لە هەموو لایەکەوە روویان کردە فەلەستین. ئیمپراتۆری ئەلمانیا و مەلیکی ئینگلیز، کە رە ریشاری شیردل مەشهوور بوو، لە روئەسای هەرە گەورە ئەم ئەهلی صەلیبە بوون.

سولتان صەلاح ئەددین لەو بەینەدا قەلای (هونین)ی گرت و قەلای کەوکەب و صەفدو کەرگیشی موحاصەرە کرد ولە ١٦ی رەبیعولئەوەلی ٥٨٤دا هاتەوە شام و لەوێ لەشکرێکی زۆری هەلگرت و رووی کردە تەرابلس و ئنطاکییە، لە دوای زەوت کردنی، ئەنگرۆس، مەلیك (جۆی)ی بەرەلڵا کرد و شەرگی لەگەلێ کرد کە لە سوریەدا نەمێنێتەوەو بچێتەوە بۆ ئەورویا و قەت بەرامبەر بە سولتان شەڕ نەکا. وەلحالێ ئەم مەلیکە درۆزنە چوو بۆ صور، بەلام کونارد قبوولی نەکرد و لە پاشدا چووە تەرابلس و بەعزێ لە بەقایای ئەهلی صەلیبی کۆکردەوەو لە پاشدا لەگەلێ لەشکری صور چووە سەر عەککا.

سولتان صەلاح ئەددین لەم سەفەرەیدا (مرقب، جبلە، لاذقیة، صەهیون)و بەعزێ قەلاو شارانی تریشی زەوت کرد. لە پاشدا بەسەر حەلەبدا گەڕایەوە شام، وە لەدوای ئەمە لەشکری ئیزن داو خۆی لەگەلێ خەواصی لەشکری، بەو زستانە چووە سەر صەفەد و کەوکەب و هەردووکی زەوت کردو لەو بەینەدا خەبەری زەوت کرانی کرگیش لە تەڕەف مەلیك عادلەوە گەیشتە سولتان.

سولتان صەلاح ئەددین بە غەیری صور هەموو شاران و قەلای فەلەستینی گرت، بەلام مانەوەی صور بەدەس فەرەنگەوە تەهلەکەیەکی زۆر گەورە بوو. زاتەن

هەیەجانی تەعەصوبی ئەوروپاش ئەهلی صەلیبی سێیەمی وردەوردە ئەگەیاندە صورو نیهایەت لە ئیبتیدای ساڵی ٥٨٥دا وەزعیەتی عەسکەریەی سولتان گۆڕاو لە تەعەروضەوە کەوتە مودافەعە.

کونـاردی قۆمانـدانی صـور، لەشـکرێکی قـەقوەتی پێکـەوەنا ئـەم حەرەکەتـە موقەدیمەی فەرتەنەیکی گەورە بوو کە رووی ئەکردە مەملەکەتی ئیسلام. مەلیك جۆی خیلافی وەعدی، لەشکری زۆری لە تەرابلس کۆکردبووەوەو سەفائینی فەرەنگ دایمە ئەهاتن و ئەرزاق و سیلاحیان بۆ ئەهێنا.

سولتان صەلاح ئەددین بەرامبەر بەم ئەحواڵی خۆی حازر کردو بە لەشکرەوە لە (مـبرج ئـەلعیون)دا إنتظـاری ئـەحواڵی کـرد و لـە لایـەکی تریـشەوە قـەڵای (شـقیف ئەرنون)ی موحاصەرە کرد، بەڵام کە دی فەرەنگ تەنگی بە عەککا هەڵچنیوە بەشێکی لەشکری لە دەوری شقیف بەجێ هێشت و خۆی رووی کردە عەککا.

موحاصیری عەککا، مەلیك جۆی بوو. وە نزیك دوو ساڵێك ئەم موحاصـەرەیە گووڵی کێشا. سەبەبی دەوام کردنی موحاصەرەیش یەك لە دوای یەك هاتنی ئیمدادی فەرەنگ بوو، وەحەتتا کوناردیش ئیشتیراکی ئەم موحاصەرەیەی کرد. ئەگەر سولتان صەلاح ئەددین ئەهمیەتێکی تەواوی بە موحاصیرینی عەککا بدایە و لە پێش زۆربوونیان و هاتنی کورنارد زەربەیەکی باشی لێ بدانایە، نە موحاصەرە گووڵی ئەکێشاو نە فەرەنگ ئەکەوتە گەماعی سەندنەوەی فەلەستین و قودس.

بە عەکسی ئەمـە سولتان زۆر ئەهمـەیتی بـە قـەڵای شـقیف داو مـەلیك جـویێ ی سەربەست جێ هێشت و بەرەبەرە قوەتی زیاد بکا.

سـولتان صـەلاح ئـەددین گەیـشتە عـەککاو دی کـە فـەرەنگ لەگـەڵ موحاصـەرە خەریکن. لە دوای چەند رۆژێك تەعەروچی کردە قوەتی موحاصەرە، با خصوص ئەمیر تقی ئەددین ی برازای بە قوەتێکەوە بە راستی هجومێکی شێرانەی کردو تـەرەفێکی عەککای بە دوژمن چۆڵ کرد و رێگەی بۆ شارەکە کردەوەو سولتان مقداریێ قـوەتی

گەیاندە ناو شارو حەتتا (ستانلی) ئەڵێ بالنفس سوڵتان خۆشی وەقتی عەصری رۆژی ٢ی شعبان ی ٥٨٥ھ، داخلی عەککا بوو.

ئەمیر حسام ئەددین سمینی کرد بە قوماندانی قەلاکەو کە شەو هات بەسەردا، لەشکری ئیسلام گەڕانەوە ئۆردوگاو، لەم فرصەتەدا فەرەنگ تەحکیماتێکی زۆری کردو ئەو رێگەیەی کە ئۆردووی ئیسلام بە رۆژ گرتبووی، بەربەستی کرد. بەم تەرحە رەنجی سوڵتان بە ضایع چوو.

سامی دوژمن بە نەوعێك شکا، کە لە ٥ی رەمەزانی ٥٨٥ھ دا بێجگە لە موحاصەرەی قەلاکە، هجومێکی بە شیددەتیشی کردە سەر لەشکری ئیسلام و بڵاوەی پێ کردن. لەم بەینەدا لەشکری ئیسلام زۆر بلاو بووەوە، بەشێکی بەرامبەر بە ئەمیری إنطاکیة (بوئەمۆند) وەستابوو، قوەتێکی تر بەرامبەر بە ئەهلی صەلیب، دومیاگ و ئەسکەندەریەیان موحافەڤە ئەکرد.

لە لایەکەوە تەئسیری ئەم نیوە شکانە[٨] و لە لایەکی ترەوە بە سەراهاتنی زستانو رەمەزان و ئیصراری ئومەرای ئیسلام بۆ شەڕنەکردن و گەڕانەوە، سوڵتان صەلاح ئەددینی مەجبووری هاتنە دواوە تا (خروبە) کرد وعەککای سپارد بە قەزا و قەدەر.

سوڵتان صەلاح ئەددین، لە غیرەت و فەعالیەتی فەرەنگ و سستی و خۆلەشەڕ پاراستنی ئیسلام، زۆر صەغڵەت بوو. وە دەرکی تەهلەکەی دوایی کرد. کاغەزی بۆ هەموو لایەك نووسی و داوای کۆمەکی کرد و زستانی بەبێ حەرەکەت لە خروبەدا رابوارد و لەو نەخۆشیەی کە تووشی هاتبوو[٩]، وردە وردە چاك بووەوەو لەشکریشی لێ کۆبووەو لە دواییدا هەڵساو رووی کردە فەرەنگ ( ١٧ی رەبیعولئەوەلی ٥٨٦). لە دوای ئەو تەئریخە بە ٧رۆژ سوڵتان گەیشتە بەر عەککا.

تا ئەو وەقتە دوژمن تەرتیباتی موحاصەرەی تەواو کردبوو، وە تەنگی بە مودافیعینی هەڵچنیبوو.

لەو بەینەدا دوننمای میصریش هـاتبووه بـەر عـەککاو دوننمـای فـەرەنگی شـکاند و داخڵی لیمانی قەڵاکە بوو، وە ئیحتیاجاتی مودافیعین، ئیکمالی کرد.

لەم وەقتەدا بوو کەخەبەری داخل بوونی ئیمپراتۆری ئاڵمان (فردریق یاریارۆس) بـە ئەهلی صەلیب و حەرەکەت کردنی بۆ فەلەستین، گەیشتە سوڵتان. پیشداری ئـۆردووی ئاڵمان، گەیشتبوه شیمالی کلکیا (ولاتـی أطنـة) سـوڵتان صـەلاح ئـەددین بەرامبـەر بـە لافاوی ئەهلی صەلیب داوای کۆمەکی لە حوکمداران و ئومەرای ئیسلام کردو حـەتتا بـۆ تەڵەبی معاوەنەت هەیئەتێکیش نارده لای سـوڵتانی مـەراکیش (یـەعقوب ئەلمەنـصور) زۆر حەیف کە لـە هـیچ لایەکـەوه گـوێ نەدرایـە قـسەی سـوڵتان و کـەس یارمـەتی بۆ نەنارد، وە بەم تەرحە ئەم قەهرەمانی گەورەی ئیسلامە، بەرامبەر بە ئـەهلی صـەلیب، تەنیا بە لوتفی خواو قوەتی خۆی راپەرموو.

ئیمپراتۆری ئاڵمان لە ١١ی حوزەیرانی ١١٩٠م دا لە چەمێکدا خنکـاو لـە دوای ئـەمـە بەشێکی ئۆردووی ئاڵمان گەڕایەوه مەملەکەتی خۆی و بەشێکیشی لـە ئیـدارەی کـوڕی فرەدریق یاریارۆس (دوق دوسوابیادا)، بەسەر إنطاکیەدا رووی کرده فەلەستین.

بەشێکی ئۆردووی ئەهلی صەلیب، لەگـەڵ موحاصـەره خـەریك بـوون. وە بەشـێکی زۆریشی بۆ شەڕی سوڵتان جوێ کرابووەوه. ئەم بەشە لە ٢٠ی جمادی ئـەلئاخر ٥٨٦هـ (٢٥ی تەمموزی ١١٩٠)دا هجومیان کرده سەر لەشکری سوڵتان و لە ئیبتیدادا بەشـێکی لەشکری ئیسلام، خراپ شکاو بڵاوەی کـرد. حـەتتا بـەعزێ لـەمان تـا (طبريـة) و شـام خۆیـان نەگرتـەوەو لەشـکری فـەرەنگ تـا ئۆردووگـای سـوڵتا هـات، بـەلام لـە پاشـدا موگەبەقی قوەتی ئیسلام هەڵیان کوتایە سەر فەرەنگ زۆر خراپ شـکاندیانن. مەیـدانی موحارەبە پڕ بوو لە مەیت، و جورئەتی صەلیب بە تەواوی شکا.

لـە لایـەکی تریـشەوه مـودافیعین، بـە بـە عـزێ وەسـائیلی ئیبتیـدائی، بورجـەکانی موحاصرینیان ئاگر تێبەرداو لەگەڵ موحارییەکاندا سووتاندیان.

## تەماسی سوڵتان لەگەڵ لەشکری ئینگلیز:

لـە ٢٢ی جـەماژی ئـەلئاخرە ٥٨٦هـ دا، لەشـکرێکی زۆر یئـەهلی صـەلیب، لـە قوماندانی (قۆنت هـانری)دا کـە خوشـکەزای قـەڕاڵی ئینگلیـز بـوو، گەیـشتە بـەردەمی عـەککاو هاتـە دەرەوەو ئۆردووگـای دامەزرانـد، وە خـۆی بـۆ تەعـەڕوزێك حـازر کـرد. سوڵتان کە ئەم خەبـەری بیـست، مـەوقیعی خـۆی بـۆ موحارەبـە بـە موسـاعید نـەدی، گەڕایەوە (ئەلخروبە) وەلحاڵ بەم تەرحـە دوورکەوتنـەوەی سـوڵتان ئـەزم و شـیددەتی فەرەنگی لە موحاصەرەدا زیاتر کردو سەرلەنوێ تەنیگان بە مەحصورین هەڵچنی.

میری قەڵا، ئەمیر حسام ئەددین، لـە لایەکـەوەو قوماندانی تـەحکیمات (بهائـەددین قەرقوش) لە لایەکی ترەوە مودافیعینیان تەشـجیع ئـەکرد و مەردانـە بەرامبـەر هـەموو هجومی فەرەنگ وێستان. موئەریخ (میشور) زۆر مەدح و سەنای فەعالیەت و مەتانـەتی ئەم دوو قوماندانە ئەکا. زۆر جار سیارقلەی هجومی دوژمنیان سـووتاندو گـەلێ جار لـە قەڵا دەرئەپەڕین و فەرەنگەکانیان مەجبوری جێگە گۆڕین و گەڕانە پاشەوە ئەکرد.

قۆنت هانری، بەرامبەر بەم مودافەعەی مەردانەیە مەئیوس بوو، وە هەموو قـوەت و تەدبیری، حصر کردە سەر دەورەدانی و تضیقی قەڵاکە. لەو بەینـەدا خواردەمـەنی لـە هەردوولادا زۆر کەم بووبوو، بەڵام سوڵتان لە بیروتەوە میقدارێکی موناسیب زەخـیرەی گەیاندە عەککا و تەسلیمی مودافیعینی کرد.

ئەهلی صەلیب، کە زانیان موحاصەرەی بڕی ئەوەندەی تەئسیر ناکاتـە مـودافیعین، هاواریان نارد بۆ پاپا، و سەرلەنوێ لە ئەوروپا پڕوپاغانـدا دەسـی پـێ کـردو قـوەتێکی زۆری صەلیب پێ دەرپێ گەیشتە بەردەمی عەککا.

قۆنت هـانری، وەضـعیـەتی حەربییـەی بـۆ ئـەهلی صـەلیب، بـە موسـاعید زانـی و تەعەرضـێکی کردە لەشکری ئیسلام. تەصادوف سوڵتان صەلاح ئـەددین ناسـاغ بـوو، لە ژێر خێوەتێکدا دانیشت و سەیری مەیدانی موحارەبەی کرد. شەڕ گەلێ گوولی کێشا، بەڵام لە نەتیجەدا فەرەنگ ضائیعـاتێکی زۆری دا، وە بـە پەشـۆکی گەڕایـەوە جێگـەی

خۆی موئەلیفی (مصور تاریخ اسلام)، سەیید ئەمیر عەلی ئەڵێ ئەگەر سولڵتان خۆی شەڕی ئیدارەی بکردایە، موحەقەقە لەشکر ئیسلام ضەففەرێکی قەطعی و گەورەی دەس ئەکەوت.

لەو بەینەدا بە سەبەبی فەرتەنە، دونمای فەرەنگ لە عەککا دوو کەوتبووەو لەشکری ئیسلام لەم ظەففەرە ئیستیفادەیان کرد و مودافیعینی عەککایان گۆڕی.

بەڵام خیلافی ئارەزووی سولڵتان، لەشکرێکی کەمتریان تیا داناو لەلایەکی تریشەوە سیلاح و جبەخانەیەکی تەواویان نەدانێ. (ئەمیر سەیف ئەددین عەلی المشطوب) کرا بە قوماندانی عەککا.

بەعزێ لە موئەریخین ئەڵێن: سەبەبی لە دەسچوونی عەککا، کەمیی مودافیعین و شەڕکردنی نابەدڵیان و هاتنی ئیمدادێکی زۆر بۆ ئەهلی صەلیب بوو.

قەراڵی فەرەنگ (فلیب ئۆگوست) لە ١٢ی ربیع الاول ٥٨٧هـ دا بە لەشکرێکی زۆرەوە گەیشتە بەردەمی عەککا، بەمە لەگەڵ ئەهلی صەلیب یەکدگیر بوو. ئەم قوەتە تازەیە فائیقیەتی عەددەییەکی فەوقەلعادەی دا بە ئەهلی صەلیب و سولڵتان لەسەر ئەمە داوای کۆمەکی لە ئومەرای ئیسلامی تابیعی خۆی کرد. زۆری پێنەچوو قەراڵی ئینگلیز (ریشاری شیردل) یش کە بە جورئەت و ئازایی لە ئەوروپدا بە شۆرەت بوو، گەیشتە عەککا.[١٠]

موحاصەرەی عەککا لە تەرەف بەحرو بەرەوە، بە شیددەت دەوامی کرد. مودافیعین مودەتێك بەراستی سەربازانە مودافەعەیان کرد. سولڵتان صەلاح ئەددین هێشتا ئیمدادی بۆ ناهاتبوو، وە قوەتەکەش بۆ تەعەروج موساعید نەبوو. مودافیعین زۆری پێ نەچوو تووشی برسیەتی و گاعون بوون، وە لە ژێر باری ئەم موسیبەتانەدا زۆر بێ هێز کەوتن. بە ئەمری سولڵتان گەمیەك لە بیروتەوە پڕ لە زەخیرەو ئیمداد، نێررا بۆ عەککا. بەلام لە رێگا تووشی تەعەرزی قەراڵی ئینگلیز بوو، وە قوماندان

گەمیەکەی بە ناعیلاجی غەرق کردو ئەمە بۆ مودافیعینی عەککا چەربەیەکی بە شیددەت بوو.

ئەهلی صەلیب لە تەڕەف بەحرو بەڕەوە، بە شیددەت قەلاکەیان تەضیق کرد.

مودافیعین لە لایەکەوە بەرامبەر بە تضیقات و بۆمباردمانی دوژمن و لە لایەکی تریشەوە بەرامبەر بە برسێتی و ئەنواعی نەخۆشی، لە موجادەلەدا بوون و قودرەتی مقاوەمەتیان بە تەواوەی شکابوو. قەلای عەکا دوو ساڵ بووکە موقابیل بە فەرتەنەی صەلیب بە هیممەتی موجاهیدانەوە خۆی ڕاگرتبوو. بەڵام ئیتر کەڵکی پێوە نەمابوو. تەڵەبی معاوەنەتی لە سوڵتان کرد بەلام چونکە قوەتی لەشکری ئیسلام ئەوەندە نەبوو، ئەم معاوەنەوە نەکرا.

قوماندانی قەلاکە ئەمیر سەیف ئەددین عەلی مەشکوب، موقابیل بەم وەچعیەتە بۆ موزاکەرە چووە لای قەڕاڵی فەرەنساو پێی گوت " ئێمە شارەکەتان تەسلیم ئەکەین بە شەرتێك ئیوەش عەینی مەعامەلەمان لەگەڵ بکەن " فلیب ئۆگوست بەرامبەر بەم تەکلیفە ماقوڵە گوتی " من قەت ڕازی نابم کە لە خەڵکی عەککاو مودافیعنی، یەکێك ساغ بمێنی". لەسەر ئەم جوابە ئەمیر سەیف ئەددین گەڕایەوە عەککا.

عەککا موددەتێکی تر خۆی ڕاگرت، بەلام برسیەتی و نەخۆشی مەیدانی نەداو نیهایەت بە شەرتی محافظەی ڕۆحی موسڵمانان، تەسلیم بوو (١٧ی ڕەجەب ٥٨٧، ١٢ی تەمموز ١١٩١). بە گوێرەی شرگنامەی تەسلیم، ١٦٠٠ ئەسیری ئەهلی صەلیب بەرەڵلا ئەکراو ٢٠٠ لیرەش بە ڕونەسای صلیبیون ئەدرا.

بەلام ئەهلی صەلیب کە سەرمەستی تەعەصوب بوون، گوێیان نەدایە شەرت و عەهد، قەتڵ و عامێك زۆریان لە عەککا دا کرد. قەراڵی ئینگلیز، بە قایای مودافیعینی کۆکردەوەو لە دەری شار، لە ٢٣ی ڕەجبدا، هەمووی کوشتن. بەم تەرحە مودافەعەی عەککا بووە سەبەبی لەناو چوونی شەست هەزار موسڵمان.

لە پێش گرتنی عەککا دا، لە بەینی رونەسای ئـەهلی صـەلیبدا، نیفـاق و ئیختـیلاف دەسی پێ کردبوو. بەینی قەڕاڵی فرانسەو قەڕاڵی ئینگلترە، خراپ بوو.

بـەینی مـەبیك جـۆی و مـارکیز غونـاردیش، لەسـەر طـەمعی تـاجی لەفەسـتین تێـك چووبوو. قەڕاڵ فلیب تەڕەفداری غونارد بـوو. وە قـەڕاڵ ریـشاریش مـەلیکی (جـۆی)ی حیمایە ئەکرد. لەسەر بـەعزێ موعامەلـەی حـەقارەتی مـەلیك ریـشار، قـەڕاڵی فرانـسە عاجز بوو، وە لـە ٧ی رەجبـی ٥٨٧دا فەلەسـتینی بـەجێ هێـشت و ڕۆیـی. غونـارد لـە عەلەیهی مەلیکی ئینگلتەرا، لە ژێـرەوە موخابـەری لەگـەڵ سـوڵتان ئـەکرد و خـەریکی ئیتیفاق بوو.

خولاصە ئەم نیفاقی بیەنی ئومەرای صەلیبە، صولت و شیددەتی فـەرەنگی سـست کرد و بەکەڵکی ئیسلام هات.

قەڕاڵی ئینگلیز، تەفریبەن لە دوای مـانگێ ئیـستراحەت، لـە عـەککا دا، رووی کـردە یافا. وە لە ڕێگا لەژێر تعروضی بەردەوامی لەشکری ئیسلامدا، ضائیعاتێکـی زۆریانـدا. قەڕاڵ ریشار یافای تەحکیم کرد و بەعزێ قەڵاشی لەویشدا دروست کردو بەڵام لەشکری موجاهیدین فرصەتیان نەئەدایـە و دایمـە بـە شـەڕو شـۆڕ تەنگـەتاویان ئـەکرد، حـەتتا دەفعەیەکیان ئەوەندەی نەمابوو کە ریشرد ئەسیر بێ.

خوڵاصە قەڕاڵی ئینگلیز باش تێ گەیشت کە عەزم و سەباتی سـوڵتان و مـەهارەتی حەربیەی، لەگەڵ هیچ دوژمنێکدا موقایەسـە نـاکرێ وبەرامبـەر بـەم دوژمنـە گەورەیـە، شەڕکردن بێ فائیدەیە. چ ئەم قەناعەتەی چ مەیلی گەڕانەوەی بۆ ئینگترا، هێنایە سەر ئەوەی تەڵەبی صوڵح بکا.

سوڵتان صەلاح، لەگەڵ عەزم و مەتانەتی خارقولعادەی لە بەعزێ ئـەحواڵ و زۆریـی چایعاتی لەشرەکەی، موتەئەسـیر بـوو. لەبـەر ئەمـە موراجەعـەتی ریـشاری بـە مـەلیك عادلی بـرای بـۆ صـوڵح بـە موناسـیب بینـی. مـەلیك عـادل و ریـشارد مولاقاتیـان کـردو (هۆمفری دوتورن) تەرجومانی لە بەیندا کـرد. بـەلام چـونکە تـەکلیفی قـەڕاڵی ئینگلیـز

ئەوەنـدە موسـاعید نـەبوو، موزاکـەرەو هاتووچـۆی سـەری نـەگرت. لەگـەڵ ئەمەشـدا، لەدوای تەشەبوسی صوڵحی (مارکی دوفروا)، قەڕاڵی ئینگلیز، دیسانەوە داوای ئاشتی کرد. نیهایەت موزاکەرەی ریشارو مەلیك عادل هاتـە سـەر ئـەوەی کـە قـەڕاڵی ئینگلیـز خوشـکەکەی خـۆی بـدا بـە مـەلیك عـادل و ئـەو موڵکانـەی قـەراغی بـەحر کـە دەسـی کەوتبوو، بە شکڵی دیاری مارەیی تەرکی کا، وە سوڵتان صـەلاح ئـەددینیش ئـەراضـی مەفتەحـەی قـودس، بـدا بـە مـەلیك عـادل و شـاری قودسـیش بـۆ ئیـسلام و گـاوور سەربەست بهێڵرێتەوەو لەژێر ئیدارەی خوشکی قەڕاڵدابێ.

سوڵتان صەلاح ئەددین ئەم شروطەی بە نابەدڵی قبووڵ کـرد، بـەڵام قەشـەکان بـەم ئیزدیواجـە رازی نـەبوون و هەرەشـەی (ئـافورون)یـان لـە قـەڕاڵ و خوشـکەکەی کـرد، لەبەرئەوە ئەم صوڵحە سەری نەگرت.

تەنیا فائیدەی ئەم موزاکەرەو هاتوو چۆیە ئەوەبوو، کە سوڵتان صەلاح ئەددین لەم فرصەتە ئیستیفادەی کرد. عەسقەلانی وێران کرد و سەبەبی ئەم تەخریبەی ئـەوە بـوو کە ئومەرای موسلیمین رازی نەبوون کە وەکوو عەککا مودافەعەی بکـەن، و لـە لایـەکی تریـشەوە هێشتنەوەی نـەبووە سـەبەبی ئیـستیفادەی ئـەهلی صـەلیب لـەو قەڵایـە، و تەعەرۆزکردنە قودس.

خوڵاصە تـەخریبی ئـەم قەڵایـە لـە ٢٩ی شـەعبانی ٥٨٧دا تـەواو بـوو. وە لـە دوای ئەمە، سوڵتان ئەمری بە تـەخریبی رملەش دا، وە خۆشـی بـە لەشـکرەوە چـووە (عـین ئەلنطرون) ولە وناوەدا جێگەیەکی نەهێشت کە ئەهلی صـەلیب بتـوانن ئیـستیفادەی لێ بکەن. وە کە زستان هات بە سەرا سوڵتان چووە ( قودسی شەریف) و موجاهیدینیشی ئیـزن داو قـوەتێکی کـەمی لـە دەورمـا. وە بـە واسـیطەی ئەمانـەوە، لـە لایەکـەوە تەحکیماتی قودسـی، تەقویـە ئـەکرد و لـە لایـەکی تریشەوە دەرحـەق بـە حـەرەکاتی دوژمن، ئیستیکشافاتی ئەکرد.

ریشار، لە ئەوائیلی ذی ئەلحجدا وە بە عەکسی سەرماو صۆڵەی زستان، رووی کردە رملەو بە ئەزیەتێکی زۆر، ئەم قەصەبەیەی گرت و لە پاشدا تا (بیت نوبە)ش هات، بەلام خۆی رانەگرت و گەڕایەوە و بەعزێ ئەهلی صەلیبیش بڵاوەی کرد و چوون بۆ (یافە) و (عەککا). بەم تەرحە قوەتی ریشار کەم بووەوە، وە ویستی عەسقەلان تەعمیر بکاتەوەو بیکا بە ئوسی حەرەکە بۆ خۆی، بەلام نیفاقی بەینی صەلیب و رقەبەریی کونارد لەگەڵ (ریشار)دا وە ئەخباری ناموساعیدی ئینگلترە، ریشاری مەئیوس کرد و دیسانەوە کەوتە تەڵەبی صولح، لە وەقتی بەهاردا بەعزێ عوصیان لە وڵاتانی جەزیرەدا روویدا، وە سوڵتان صەلاح ئەددین مەجبور بوو لەشکرەکەی نارد بۆ جەزیرە.

ریشار ویستی لەم وەضعیەتە ئیستیفادە بکا، وە تەعەروض بکاتە سوڵتان، بەم فیکرە لەشکری کۆکردەوەو لە ئەواسیطی جەمادی ئەلئولی ٥٨٨ﻫ دا تا حصن ئەلدارون چوو.

لەدوای خراپەو کوشتارێکی زۆر لە ئیسلامی ئەو ناوەدا، ریشار لە ترسی شکان و نەگرتنی قودس، ویستی بگەڕێتەوە. بەلام ئەهلی صەلیب بە قسەیان نەکرد و بە ناعیلاجی تا (بەیت نوبە) چوو، بەرامبەر بەم حەرەکەتی ئەهلی صەلیبە، سوڵتان صەلاح ئەددینیش بۆ مودافەعەو مقاوەمەت خۆی حازر کردبوو، وە هەر کانی و ئاوێکی سەر رێگەی دوژمن بوو، هەمووی وێران کرد. نیهایەت ئەم حاڵە ئومەرای صەلیبی بێزار کرد ولە مەجلیسێکی حەربدا، قەراریاندا کە واز لە قودس بهێنن و بچنە سەر میصر.

قەراڵ ریشار گەڕایەوە عەککاو کاغەزی بۆ سوڵتان نووسی. سەر لەنوێ داوای صولحی کرد. نیهایەت بە شەرتی ئەمە کە (ریافە)ش بەدەس ئەهلی صەلیبەوە بمێنێ صولح کرا (٢٢ شعبان ٥٨٨ﻫ، ٢ کانوون ئەووەڵ ١١٩٢م).

ئەمە، نەتیجەی سێیەم سەفەری ئەهلی صەلیب بوو. ئەم چەند صەدهازار فیدائی و جەنگاوەرە کە لە ئەوروپاوە وەکو لافاوێکی تەعەصوب رووی کردبوە قودسی

شەریف، پێنج ساڵ بەرامبەر بە عەزم و تەدبیرو جورئەت و بەجەرگی سوڵتان صەلاح ئەددین، هیچی پێ نەکراو نیهایەت دوو قەصەبەی قەراغ بەحری دەس کەوت و بەشی زۆری لەناوچوو، وە بەشێکی کەمیشی دەرباز بوو و ڕۆیەوە بۆ وڵاتی خۆی.

بێینەوە سەر ئیستیفادەی سوڵتان صەلاح ئەددین، وەکوو موحەڕیڕی (حیاه صلاح الدین الایوبی) ئەڵێ، غەزای فەلەستین، لە ئیعیباری شەڕە گەورەکەی (حطین)ەوە دەسی پێکردوو لە وتەئریخەدا بستێك لە خاکی فەلەستین بە دەس ئیسلامەوە نەبوو، بەلام لە دوای صوڵحی رملە ( ٢٢ شعبان ٥٨٨ﻫ) هەموو فەلەستین، بە غەیری پارەچەیەکی باریك لە (صور)ەوە تا (عەککا)، بوو بە موڵکی سوڵتان. فەرەنگ لەو هەموو وڵاتانە دەرکرا. بەیت ئەلمقدس سێنرایەوەو شان و شەرەفی ئیسلام، سەر لەنوێ بەرزکرایەوە.

قەهرەمانی کورد و ئیسلام، لەدوای صولح چووەوە قودس، ئەحواڵ و ئیدارەی داخلیەی ڕێکخست و بەعزێ مەکتەب و خەستەخانەی تیا دورست کردو لە پاشدا ویستی بچێ بۆ حەج، بەڵام ئومەرای ئیسلام لە ترسی غەدری فەرەنگ، بە نەفسی موبارەکی رجایان لێ کرد کە نەچێ و نیهایەت لەسەر ئیصراری ئەوان مۆقەتی وازی لەم فیکرە موبارەکە هێنا. لە پاش بەینێك لەگەڵ قوەتێکی بچووکی خاصەی، چوو بۆ وڵاتانی ساحلی و تەفتیشی قەڵاکانی و ئیستراحەتی خەڵکەکەی کرد ولە پاشدا بەسەر نابلس و بیسان و کوکبدا چووە بەیروت و لەوێ لەگەڵ ئەمیری إنطاکیە مولاقاتی کردو لە دواییدا لە ٢٦ی شەوال ٥٨٨ﻫ دا چووە دیمەشق.

## وەفاتی سوڵتان صەلاح ئەددین:

سوڵتان صەلاح ئەددین، بەینێك لە شام دا لەگەڵ ڕێکخستنی ئیشوکاری وڵاتەکەی و دابەشکردنی صەدەقە بەسەر سواڵکەرو داماوا و ناردنەوەی غازیان بۆ جێگەی خۆیان، خەریك بوو. وە هەموو ڕۆژێکیش چەند ساعەتێك بە ڕاو ڕای ئەبوارد.

ڕۆژی ١٤ صەفەر ٥٢٩ھ، چوو بە پیر حەجاجەوە. وە ئەم ئیستیقبالە زۆر قەلاباڵغ و ڕۆحانی بوو، تەئسیری تێ کردو لە نەچوونی بۆ حەج، زۆر عاجز بوو، وە گریا. وەھەر ئەو شەوە لەرزی لێ هات و ڕۆژ بە ڕۆژ، نەخۆشیەکەی گرانتر بوو.

نیهایەت ڕۆژی چوار شەمموی ٢٧ صەفەر ٥٨٩ھ، (٤ مارت ١١٩٣م) ئەمری خوای بەجێ هێنا، عومری ٥٧ساڵ بوو. عالەم بۆی گریا و ڕۆژی وەفاتی، کەس لەماڵ خۆی نەچوە دەرەوە. بازاڕو دوکان نەبوو. ڕێگەو کۆڵان خاڵی بوو. مەیتی موبارەکی، بەبێ تەکلیف و هەرا، کفن و دفن کرا. لەدوای سێ ساڵ مەلیك ئەفزەلی کوڕی لە نزیك مزگەوتی ئەمەویە ماڵی پیاوێکی صالحی کڕی و بە قایای جەسەدی موبارەکی، ڕۆژی عاشوور، بە حورمەت و عیزەتێکی زۆر، نەقلْ کرایە ئەوێ و سەر لەنوێ دفن کراو مەلیك ئەفزەل سێ ڕۆژ تەعزیەی بۆ گرت.

ڕۆژی دووەمی وەفاتی، عالەم کۆبووەوەو دەنگی گریان و شیوەن ئەگەیشتە ئاسمان. مەنعی لاوانەوەی بۆ کرا، تەنیا شاعیر (عماد) قەصیدەیەکی بە کووڵ و مەرثییەی بۆ نووسی.

دوقتۆر بیللی ئەڵێ: سوڵتان، وەفاتی کرد وبەم وەفاتە، ئوومەتی ئیسلام پادشایەکی زۆر بەهێزی وای لە کیس چوو کە لە بەلایەکی وای ڕزگار کرد کە ئەوەندەی نەمابوو تووشی فەوتانی بکا. سوڵتان صەلاح ئەددین وەفاتی کرد و دوژمنەکانیشی ئیقراریان بە گەورەیی کرد. وە ئیقراریان کرد کە ئوستادێکی گەورەو عالمێکی عظیم بوو، زۆر دەرسی ئازایی و شاسواریان لێ وەرگرت، نموونەی کەرەم، میثالی خەلقی باش و سەرچاوەی ڕەحم و شەفەقەت بوو.

لە حاڵی حەیاتیدا، حەڤدە کوڕ و کچێکی هەبوو (کتاب الفتح القسی فی الفتح القدس).

## ئەوصافی بلندی و ئەخلاق و تەبیاتی باشی:

لە خولاصەی تاریخی ئەم قەهەرمانی ئیسلامە، باش تێگەیشتین، کە لەو رۆژەوەی کەبوویە وەزیری خەلیفە عاضد تا وەفاتی، چەند سەعی کرد بۆ غەزاو چەند خزمەتی گەورەی بۆ عالەمی شەرق کرد، چۆن غەلەبەی بەسەر فەرەنگ و ئومەرا ئیسلامدا کردو چۆن توانی دوو مەملەکەتی وەکوو سوریەو میصر کە بە سەبەبی ئیختیلافاتی مەزهەبی و گەمعی شەخصیەوە، زۆر لەیك جویّ بوون، لە ژێر حوکمی خۆیدا دامەزریچنیّ ولە کوردستانەوە تا تونس و یەمەن و عەدەن، زۆر قەومی جویّ جوێی لە ژێر نفوزی خۆیدا کۆکاتەوەو باریەتیان لە بەینا بێنێتە وجود.

لە بەینی ئەم قەومانەدا کەس نەبوو کە بەدلّ سولّتانی خۆش نەویّ و ئیتاعەتی نەکاو لە وەقتی تەنگانەدا رۆحی خۆی بۆ فیدا نەکاو ئەمەش دەلیلی موحیبەتی و حورمەتی عمومی بوو. وە بۆیە خۆشیان ئەویست چونکە مەعین و نەصیریان بوو، بۆ دوژمنیان قەهار بوو، بۆ نەفسی خۆی و بۆ مالّی دنیا هەولّی نەئەدا، هەموو سەعی وتەقەلای بۆ مەصلّەحەتی ئیسلام بوو.

سولّتان صەلاح ئەددین تەنیا بە عەقلّی خۆی ئیشی نەئەکرد و دایمە لە راو فیکری روئەساو عاقلّان ئیستیفادەی ئەکرد. ئەم حالّەش بە گوێرەی حوکمی دینی ئیسلام وسوننەتی پێغەمبەر بوو. قەت حەزی لە ئیستیبدادو موستەبید نەئەکرد.

زۆر جار لەسەر فیکرو قەراری هەیئەتی ئیستیشارە، رای خۆی تەرك ئەکرد (وەکوو لە بەرامبەری صورو عەککادا دیمان).

لە صەنعەتی جەلبی قلوبدا، زۆر شارەزا بوو. هەموو کەس خۆشی ئەویست، لەبەر ئەمە وەفاتی بووە سەبەری شیوەن بۆ هەموو خزم و ئومەراو ئەتباع و رەعیەتی.

هەموو کەسێك زاتی موبارەکی سولّتانی بە باوکێکی دلّسۆز و بە رەحم، بە پادشایەکی عادل، بە حوکمدارێکی توند و کوشندە بۆ دوژمن، بە تەرەفداری راست و

بە دوژمن زاڵم و پەنای پیاوچاك بە غازێکی مەتین و خادیمێکی دین و توحیدی ئیسلام، ئەزانی.

لە خزمەتکردنی بۆ ئیسلام نە نە خۆشی و نەماڵ و منداڵی مانعی نەئەبوو.

لە وەقتێکدا کە مەلیك ظاهری کوڕی مەئمور کرد، ئەم نەسیحەتە باشەی دایە:

" تەوصیەی تەقوات ئەکەم، کە مەبدەئی هەموو خێرێکە، ئەوی خوا ئەمری پێ کردوە، منیش ئەمرت پێ ئەکەم، چونکە سەبەبی رزگاریتە، خۆت بپارێزە لە خوێن ڕشتن، چونکە خوێن نانوێ، دڵی رەعیەت ڕاگرەو تەماشای ئەحواڵی بکە، چونکە تۆ ئەمینی من و ئەمینی خوای بەسەریانەوە. دڵی ئومەراو ئەرکانی حکوومەت ڕاگرە، چونکە مۆفەقیەتی من، لە سایەی مودارای خەڵکەوەیە، حەسوودی بە کەس مەبە، چونکە ئەجەل مۆڵەتی کەس نادا. لە موعامەلە لەگەڵ خەڵکا زۆر دیقەت بکە، چونکە ئەگەر ئەوانت لێ ڕەزا نەبێ خوا عەفووت ناکا، بەڵام ئەوەی لە بەینی تۆو خواتا واقیع بێ، بە تۆبەکردنێ لێت ئەبووری، چونکە گەورەو لێبووردە."

سوڵتان صەلاح ئەددین بەرامبەر بە ڕەعیەتی قەت کیبرو داعیەی سوڵتانی نەبوو، هەموو کەس بەبێ زەحمەت ئەیتوانی بچێتە لای نە قاپیەوان نە وەزیر، مەنعی نەئەکرد.

صاحێب شکات بەبێ ترس و خۆف، ئەچووە لای و شکاتی ئەکرد. لە هەموو لایەکەوە شکاتکەر ئەهاتە لایو قەت صەغڵەت نەئەبوو. خەڵك بۆیە ئەچوونە لای، چونکە شارەزای ڕەحمی و حەق سەندنی بوون. لای سوڵتان گەورەو بچووك لە مەقامی حەقدا یەك بوو. دڵێکی نازکی بوو وە زۆر موتەئەسیر ئەبوو کە دەنگی فەقیرو هەژاری ئەبیست، مەرحەمەتی ئەهاتە جۆش و چاوی پڕ ئەبوو لە فرمێسك و خەڵات و پارەی ئەدانێ.

ئینسانیەت و خێری زۆری، لەلا خۆش بوو. قەت نەی ئەهێشت لە خادەم و کۆڵە بدرێ، وەلحاڵ لەو زەمانەدا حاڵی ئەم نەوعانە، زۆر خراپ بوو. کە چاوی بە هەتیوێ

بکەوتایە، مەرحەمەتی ئەهاتە جۆش و ئەگەر کەسی نەبوایە جێگەی بۆ ئەدۆزیەوە، وە ئەگەر کەسێکی ببوایە پارەو مانگانەی ئەدایە تا تەربیەی بکەن.

ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە جل و بەرگا لە خصوص خوارد مەسکەندا، نموونەیەکی قەناعەت و فضیلەت بوو. دەفعەیەك خانوویکی باشی بۆ خۆی دروستکرد، کە تەواو بوو، هاتە سەیری و قەدەرێ تەماشی کرد و گوتی: "لەم خانوەدا تا نیهایەت نامێنێنو ئەم خانوە لایەقی کەسێك نییە کە ئەجەلی لە شوێنی بگەڕێ و ئێمە لە دنیادا وەظیفەمان تەنیا خزمەتی خوایە".

مالّو مولکی زۆر، قەت مەغروری نەئەکرد و ئەی گوت: مالّ و خۆلّ لام یەکە.

لەبەر ئەوە هەرکەس داوای لێ بکردایە، بە مەئیوسی نەیئەگێڕایەوەو دائیمە لە تەلّەب زیاتری ئەدا. لەبەر زۆری کەرەم و دەس بلاّوی، مەعییەتی زۆر جار مەوجودی پارەی خەزێنەیان لێ ئەشاردەوە، تا بە سەبەبی کەرەمی زۆری بۆ وەقتی تەنگانە بێ پارە نەمێنێتەوە. میسالێکە زۆر گەورە کەرەم و دەس بلاّوی ئەمە بوو کەلە وەقتی وەفاتیدا نە پارەو نە مولك و نەخانووی لە پاش بەجێما.

ئەمیر محەمەد عەلی لە (رحله الشامیه)دا ئەلّێ: " مەرحوم لە غایەت بەدەر کەریم و سەخی بوو، وە ئەلّێن لە دوای وەفاتی تەنیا چل و حەوت درهەمی لە پاش بەجێما کە میراتی سوالّکەرێکیش مومکینە لەمە گەلێ زۆرتر بێ".

لە سالّی ١٣١٦هـ (١٨٩٨م)دا کە ئیمپراتۆری ئالّمانیا، شامی زیارەت کرد، نوطقێکی داو گوتی:

" زۆرم پێ خۆشە کە لە شارێکدام کە لە وەقتی خۆیدا زاتێکی وای تیا ژیاوە، کە هەرە گەورەی پیاوی عەصری خۆی بوو، وە لە شەجاعەت و ئازاییدا بێ ئەمسال بوو، شۆرەت و شەهامەتی بەدنیادا بلاّو بووبووەو ئەو زاتەش قەهرەمان صەلاح ئەددین ئەیوبیە".

لە دوای ئەمە بۆ تەعظیم و تەزکار، ئکلیلێکی لەسەر مەرقەدی موبارەکی دانا.

موحەرریری (حياة صلاح الدين الايوبي) ئەڵێ، لە شەڕێکی ئەهلی صەلیبدا بەبێ ئەمەی کە لە تیرەبارانی لەشکری صەلیبە پەروا بکا، هەڵی کوتایە پێشەوەو بانگی کردن: لە جێگەی خۆتان بوێستن، دڵی ئەم شێرە لە دڵی شێری ئێوە بەقوەت ترە.

لە وەقتێکدا کە هیلاکی بە دەوامی غەزا، بێتاقەتی کردبوو، وەلەبەر شیددەتی نەخۆشی لەسەر ولاخەکەی زۆر ناراحەت بووبوو، پێیان گوت دابەزەو تۆزێ بحەسێرەوە، بەڵام لێی قبووڵ نەکردن و گوتی: من کە لەو ولاغە دابەزیم ئەوسایە بە نەخۆشیەکەم ئەزانم.

خولاصە ئەم سوڵتانە بێ ئەمساله بە سایەی ئەخلاق و ئەصافی بڵندیەوە ببوو بە نموونەی ئەرەفی ئیسلام و تیمثالی گەورەیەتی شەرق. مەجلیس پڕ بوو لە عولەماو عوقەلا، بە قاپی پڕبوو لە فەقیرو هەژار و موحتاجین، وە لەگەڵ ئەم هەموو گەورەییەشدا، بە دەرەجەیەکی وا متواضع بوو کە گووتوویانە: " تواضع و تەقوای بەڕاستی محیر ئەلعقول بوو".

زۆر جار لە شەڕدا بۆ غەلەبە سەندن و رزگاری مەملەکەت، خۆی تووشی تەهلەکە ئەکرد. وەلحاڵ لەناو ئەمسالیدا نادر هەیە کە ئەوەندە جەلادەت و فیداکاری نواندبێ. بێجگە لەمەش بۆ رێکخستنی ئیشوکاری مەملەکەت، زۆر خەریك ئەبوو، وە لەسایەی ئەمەوەیە کە مەملەکەتی ئەیوبی لە زەمانیداو لە هەموو شتێکدا تەرەقیی کرد... بەسەر رەعیەتەوە وەکو باوکێکی دڵسۆز وابوو، دائیمە بۆ خێرو سەعادەیتان نەصیحەتی ئەکردن.

لەم خصوصاتەوە، شاهیدی هەرە بەقوەتی دوژمنەکانیەتی، واقیعەن (استانلی)ئەڵێ:

"عالەم لە ئەوصاف و ئەخلاقی ئەم سوڵتانە، ئەوەندە تێ نەگەیشتبوو، وەلحاڵ هیچ شوبهە نییە کە نەفسێکی شەریف و بڵندو قەهرەمانێکی ئازا بوو، زۆر حەساس و بە رەحم بوو، دڵێکی صاف و پاکی بۆ حەیاتی زاهیدانەی بوو. بۆ دینی زۆر بە غیرەت

بوو، وەبەم ئەوصـافەیەوە بـە راسـتی لایـەق بـوو کەببێتـە نموونەیـەکی قـەهرەمانی و مەردایەتی بۆ ئیسلام".

کتێبی تاریخی موئەریخین یش ئەڵێ:

"لە خصوصی صەلاح ئەددینـەوە ئـەوەی کـە مەسیحیەکانی تووشـی دەهـشەت و حیرەت کردبوو، مروەت و علو جەنابی، سەخا و کەرەمی، رەحم و حیلمـی، لێبـوردن و عەفووکردنی و با خصوص ریعایەتی عەهدو پەیمانی بوو، وە بە راسـتی زۆر مـەوجیبی حیرەتە، کە ئـەم هـەموو ئەوصـافە بڵنـدە، کـە دڵـی ئەوروپاییـەکانی پـڕ لـە تەقـدیرو تەبجیل کردبوو، هەموو ئەمانە وەصفی زاتێکی وایە کە غەلەبەی بەسەریانا کردوەو لـە ئاسیای دەرپەڕاندوون".

حورمەتی مەعییەتی خۆی ئەگرت و لەگەڵیان زۆر باش بـوو، وە ئەگـەر قەباحـەتێك لە یەکێکیان بقەومایە، قەت نەیئەدایە رووی. قـسەی کـەم ئـەکرد و مەعییەتیـشی بـەم تەرحە فێر کردبوو. مەجلیسی زۆر پاك بوو، کەس نەیئەوێرا لە عەلەیهی دراوسێ وە یـا کەسـێك غەیبـەتی لـەلا بکـا. مـاڵو منـداڵی خـۆی خـۆش ئەویـست، زۆر جـار لەگـەڵ منداڵەکانیا یاری ئەکرد. زۆر دینـدار بـوو وە منداڵەکانیـشی بـەو تەرحـە پێکەیانـدبوو. عەدالـەتی زۆر لـە لا خۆشەویـست بـوو، هەرکـەس خیلافـی حەرەکـەتی بکردایـە، بـە شیددەت جەزای ئەکرد. حەفتەی دوو دەفعـە بـە نەفـسی خـۆی، بـۆ بیـستنی شـکاتی مظلومین دائەنیشت. دەرگای بۆ گەورەو بچوك بۆ فـەقیرو دەوڵەمـەن کرابـوەوە. ئـەم عادەتەی لە وەقتی سەفەریشدا نەئەگۆڕی.

( ئیستیفان سن ) ئەڵێ:

" صـەلاح ئـەددین لـە ئیجرائاتیـدا موەفـەق، لـە ئیـشیدا شـارەزا، لـە تەقـدیرو لێکدانەوەی قوەتی دوژمندا وریا بوو. کە قەراری بۆ کردنی ئیـشێك بدایـە، لـە کردنیـدا هـیچ تـەرەدودی نەئـەکرد. لـە ئیـشدا قـەت هیلاکـی و بێـزاری نەئـەزانی، بەرامبـەر زەحمەتو هیلاکی زۆر صەبور بوو. ئەمنیەتێکی خاروقلعادەی بـە نەفـسی خـۆی بـوو.

ئەو هەوو ئەوصاف و مەزایا بڵندەی تیا ظاهر بوو. نەفەری لە ئیشدا زۆر صادق و حوکمیشی دەرحەق زۆر عادل بوو".

سوڵتان صەلاح ئەددین لە جەلدی دووەمی تەرجەمەی (مصور تاریخ اسلام) دا لە تەڕەف سەیید ئەمیر عەلی یەوە بەم تەرحە وەصف کراوە:

" صەلاح ئەددین جهانك اك بوبوك و اك قهرمان حكمدار درندن برى ايدى"

ئەحمەد زەکی پاشا لە مجەلەدی (رمسیس)دا بە موناسەبەتی کاسەکەی صەلاح ئەددین ئەڵێ:

" قەومی قبطی، ئەم پادشا گەورەیەیان زۆر خۆش ئەویست، چونکە حیمایەو ریعایەتی کردن. لە دەوری سوڵتەنەتیدا سەعادەت و رەفاه یان چاو پێ کەوت، دەلیلی هەرە گەورەی ئەم موحەبەتەش ئەمەیە کە رەسمی سوڵتان سەلاح ئەددین یان لە تەنیشت کاسەی موقەدەسەوە داناوە".

لە وەصیەت نامەکەیدا فەرموویەتی: "بۆ ئەمەی کە رۆژی حەشر شاهیدی غەزام بێ، شیرەکەشم لەگەڵ بنێژن" (هامەر ، جلد٤، ل٢٠٧، و ٢٠٩).

ئاثاری عومران و مەدەنیەتی:

ئاثاری عظمەتی سوڵتان صەلاح ئەددین، تەنیا عیبارەت بە غەزاو تەوحیدی ئیسلام‌و حوسنی ئیدارەو دەهای حەربی و سیاسەتی نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا زۆر بە بینای باش باش، وڵاتەکەی رازاندۆتەوە. لە ٥٦٦هـ دا، لە نزیك (موطەوتی قەدیم) مەدرەسەی ناصرەیەی بۆ تەدریساتی مەزهەبی شافیعی دروس کردو ئەمەش ئەووەڵ مەدرەسەیەکە کە لە میصردا دروست کراوە. لە دوای ئەمە (مدرسە القمحیە)ی لە نزیك ئەوەوە بینا کرد بۆ مەزهەبی مالکی. لە ٥٧٢ شدا (مدرسە الحنیفە)ی لە ماڵی (وزیر البطائحي)دا کردەوە کە ئێستاکە (السیوفیە)ێ پێ ئەڵێن. لەگەڵ کردنەوەی ئەم مەدرەسانەدا وەڤیفەی بۆ مامۆستا و قوتابیەکانیش تەعین کردو بەم تەرحە توانی لە جێگەی مەزهەبی شیعە، مەزهەبی سوننی بڵاوکاتەوە.

صاحێبی کتێبی (صبح الاعشی) ئەڵێ:

" خانەقاو تەکیە، لە پێش حکوومەتی ئەیوبیەدا لە میصر دا نەبوو، وە ئەووەڵ موئەسیسی ئەمانە سوڵتان صەلاح ئەددینەو لە دروستکردنی خانەقای (صلاحیە)وە کە بە (سعید السعداء) مەشهوورە، دەسی پێ کرد و بەعزێ ئەوقافیشی بۆ دانا".

ئەساسی قوەتی بەحریە لە میصر دا، لە تەرەف سوڵتان صەلاح ئەددینەوە دانراو بە عینوانی (دیوان الاسطول) دائیرەیەکی مەخصوص لە ژێر نظارەی مەلیك عادلی برایدا بۆ دامەزراند. ئەسکەندەرییەو دمیاط لە قەراغ بەحری سپی، وە فسطاط و قوص لەسەر نیل، بەندەری بەحریی موهیم بوون.

چونکە دی کە ئەسکەندەریە دایمە تووشی تعرضی فەرەنگ ئەبێ شورەو قەڵای زۆر باش تەعمیر کردەوە، وە لەوێ و لە میصر دا دوو خەستەخانەشی دروست کرد. قەصی (عەزیز بن ئەلمغر)ی فاطیمیشی کرد بە خەستەخانەو لەناو ئەو قەصرەدا غەریا خانەیەکیشی تەئسیس کرد.

بۆ ئیصلاحی زراعەت و تەسهیلاتی زوراع، بەعزێ پردو جۆگەشی دروست کرد. بەغەیری ئەمانە شوورەیەکی مەحکەمیشی بە دەوری پایتەختی میصردا کە عیبارەت بوو لە فسطاط و عسکرو قطائع و قاهرەی مضریەدا، کێشاو قەڵایەکی مەحکەمیشی لە جێگەیەکی بەرزیدا کە بتوانێ مودافەعەی ئەو چوار گەڕەکە بکا، دروست کرد.

لە ناو ئەو قەڵایەشدا خانوویەکی بۆ خۆی و سەرای حکوومەتی تیا بینا کرد. ئێستاکەش بەسەر دیواری ئەم قەڵایەوە رەسمی هەڵۆیەك هەیە کە عەلامەتی بایەخی نەفسی سوڵتان صەلاح ئەددین بوو ( هەڵۆیەکی سوور لەسەر خامێکی زەرد).

رەسمی کەمەرکێشی بە تەواوی لەغو کردەوەو بەم تەرحە ئیشوکاری زوراع و توجاری زۆر سەهل کرد. واقیعەن لە دەوری حکوومەتی فاطیمیدا ئەهلی میصر لە ژێر باری گرانی ئەم رەسمەدا بە تەواوی پشتی کۆمابووەوەو لە رووی ئەمەوە، زۆری ظوڵم لێ ئەکرا.

بێجگە لەمەش، ساڵی دوو هەزار دیناری لەگەڵ هەزار ئەردەب گەنمی بە ئەمیری مەککە ئەداو رەسمی لەسەر حەجاج هەڵگرت. دووقتۆر (ئەحمەد بیللی) لە نیهایەتی بەحسی ئەم سوڵتانە گەورەیەدا ئەڵێ:

" ئەمەی کەباسمان کرد، جزئێکە لە ئەوصافی ئەم سوڵتانە گەورەیەو ئەم سەردارە بە شەوکەتەو ئەم فاتیحە مظفرة، من لەو فیکرەدام کە ئەگەر ئەمسالی صەلاح ئەددین لەناو ملوکی ئیسلامدا زۆر هەڵبکەوتایە، ئەحواڵی ئیسلام بەم نەوعە لە خاریج و داخل دا بێ خێرو پەشۆکاو نەئەبوو".

سەیید ئەمیر عەلی ئەڵێ: (الفضل قاضي) کە وەزیری بوو لە ئومووری خەیریەدا زۆرێ یارییەی ئەدا، شورا حکوومەتی صەلاح ئەددین، تەنیا قەرەقوش، حسام ئەددینو مەشطوب و ئەمثالی نەبوو، وەکو قاضی و کاتب عمادئەددین و عیسا الحکاریو بەعزێ عولەمای بەشۆرەتیشی تیابوو.[١١]

## کوڕانی سوڵتان صەلاح ئەددین:

سوڵتان صەلاح ئەددین لە حاڵی حەیاتیدا حکومەتی فەلەستین و سوریەی بە مەلیك ئەفەضل عەلی (ئەبو ئەلحەسەن نورئەددین)، و میصری بە مەلیك عەزیز عوسمان (ئەبو ئەلفەتح عمادئەددین)و حەلەبیشی بە مەلیك ظاهری غازی (غیاث ئەددین)دابوو.

مەلیك عادلی براشی بەشێکی جەزیرەی بە دەسەوە بوو. کوڕانی شێرکۆهی مامیشی لە حمص دا جێگیر بوون و یەمەنیش بە دەسی کوڕانی سەیف ئەلئیسلام (طفکتین)ی برایەوە بوو. لە وەقتی وەفاتیدا سوڵتان کەسی نەکردبوو بە واریث و خەڵەف، لەبەر ئەوە کوڕەکانی هەرکەسە لە جێگەی خۆی ئیدارەی حکوومەتیان کرد و تەقریبەن نزیکی ساڵێك تابیعیەتی عالییەی مەلیك ئەفەضل یان محافظة کرد.

## مەلیك ئەفزەڵ، مەلیك عەزیز، مەلیك عادل:

مەلیك ئەفزەڵ، کوڕە گەورەی سوڵتان صەلاح ئەددین بوو، وە لەدوای باوکی مەتبوعی باقی حکوومەتانی ئەیوبی بوو، ضیاءالدین ئیبن ئەپیر (برای موئەریخی مەشهوور ئیبن أثیر) وەزیر و مودیری ئوموری بوو. ئەو وەزیرە، لە ئیدارەو سیاسەتدا زۆر ضعیف بوو. لەبەر ئەوە ئینتیڤامی ئیدارە زۆر تێکچوو، وە لە رووی ئەم وەزیرە بێ ئیدارەو تەدبیەوە، ئومەرای مەشهوورو ئێشکداری زەمانی سوڵتان صەلاح ئەددین زۆر لەبەرچاوی مەلیك ئەفزەڵ کەوتن و عەزل کران. لەبەرئەمە، هەموویان عاجزبوون و یەك لە دوای یەك سوریەیان بەجێ هێشت و چوونە میصر لای مەلیك عەزیز. وە زاتەن زۆری پێ نەچوو، مەلیك عەزیز سەربەخۆیی میصری ئیعلان کرد و لە ٥٩٠ هـ دا، بۆ زەوت کردنی موڵکی براکەی، بە لەشکرەوە رووی کردە سوریە.

ئیختیلافی بەینی ئەم دوو باریە بەناو بژی مەلیك عادل و بەعزێ ئومەرای ئەیوبی، هەرچۆنێ بوو، ئەمجارە تەسکین کرا. بەڵام ساڵی دوایی، مەلیك عەزیز دیسانەوە هاتە سەر شام و ئەمجارە مەلیك عادل یارمەتی مەلیك ئەفزەڵی داو بە سیاسەت و تەشویقاتی خۆی، لەشکری میصری لە مەلیك عەزیز وەرگێڕاو ئەم شازادەیەش بە نەتیجە، مەجبوور بوو گەڕایەوە میصر.

مەلیك عادل، لە ئووەڵدا بە ظاهر، تەرەفداری رێك کەوتنی برازاکانی بوو، بەڵام لە دواییدا کە تەماشای بێ ئیدارەیی و بێ تەجرەبەیی کردن وزانی کە رەنجی سوڵتان صەلاح ئەددین لە رووی کوڕەکانیەوە، مومکینە بە باد بچێ، وە مەملەکەتی ئەیوبی تووشی نشوستی و بێ هێزی ببێ، ویستی ئیدارەی مەملەکەت بگرێتە ژێر دەسی خۆیو زاتەن نارێکی برازاکانیشی بۆ ئەم مەقصەدە خدمەتی بوو.

بەم فیکرە لای مەلیك ئەفزەڵی گرت و مەلیك عەزیزی بە نائومێدی گێڕایەوە میصرو لەپاشدا دیسانەوە ئاشتی کردنەوەو مەلیك ئەفزەڵ گەڕایەوە شام و خۆشی لە میصردا بۆ رێکخستنی ئیشوکاری میصر، بەناوی مەلیك عەزیزەوە مایەوە. لە حەقیقەتدا

ئەیویست بناغەی حاکمی خۆی لە مەملەکەتی فیرعەونەکانا دابنێ. لەدوای بەینێك، بە بەعزێ بەهانە، لەگەڵ مەلیك عەزیزدا لەشکریان کردە سەر مەلیك ئەفزەڵ لە دوای شەڕو دەعوا لە ٥٩٢ هـ دا شام زەوت کراو مەلیك ئەفزەڵی بەدبەخت، لە باتی دیمەشق، بە ناعیلاجی بە قەڵای (سارخد) رازی بوو، سوریە بەناوی تابیعی ظاهیری میصر، کەوتە دەس مەلیك عادل.

واقیعەن ئەم موعامەلەیە لە خصوص ئەخلاق و خزمایەتیەوە، زۆر ناشیرین بوو، بەلام سەلامەتی مەملەکەتی ئەیوبی وای ئیجاب ئەکرد و لازم بوو بەرامبەر بە تەعەرەچاتی یەك لە دوای یەکی ئەهلی صەلیب و رێکخستنی ئیشوکاری مەملەکەتی ئەیوبی، حوکمدارێکی بە شەوکەت و سەردارێکی بە نفوز و تەجرەبە، بێتە سەر ئیش. لەبەر ئەمە هەر تەماشای مەصڵەحەتی عمومی بکرێ، هیچ عیتابێکی تاریخی روناکاتە فاتیحی کەرگ.

مەلیك عادل لە دوای ساخ کردنەوەی سوریە بۆ خۆی و رێکخستنی کاروباری، تەفتیشێکی ئەحواڵی جەزیرەی کرد و ئیدارەی ئەویشی دامەزراند. وە لەدوای وەفاتی کتوپڕی مەلیك عەزیز (٢٧ محرم ٥٩٥)، بە ناعیلاجی گەڕایەوە سوریە، چونکە مەلیك ئەلمەنصور محموودی کوڕی مەلیك عەزیز هێشتا منداڵ بوو. مەلکی ئەفزەڵی مامی بانگ کرابووە میصرو کرابوو بە نائیبی مەلیك مەنصور.

مەلیك ئەفزەڵ ویستی لەم وەظیفە تازەیە ئیتیفادە بکاو حەقی خۆی لە مەلیك عادلی مامی مسێنێ، لەگەڵ مەلیك ظاهری برای کە حاکمی حەلەب بوو، موخابەرەی کرد و وەعدی یارمەتی لەویش سەندو هاتە سەر ئەوەی کە لەشکر بکاتە سەر سوریە.

مەلیك عادل، لەم کەین وبەینە خەبەردار بوو، وە بە نفوزو سیاسەت زوو بەنی مەلیك ئەفزەڵ و ئومەرای مەعیەتی تێکداو بە لەشکرێکەوە رووی تێکردو تەنگی پێ هەڵچنی، نیهایەت لە ربیع الثانی ٥٩٦هـ دا، مەجبوری تەسلیم بونی کرد و خۆی و

مـەلیك مەنـصوری لـە میـصر کـردە دەرەوەو مەملەکـەتی میصریـشی داگـیر کـرد و مەملەکەتی خۆی ئیعلان کرد.

مەلیك ئەفزەڵ ی بەدبەخت، بە مەئیوسی گەڕایەوە قەڵای (سرخد). لە دوای بەینێك مەلیك ظاهری برای، ویستی شامی بۆ بسێنێتەوەو حەتتا بە لەشـکری حەلەبـەوە هاتـە سەر ئەم شارەو موحاصەرەشی کرد، بەڵام ئەو وەقعەیەش سیاسەت و تەدبیری مەلیك عادل بە فریادا گەیشت و بـەینی دوو بـرای تێکداو مـەلیك ظـاهـر وازی لـە موحاصـەرە هێناو گەڕایەوە حەلەب. مەلیك ئەفزەڵیش گەڕایەوە سرخد.

لە دوای بەنێك مەلیك عـادل، قلعـەت ئەلنـەجم و سـروج صمصادیـشی دا بـە مـەلیك ئـەفزەڵ، بـەڵام ئـەم ئیحـسانە، ئەوەنـدەی دەوامـی نـەکردو لـە ٥٩٩ دا لـە دەسـی سەندەوە.

دایکی مەلیك ئەفزەڵ گەلێ تکای لە مەلیك عادل کرد، بەلام فائیدەی نـەبوو. مـەلیك ئەفزەڵ کە وایزانی، قەڵای صمصادی تەعمیر کردەوەو خـۆی بـە تـابیعێکی سـەلجوقی رۆم ئیعلان کـردو مـودەتێکیش بـەو نەوعـە رایبـوارد. حـەتتا کـە مـەلیك ظـاهری بـرای وەفاتی کرد بە یارمەتی (کیکاوس)ی حوکمـداری سـەلجوقی، ویـستی حەلـەب بگـرێ و حکوومەتێك بۆ خۆی پێکـەوە بنـێ. بـەڵام ئـەم ئاخرتەقەڵایـەش، بـە سـەبەبی نـاڕێکی موتەفیقەکانی و موداخەلـەی مـەلیك ئەشـرەفی کـوڕی مـەلیك عادلـەوە سـەری نـەگرت (٦١٥هـ) وە شازادەی بەدبەختی بە مەئیوسی گەڕایەوە صمـصادو تـا ئـاخیری عـومری مەتروك و مەهجور لەوێدا ژیاو لە ٦٢٢ دا کتوپڕ وەفاتی کرد.

## سەڵتەنەتی مەلیك عادل:

سەیف ئەددین مەلیك عادل لە ١٦ی رەبیعوئەلئوخرە ٥٩٦هـ (٢ شوبات ١٢٠٠م)دا لـە قاهیرە حوکمدارییی خۆی ئیعلان کرد، وە وەکوو باسمان کرد بە صورەتێکی ماهیرانـە، مەملەکەتی سوڵتان صەلاح ئەددینی تەقریبەن بە تەواوی، (بێجگە لـە حەلـەب) هێنایـە

ژێر حوکمی خۆی. لە خصوصی ئیدارەوە، لەسەر شوێنی کاکی رۆیشت و ئیدارەی مەملەکەتی بەناوی خۆیەوە دایە دەس کوڕەکانی. مەلیك کاملی بەسەر میصرەوە، (مەلیك المعظم عیسا)ی بەسەر سوریەوەو (مەلیك ئەلئەشرەف موسا)ی بەسەر جەزیرەوە دانا. بەعزێ لە کوڕەکانی تریشی کرد بە حاکمی جێگایانی تر و تابیعی براکانی بوون.

لە دەوری حکومەتی مەلیك عادل دا، تضیقاتی ئەهلی صەلیب ئەوەندە نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئومەرای فەرەنگ، بە ئاینێکی مەخصوص، ئەو عەهدو پەیمانەی کە لەگەڵ سوڵتان صەلاح ئەدینیان کردبوو، شکاند. وە ئۆردوویەکی گەورەی ئەهلی صەلیب لە عبرەوە هاتە سەر بەیروت و گرتی. ئەم تەعەڕوزە تەصادوفی وەقتی شەڕو هەرای بەینی کوڕانی سوڵتان صەلاح ئەددینی کردبوو.

مەلیك عادل لەدای هاتنە سەرتەختی، بە لەشکرێکەوە چوو (یافە)ی داگیر کرد. ئەهلی صەلیبیش (تیبنین)یان موحاصەرە کرد، بەڵام بۆیان نەگیراو داوای صوڵحیان کردو موتارەکەیەکی سێ ساڵی لە بەینەداکراو فەرتەنەی ئەهلی صەلیبی چوارەم بەم تەرحە بڕایەوە.

لە ٦١٣ دا مەلیك ظاهر غازی، حاکمی حەڵەب، وەفاتی کردو تەشەبوسی مەلیك ئەفزەڵ بۆ گرتنی ئەم شارە، لەگەڵ (کیکاوس)ی سەلجوقی رۆمدا سەری نەگرت و حەڵەبیش کەوتە دەس مەلیك ئەشرەفی کوڕی مەلیك عادل، وە ئیدارەی کوڕانی قەهرەمانی هەرە گەورەی ئیسلام، بەم تەرحە دوای هات.

لە بێ طالیعی مەلیك عادل بوو کە ئاگری ئەهلی صەلیبی ئەمجارە، نەگەیشتە مەملەکەتی ئیسلام و تەنیا ئستامولی سوتاند و وێرانکرد.

پاپا (ئینوسانی سێیەم)، لە ١٢١٦ — ١٢١٧ م دا، فەرتەنەی ئەهلی صەلیبی پێنجەمی ئیجاد کرد. قەڕاڵی (مەجاڕ)، وە دوقەکانی ئاوستریاو باویرا، لەگەڵ ئومەرای ئاڵمانیا جنوبی، هەموو داخڵی ئەم قافڵەی پێنجەمە بوون. وە ئۆردوویەکی ٢٥٠,٠٠٠

کەسی (زۆری ئاڵمان بوو)، رووی کردە ساحیلی سوریەو لە بەحر هاتنە دەرەوەو تەرەفی عەککایان تالآن و وێران کرد وحەتتا لەگەڵ گەورەکانی سوریەشدا کەوتنە شەڕەوە. لە دواییدا قەراریان دا کە بچنە سەر میصر. واقیعەن گەڕانەوە قەراغ بەحرو سواری گەمیەکانیان بوون و،روویان کردمە مەنصەبی نیل و لەوێ هاتنە دەرەوەو دەوری دمیاطیان دا.

مەلیك عادل لەو بەینەدا، لە شیمالی سوریە بوو، کە خەبەری دمیاطی بیست، بە تالووکە بوو بۆ کۆکردنەوەی لەشکر و موقابەلەی ئەهلی صەلیب. رووی کردە شام، بەلآم ئەجەل مۆڵەتی نەداو لە نزیك شام لە (علاکین)دا وەفاتی کرد (جەمادی ئەلئاخر ٦١٥ه، ٣١ ئۆغسطوس ١٢١٨م).

## ئەوصاف و میزاتی:

موئەلیفی "مصور تاریخی اسلام"، سەیید ئەمیر محەمەد عەلی ئەلێ، سەیف ئەددین مەلیك عادل، ئەهلی مەعریفەت و تەدبیر، زۆر دوورئەندێش، لە حەرەکاتیا فضیلەت پەروەرو لە تەشەبوساتیا بە ثبات و لە ئەعمالیدا مەیالی چاکە بوو.

وەکوو کاکی زۆر عیلم و مەعاریفی خۆش ئەویست.

بە ئازایی و بەجەرگی لە شەڕدا، بە عەقڵ و کەماڵی لە ئیدارەو سیاسەتدا، لە زەمانی کاکیا دەسەڕاستی بوو، چ لە زەمانی کاکیاو چ لەدەوری حکوومەتی خۆیدا غەزایەکی زۆری لەگەڵ ئەهلی صەلیب کردوە.

لەگەڵ قەڕاڵی ئینگلیز (ریشاری شێردڵ) دا زۆر دۆستایەتی بوو. وە ئەم قەڕاڵە لە موخابەبەو موکالەمەدا، (خۆشەویست وبرام)ی پێ ئەگوت، وە حەتتا بەناوی ئەم دۆستایەتیەوە، مەلیك کاملی کوڕی کردبوو بە (شوالیە — جەنگاوەر).

لە سکەدا عینوانی (ئەبو ئەلفدا)ی قبووڵ کردبوو. لە زەمانی خۆیدا شەوکەت و سەطوەتی حکوومەتی بە تەواوی محافەظە کرد.

## دەوری سەڵتەنەتی مەلیك كامل:

عینوانی (ناصرئەددین)و كونیەی (ئەبو ئەلمعالی محەمەد)ەو كوڕی مەلیك عادلە، لە رەبیعولئەوەلی ٥٧٦ هـ دا هاتۆتە دنیاوە. لە دوای وەفاتی باوكی بوو بە حوكمداری میصر و دەركردنی ئەهلی صەلیب لە دەوری دمیاط و خاكی میصر، كەوتە عۆدەی ئەو.

لەو بەینەدا ئەلمەلیك ئەلموعەظەم عیسا (شەرەف ئەددین) حوكمداری سوریە بوو، مەلیك ئەلئەشرەف موسا (مظفر ئەددین)یش ئیدارەی حەڵەبی گرتبوە دەس خۆی.

ئۆردووی ئەهلی صەلیب، مودەتێكی زۆر دمیاگی موحاصەرەو تەضیق كرد، چ موحاصرین و چ مەحصورین، لەبەر نەخۆشی و برسیەتی، ضایەعاتێكی زۆریانداو لەدوای ساڵ و نیوێك موحاصەرەو تضیق، ئینجا دمیاط كەوتە دەس ئەهلی صەلیب لە ئیبتیدای مودافەعەدا، ئەهالی و مودافیعینی ئەم شارە، ٧٠,٠٠٠ كەسێك بوو، بەلاّم لە وەقتی تەسلیمیدا، تەنیا سێ هەزارێكی مابووەو ئەمانەش لە تەرەف ئەهلی صەلیبی موتەعەصیب و خوێنخوارەوە، قەتڵ و عام كرا.

ئۆردووی صەلیب لە دوای گرتنی دمیاط رووی كردە قاهیرە. ئۆردووی مەلیك كامل، هەرچەندە لە تەرەف لەشكری براكانیەوە تەقوییە كرابوو، بەلاّم دیسانەوە بە نەظەر ئۆردووی دوشمنەوە زۆر كەم بوو، وە بەربەستی تعرضی پێ نەكرا، لەبەر ئەوە مەلیك كامل لەگەڵ قوماندانی ئۆردووی ئەهلی صەلیب كەوتە مەوخابەرەوەو بە شەرطی وازهێنان لە دمیاط، وەعدی رەتكردنەوەی فەلەستینی دانێ، بەلاّم ئەم تەكلیفی صوڵحە، لە تەرەف ئەهلی صەلیبەوە قبووڵ نەكرا.

سقوطی دمیاط وتەعەروضی ئەهلی صەلیب بۆ سەر قاهیرە، لە ئەورووپادا تەئسیرێكی زۆری بوو، ئەهلی صەلیب كەوتە طەمعی میصر، وە مەلیك كامليش بۆ نەجاتدانی میصر حازر بوو واز لە قودس بهێنێ. لەم حاڵەدا بەطاشەتی ئۆردووی ئەهلی صەلیب و طفیانی نیل، فەرحەتێكی باشی دا بە مەلیك كامل.

ئەمری دا هەموو سەدەکانیان شکاند و ئەرازی دەلتا غەرق کرا. خەتی رەجعەتی ئەهلی صەلیب بڕرا، لە بەحرەوە خواردەمەنیان نەئەگەیشتێ، وە تووشی برسیەتیەکی خراپ بوون. وە لەلایەکی تریشەوە، لەشکری ئیسلام بە کۆمەڵی بچوک بچوک، لێیان کەوتبوونە هجوم و تەعەروض و شڵەژاندبوویانن. لەسەر ئەم ئەحواڵە، ئەهلی صەلیب کەوتە تەڵەبی صوڵحەوە، بە شەرطی موساعەدەکردن بە گەرانەوەیان و موساعەدەی زیارەی حەجاجیان، صوڵحیان کرد و ڕۆیشتن.

لە دوای ئەمە کە هەرای ئەهلی صەلیبی شەشەم بڕایەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو لەناو کوڕانی مەلیك عادلدا شەڕی خۆماڵی دەسی پێ کرد. مەلیك ئەلموعەظەم عیسا، حاکمی سوریە، لەکاکی وەرگەڕاو چاوی بڕیە تەختی میصرو خەریك بوو صەغڵەت بوو. لەو وەقتەشدا ئیمپراتۆری ئاڵمانیا ( فرەدریقی دووەم) بە لەشکرێکی گەورەوە رووی کردبووە میصر. مەلیك کامل، ناعیلاج ماو کەوتە موخابەرە لەگەڵ ئیمپراتۆرو ویستی صوڵحێکی لەگەڵ بکا.

بە تەقدیری خوا، لەو بەینەدا مەلیك المعظمی حوکمداری سوریە, وەفاتی کرد (ذی ئەلقعدە ٦٢٣ ھ) و مەملەکەتەکەی بۆ مەلیك ناصر داودی کوڕی بە جێهێشت. مەلیك کامل لەم وەضعیەتە ئیستیفادەی کرد وبەلەشکرەوە رووی کردە شام، مەلیك ئەشرەفی برای لە ئەوەڵا ویستی یارمەتی مەلیك ناصر بدا، بەڵام لە دواییدا لەگەڵ مەلیك کامل رێکەوت و بەیەکەوە شامیان گرت و مەلیك کامل بەرامبەر بە بەعزێ وڵاتانی جەزیرە شامی دا بە مەلیك ئەشرەف ٦٢٦ھ، وە کەرگ و ئەلشواك و بەعزێ قەڵای تر، لە باتی شام، درا بە مەلیك ناصر داود ( ١٢ )

مەلیك کامل، لە دوای جێبەجێکردنی ئیشوکاری سوریە، رووی کردە جەزیرە (مەزۆپۆتامیا)، وە بۆ بەربەست کردنی لافاوی خوارەزمی و موغۆل، ئەم وڵاتەی تنظیم کرد و بەعزێ جێگەشی کە بەدەس ئەم و ئەوەوە بوو زەوت کرد و (حصن کرد)ی بە ناوی مەلیکی خاصەوەدا بە مەلیك نەجم ئەددین ئەیوبی کوڕە گەورەی و بەسەر

جەزیرەوە دانا، لە دوای بەینێ، موساعەدەی کرد کە نەجم ئەددین ئەیوب لەشکری بێ صاحێبی خوارەزمی بگرێتە ژێر دەسی خۆی تا بتوانێ بەربەستی لافاوی موغۆل ببێ.

لە ٦٢٩ هـ دا (١٢٢٩م)، ئیمپراتۆری ئالْمانیا فرەدریق، کە گەیشتە سوریە، موزاکەراتی صولْحەی بەینی ئیمپراتۆر و مەلیك كامل لەم رۆژانەدا دوایی هات.

بە گوێرەی ئەم موعاهەدەیە قودسی شەریف لەگەڵ ناصرەو أطرافی و لە عەککاوە تا یافە، پارچەیەکی ساحیلیش، بە موەقەتی کەوتە دەس فرەدریق و بەرامبەر بەمە تا مودەی دە ساڵ و شەش مانگ و دە رۆژ واز لە شەڕ هێنرا. وە لە لایەکی تریشەوە بەرامبەر بە هەموو دوژمنێك ئیمپراتۆر ئەبوایە یاریەی مەلیك کاملی بدایە. خولاصە ئەم موعاهەدەیە نە موسڵمان و نە گاووری مەمنون نەکرد، وە ئیمپراتۆریش زۆری پێ نەچوو فەلەستینی بەجێ هێشت و چووەوە بۆ ئالْمانی.

لە دوای ئەم صولْحە زۆری پێ نەچوو کە بەینی مەلیك كامل و مەلك ئەشرەفی برای، لەگەڵ سوڵتانی رۆم تێکچوو. وە سوڵتان کەیقوبادی سەلجوقی، لەشکری کردە سەر شیمالی جەزیرە (٦٣١هـ) و لەگەڵ لەشکری ئەیوبیدا کەوتە شەڕەوە. لە ئەوەلا، تالْعی شەر بۆ لەشکری سەلجوقی موساعید بوو، وە بەعزێ جیگەیان لە موڵکی ئەیوبی داگیر کرد، بەڵام پێیان محافظة نەکرا، وە نیهایەت ئەم دەعوایە بە وەفاتی سوڵتان کەیقوباد بڕایەوە، وە لەشکری سەلجوقی لە خاکی ئەیوبی دەرکرا (٦٣٣هـ).

رێکیی بەینی مەلیك كامل و مەلیك ئەشرەف، ئەوەندە دەوامی نەکرد و مەلیك ئەشرەف لە عەلەیهی کاکی، لەگەڵ باقی ئومەرای ئەیوبیدا ئیتیفاقی کرد. مەلیك كامل ئەمەی بیست و دەس پێشکەرکی کرد، بە لەشکری میصرەوە رووی کردە شام. بەلام لە پێش ئەوەدا کە لەگەڵ لەشکری مەلیك ئەشرەف و موتەفیقەکانی بکەوێتە شەرەوە، مەلیك ئەشرەفی برای لە شام ئەمری خوای بەجێ هێنا (٤ی محرم ٦٣٥) وە شاری شام بێ موحارەبە کەوتە دەس مەلیك کامل. بەلام بەرامبەر بە تەسلیم کردنی ئەم شارە (بەعلەبەك) و (بصرى)ی دا بە مەلیك صالح ئیسماعیلی برای.

مەلیك كامل لە دوای ئەم غەلەبەیە، بە چەند مانگێك لە دیمەشق وەفـاتی كـرد ( ٢١ رجب ٦٣٥هـ، ٨مارت ١٢٣٨م).

## ئەوصاف و مزیاتی:

مەلیك كامل، بێ شوبهە حوكمدارێكی زۆر بـاش و موقتـەدیر بـوو. ئەوصـافی بڵنـدی خـۆی، چ لـە مەیـدانی شـەڕداو چ لـە ئومـوری سیاسـیدا، زۆر چـاك نوانـدوە. وەفـاتی، مەبدەئی نوشوستی حكومەتی ئەیوبیە. لە تەڕەف (ریشاری شێردل) ەوە بە (شـوالیە) قبوولێ كرابوو. لە خصوص عێرافان و عومرانەوە، لەسەر شوێنی بـاوك و مـامی رۆیـش. بـەعزێ ئاسـاری باشـی هەیـە و لەگـەڵ رێكخستنی ئومـوری ئەسقاو ئـەروای، میـصر، لەگەڵ خەریك بوو. تەحكیماتی قەڵای قاهیرەش لە زەمانی ئەودا تەواو كرا.

واقیعـەن بـە سـەبەبی تەسـلیم كردنـی قودسـی شـەریف و بـەعزێ جێگـەی تـر بـە ئیمپراتۆری ئاڵمانیا، بە ظاهر لایەقی عیتابە. بـەڵام لـە پـێش ئەمـەدا كـە ئینـسان لـەم خصوصەوە حوكمێكی قطعی بدا، لازمە ملاحظەی وەزعیەتی سیاسـییەی ئـەو زەمانـە بكاو ئەحوالێ و حەسادەتی براكانیش بێنێتە بەرچاو.

## مەلیك عـادلی دووەم:

لەدوای وەفاتی مەلیك كامل، ئومەرای ئەیوبی، مەلیك عـادلی دووەمیـان، كـە كـوڕە بچووكی مەلیك كامل بوو، بـە سـوڵتان ئـیعلان كـرد. وەلحـاڵ ئـەم شـازادەیە، چ لەبـەر بچووكی و چ لەبەر بێكارەیی، قابلیەتی حوكمداریی نەبوو. وەلەم خصوصەوە حەق لـە تەڕەف مەلكی نەجم ئەددینی بار گەورەیەوە بوو، كە لە وبەینەدا حاكمی جەزیرە بوو. لەوەقتێكدا كە لەگەڵ موحاصەرەی (رەها) خەریك بوو، خەبەری وەفاتی باوكی زانی و وازی لە موحاصـەرە هێنـاو لـەوەدا بـوو كـە بـێ بـۆ سـوریە، بـەڵام لـە پڕێكـا تووشـی

عوصیانی خوارەزمییەکانی مەعیەتی بوو، وە ویستیان بیگرن، هەچۆنێ بوو نەجاتی خۆی دا و خۆی گەیاندە سنجار.

بەدرئەددین لۆلۆی حاکمی موصلێ، کە یەکێ لە دوژمنانی ئەمیر نەجمەدین بوو، لەم فرصەتەدا ویستی مەحووی بکاتەوەو لە سنجاردا موحاصەری کرد.

بەڵام قاضیة عاقڵەکەی شازادە، بە حوسنی تەدبیری، خوارزمیەکانی لەگەڵ ئاشت کردەوەو بە یارمەتی ئەو لەشکری بەدر ئەددین لۆلوئی زۆر خراپ شکاندو لەوێوە رووی کردە دیاربکر. وە سوڵتانی رۆمیشی لە دەوری ئەم قەڵایەدا شکاندو وڵاتانی جەزیرەی دیسانەوە هێنایە ژێر ئیطاعتی.

لە ساڵی ٦٣٦ هـ دا، حاکمی شام (مەلیك جواد یونس)، تەکلیفی گۆڕینەوەی سنجارو رەقەو عانەی لەگەڵ شام، لە ئەمیر نەجم ئەددین کرد. ئەمیر نەجیم ئەددین ئەم فرصەتەی لەدەس نەداو قبووڵی کرد. تورانشاهی کوڕی بەسەر جەزیرەوە بەجێهێشت. حەڕان و رەها و بەعزێ جێگەی تریشی، دا بە ئومەرای خوارەزمی. وە بە لەشکرێکەوە رووی کردە سوریە وَ شامی گرت.

مەلیك عادل و ئەمیر داوای ئامۆزای کە حاکمی کەرگ بوو، لە بەینی خۆیانا وایان قەرار دابوو کە بچینە سەر مەلیك نەجم ئەددین ئەیوب، لەو وەقتەدا بەعزێ ئومەرای بەناوبانگ لە موعامەلەی مەلیك عادل، عاجز بوویوون و هاتبوونە لای مەلیك نەجم ئەددین. حەتا ئەمیر داودیش بە شەرتی ئەمەی کە شامی بدرێتێ، ویستی لەگەڵ مەلیك نەجم ئەددین دا ئیتیفاق بکا، بەڵام ئەم تەکلیفەی قبووڵ نەکراو لە دوای ئەمە دیسان بایدایەوە سەر مەلیك عالد.

لە ساڵی ٦٣٧ هـ دا، مەلیك نەجم ئەددین بۆ زەوتکردنی میصر، خۆی حازر کردو بە پێنج هەزار کەسێکەوە لە شام هەڵساو چوو بۆ نابلس. نەجم ئەددین ویستی بزانێ، مەلیك ئیسماعیلی مامی بە راستی یارمەتی ئەدا یان نا، چونکە ئەم مامە زۆر تەفرەی

دابوو، وە بە قسە هیچی نەهێشتبووە، وەلحاڵ ئەم مامە لەگەڵی خیانەتی ئەکردو لە ژێرەوە لەگەڵ ئەهلی حمص قسەیان کردبوو بەیەك.

لە لایەکی تریشەوە ئومەرای لەشکری مەلیك نەجم ئەددینی، بە ئەنواعی وەعد و فێڵ تەفرەداو، لە پڕێکدا بڵاوەیان کرد و مەلیك نەجم ئەددینیان لە نابلس دا. بە تەنیا بەجیٚ هێشت. ئەمیر داوی حاکمی کەرگ، کە ئەمەی بیست، بە لەشکرەوە هاتە سەر نابلس و مەلیك نەجم ئەددینی ئەسیر کرد وناردیە کەرگ. هەرچەندە مەلیك عادل داوای کرد کە بۆی بنێریٚ، قبوولی نەکرد.

لەو بەینەدا موعاهەدەی بەینی مەلیك کامل و ئیمپراتۆر فرەدریق، وەعدەی تەواو ببوو. بەلام فەرەنگەکان نەیانئەویست بیدەنەوە. ئەمیر داود، بە خۆیا راپەرموو، وە بە لەشکرەوە چووە سەر قودس و لەدوای موحاصەرەیەکی بیست و یەك رۆژی، زەوتی کرد (جەمادی ئەلئەوەل ٦٣٧هـ). وە ئەو تەحکیمانەی کە لە شارەکە لە تەڕەف فەرەنگەوە کرابوو هەمووی تێکدا.

لە حوسنی طالعی مەلیك نەجم ئەددین، موزاکەرەی بەینی ئەمیر داود ئیسماعیل و مەلیك عادل، سەری نەگرت و بە تەوەسوطی ئەمیر حەمما، مەلیك نەجم ئەددین ئەیوبو ئەمیر داود، رێك کەوتن و هەردووکیان لە قودسدا موعاهەدەیەکیان لە بەینی خۆیانا کرد. بە گوێرەی ئەم موعاهەدەیە، میصر بۆ مەلیك نەجیم ئەددین و سوریەو وڵاتانی شەرقیش بۆ ئەمیر داود ئەبوو.

ئیتیفاقی بەینی ئەمیر داودو مەلیك نەجم ئەددین، مەلیك عادلی ترساندو دەس بەجیٚ ئەمری دا بە ملیك ئیسماعیلی مامی، کەبچێتە سەر ئەو دوو موتەفیقەو خۆشی بە فیکری چوونە سەر فەلەستین، بە لەشکری میصرەوە لە (بلباس)دا ئۆردووگای دامەزراند. بەشێکی لەشکری مەملوك، کە بەناوی مەلیك ئەشرەفی باری مەلیك کاملەوە، ئەشرەفیەیان پیٚ ئەگوتن، لە مەلیك عادل رازی نەبوون، لە ئۆردووگادا

چوونە سەری و گرتیان و لە سولْتانی خەلعیان کرد و ناردیان لە قەلآی قاهیرە حەپسیان کرد.[١٣]

لەدوای چەند رۆژێك مەلیکی میصریان تەکلیفی مەلیك نەجم ئەددین کرد.

## مەلیك ئەلصالح نەجم ئەددین ئەیوب:

کوڕە گەورەی مەلیك کاملە، لە ٦٢٣ھ دا لە میصر، هاتۆتە دنیاوە. لە ٦٢٥ دا باوکی کردی بە وەلی عەهدی خۆی. بەلآم بە تەئسیرو بوختانی دایکی مەلیك عادلی دووەم، لە دوای بەینێك لەبەرچاو کەوتوو لە میصر دوورخرابووە. وەکوو لە سەرەوە گوتمان، زۆر تووشی ئەزیەت و کوێرەوەری بوو، بەلآم نیهایەت بێ کارەیی مەلیك عادل ئەبوبەکر، بە فریادا گەیشت و لەدوای خەلع و حەپسی مەلکی نەجم ئەددین، بانگ کرایە میصرو لە وێ ئیعلانی سولْتانی کرا (٦٣٧ھ، ١٢٤٠م) زۆری پێ نەچوو سەلْتەنەتی مەلیك صالْح لە تەرەف خەلیفەی بەغداشەوە تەصدیق کرا.

مەملەکەتی میصر، بەم تەرحەو بێ شەڕو هەرا، بۆ مەلیك صالْح ساغ بووەوە.

ولآتانی شەرقیش بە واسکەی (تورانشاه) ی کوڕیەوە لەژێر ئیدارەیەکی باش و مضبوطدا بوو. تەنیا سوریە لە بەینی شەڕو شۆڕو نیفاقی ئومەرای ئەیوبی ناڕحەت بوو ئەگەر ئەم ولآتەشی بۆ ساغ بکرایەوە، بەتەواوی دەوری شەوکەتی زەمانی سولْتان صەلاح ئەددین بە دەرەجەیەك ئیعادە ئەکرایەوە.

ئەوەی مەلیك نەجم ئەددین ئەیوبی سەغلەت ئەکرد، موعاهەدەی قودس بوو. واقیعەن بۆی دەست نەئەدا کە سوریە دەس ئەمیر داود بکەوێ زاتەن چونکە موعاهەدەی قودسیش لەژێر جەبرو تەصدیقدا ئیمزا کرابوو، ئەوەندە قیمەتی حقوقیەو ئەخلاقیەی نەبوو. مەلیك صالْح، بەم فیکرو قەناعەتە، بەطالْیی ئەو موعاهەدەیەی ئیعلان کردو بە ظاهری ئەمیر داودیشی بە وەعدی حاکمیەتی شام دامرکاند.

مەلیك صالح، ساڵی دوایی، لەگەڵ رێکخستنی ئیشوکاری میصردا رابوارد. بەدوی میصری عولیای تەئدیب کرد. روئەساو مشایخی ئیختیلالی گرت و موڵك و ئەراضیەکانی بەسەر مەملوکەکاندا دابەش کرد. لە عەینی ساڵدا لە جەزیرەی (روضة)دا، کە لە ناو نیلدا بوو، سەرایەکی بۆ خۆی و قشڵەیەکیشی بۆ مەملوکەکانی دروست کرد.

لە عەینی ساڵدا مەلیك نەجم ئەددین لەگەڵ دوژمنانی خۆماڵیدا، تێك چوو. ئەمیر داود، لەدوای بەطاڵ کردنەوەی موعاهەدەی قودس، باش تێگەیشت کە سوڵتان نەجم ئەددین، مەیدانی ناداتێ تا نفوزێکی زۆر پەیابکا. ئەمیر نەجم ئەددین ئیسماعیلی مامی سوڵتانیش، لەبەر کردەوەی خائینانەی پێشووی لە تریس و لەرزدا بوو، وە ئەیزانی کە سوڵتان شامی بەدەسەوە ناهێڵێ. لە شەرقیشدا لە (جەزیرە)ش بەدرئەددین لۆلوئی حاکمی موصڵ، نفوزێکی زۆری پەیا کردبوو. شاری (ئامەد)ی لە تورایشاهی کوڕی سوڵتان زەوت کردبوو، وە بە غەیری (حصن کیف) و (قلقه الهائم) جێگەیەکی بەدەسەوە نەهێشتبوو.

نیهایەت ئەمیر داودو ئەمیر ئیسماعیلی حاکمی شام، لە عەلەیهی سوڵتان، لەگەڵ فەرەنگی میصردا ئیتیفاقیان کرد. لە موڵکی فەتح کراوی سوڵتان صەلاح ئەددین، (گەبەریە، شقیف، ئارنون و صەفەدی)یشیان دانێ، موساعەدەیان کردن کە لە شام سیلاح بکڕن. بۆ مەحوی مەلیك نەجم ئەددین ئەیوب، ئیتیفاق کرا. وە دەسیان کرد بە خۆحازر کردن. ئەساس و مودەبیری ئەم فەسادە، ئەمیر نەجم ئەددین ئیسماعیلی مامی سوڵتان بوو. لە وەقتی خۆیدا دیسان هەر بە حیلەو فەساد، شامی لە مەلیك (جواد یونس) سەندبوو، وە ئەم ئەمیرە لەترسی ئەو لەخوانەترسە، رای کردبووە لای فەرەنگ، ئەمیر ئیسماعیل لەم ئیتیفاق و تێکەڵییەدا، لەگەڵ فەرەنگدا ئیستیفادەی کردو میقدارێ پارەی نارد بۆ فەرەنگ و مەلیك جەوادی لێ وەرگرتن و ظاڵمانە کوشتی.؟

خولاصه بۆ رووخاندنی بناغەی سەڵتەنەتی ئەیوبی، داود و ئیسماعیل دەنائەتیان گەیاندە دەرەجەی نیهایەت و لە ژێرەوە خەبەریان نارد بۆ فەرەنگ کە ئوسەرای ئیسلام، کە لە (شقیف) و (ارنون)دان، ئەیانەوێ عوصیان بکەن.

فەرەنگی موتەعەصیب کە ئەم خەبەرەی بیست، هەموو ئەسیرەکانی هەڵگرت و بردینە عەککا و لەوێ هەمووی کوشتن.

لە دوای بەنێ لەشکری فەرەنگ و داود و ئیسماعیل، بەیەکەوەو روویان کردە لەشکری سوڵتان نەجم ئەددین و لە بەینی (غەزە) و (عەسقەلان)دا، تووشیان بوون و شەڕێکی قورس لە بەینیاندا قەوما. لەشکری موسوڵمانی ئەمیر ئیسماعیل لە وەقتی شەڕدا خۆیان جوێ کردەوەو چوونە لای مەلیك نەجم ئەددین ئەیوب و لە نەتیجەدا موتەفیقین زۆر خراپ شکان و لەفەرەنگ زۆر بەدیل گیراو مەجبور بوون لەگەڵ سوڵتانی میصردا صوڵحیان کردو لەشکری میصر گەڕایەوە.

بە سەبەبی دوورکەوتنەوەی مەلیك نەجمەدین لە سوریە، ساڵی دوایی فەرەنگ و ئەمیر داود، بەعزێ حەرەکاتی بچوك بچوك و بەڵام زۆر زاڵمانەیان کرد. لە ٦٤١ هـ دا، لە بەینی مەلیك نەجم ئەددین و ئیسماعیلدا موزاکەراتی صوڵحیە دەسی پێ کرد، وە ئەساسی ئەم موزاکەرەیەش ئەمە بوو، کە مەلیك غیاث ئەددین کوڕی مەلیك نەجم ئەددین[١٤]، کە لای ئەمیر ئیسماعیل ئەسیر بوو، بەربدرێ و مەلیك بە مەتبوع بناسرێو لە خوتبەدا ناوی بخوێنرێتەوە. بەڵام ئەمیر ئیسماعیل خەبەری وەرگرتبوو کە مەلیك نجم الدین بە دزیەوە خوارەزمیەکانی لێ هان ئەدا، بە سەبەبی ئەمەوە، قەتعی موزاکەرات کرا، وە لە ئەواخیری ئەو ساڵەدا ئیسماعیل و داود ئیتیفاقێکی قەتعییان لەگەڵ فەرەنگدا ئیمزا کرد و بەشی زۆری فەلەستینیان لەگەڵ قدسی شەریف و بەعزێ مەواقیعی موقەدەسەی ئیسمایان کەلە ناوەدا، بۆ تەرك کردن (٦٤١هـ). ئەمیر داود کە دوشمنێکی زۆر بە شیدەتی فەرەنگ بوو، مەجبور بوو کە مێزەکەی ناو صخرەو زەنگەکەی مسجد الاقصی شیان بداتێ.

مەلیك نەجم ئەددین، بەرامبەر بەم دوژمنە موتەفیقانەی، خوارەزمیەکانی بە ئیمدادەوە هێنا واقیعەن لەشکری خوارەزمی، ساڵی دوایی ٦٤٢هـ، لەسەر ڕێگەیانا (قودسی شەریف)یان زەوت کرد و تەخریباتێکی مودهشیان لەو ناوەدا کرد. مەلیك نەجم ئەددینیش، لە میصرەوە ئۆردوویەکی بەیارمەتی خوارەزمیەکانەوە نارد، ئیسماعیلیش لەشکرێکی بە ئیمدادی فەرەنگەکانەوە نارد. دوو لەشکر لە (غەزە)دا شەڕێکی زۆر مودهیشیان کرد و ظەفەری قەطعی، کەوتە دەس خوارەزمی و لەشکری میصر، لەشکری خوارەزمی تالانێکی بێ حەد و حیسابی کرد. لە دوای ئەم غەلەبەیە، لەشکری میصر (قودسی شەریف) و فەلەستینیان داگیر کردەوە (٦٤٢هـ)، کە ئەم وڵاتە لە ئیعتیباری ئەم تاریخەوە تا ١٩١٨ م بەدەس ئیسلامەوە مایەوە. ئەمیر داود، تەنیا (کرت) و (سلط)و (عجلون)ی پێ محافظە کرا. لەشکری میصر، شامیشی موحاصەرە کرد و موحاصەرە زۆر گوولّی کێشا.

ئینجا ساڵی دوایی ٦٤٣هـ، ئیسماعیل تەسلیم بوو، وە موقابیل بە شام بەعلەبەك و بصری و مولحەقاتی درایە. لە دوای ئەم مۆفەقیەتە، خوارەزمیەکان بە تەمای موکافاتێکی زۆر بوون، بەڵام چونکە ڕەوەی کەدەسیان کەوتبوو ڕاچی نەبوون، داخڵی خزمەتی ئیسماعیل و داود بوون، وە بەئەمری ئەوان (شام)یان موحاصەرە کرد، کە لە تەڕەف قوماندانێکی ئەیوبیەوە تا ئەوائیلی ٦٤٤هـ مودافەعە کرا. ئەمیری حەڵەب و حەمما کە تا ئەو وەقتە تەڕەفداری مەلیك نەجم ئەددینیان نەکردبوو، بۆ خاکری برینەوەی شەڕو موصیبەتی خوارەزمی، لەشکری خۆیان ناردە سەریان و خوارەمیەکان لەسەر ئەمە وازیان لە موحاصەرەی شام هێنا و چوون بە پیر لەشکری حەڵبەوە و لە قصبدا تووشیان بوون و خوارەزمی زۆر خراپ شکاو یەکێ لە ڕوئەسایان کوژراو یەکێکی تریشیان مەجبوری فەرار کرا.

ئیسماعیل ئیلتیجای کردە حەڵەب، و ئەمیری حەڵەب (یوسفی دووەم) حیمایەی کرد، بەڵام بەعلەبەك لەدەس چوو، وە کەوتەوە دەس مەلیك ئەیوب، کوڕو ژنەکانی

ئەسیر کران وبرانە قاهیرە. ئەمیر دوادیش بە غەیری کەرگ هەموو موڵکەکانی لەدەس چوو، وە ئەویش رای کردە حەڵەب و کوڕێکی زۆر منداڵی بەسەر کەرگەوە بەجێ هێشت. ئەمیری حەڵەب، زۆر رقی لە مەلیك نەجمەددین ئەیوب بوو، وە بۆ مودافەعەی موڵکی خۆی بەرامبەر بە مەلیك ئەیوب، ویستی حمصی لێ زەوت بکاو لەشکرێکی ناردە ئەو شارەو لە دوای دوو مانگێك موحاصەرە، لە ئەمیر ئەشرەفی داگیر کرد (٦٤٦هـ).

مەلیك نەجم ئەددین لەم تەجاوزە زۆر عاجر بوو، وە بۆ شەڕی ناصر یوسفی دووەم، هاتە شام. یەکێ لە سەردارانی خۆی بە لەشکرێکەوە ناردە سەر حمص.

مەلیك نجم ئەددین، لە دوای گەیشتنی بە شام، خەبەری هاتنی ئەهلی صەلیبی حەوتەمی زانی، کە لە قوماندانی قەڕاڵی فرانسس (لوئیی حەوتەم)دا روویان کردبووە دمیاط. ئەم حادیسەیە مەجبووری کرد کە بە تەوەسوکی خەلیفەی بەغدا، لەگەڵ یوسف ناصری دووەمدا صوڵحێکی بە عەجەلە بکا. لە دوای ئەم صوڵحە بە رەغمی نەخۆشییەکی گرانی، بە (سدیە) نقلێ کرایە (ئاشیمونەن Ashmunen)، بەلام نەیتوانی مانعی ئیخراجی ئەهلی صەلیب و گرتنی دمیاط بێ، چونکە لە دوای نەخۆش کەوتنی إنضباط و ئیطاعەتی ناو لەشکری سست بووبوو. عەشیرەتی بەدەوی (کنانە)، کە محافظەی ئەو مەوقیعەی گرتبووە ئەستۆی خۆی، وایزانیبوو کە لە تەڕەف لەشکری سوڵتانەوە بەجێ هێڵراوەو بەم ترسە نامەردانەو بڵحانە رایان کردبوو.

مەلیك نجم ئەددین، مودەتێکی کەم لە پێش وەفاتیدا، وەزعیەتی کوڕانی داودی بە مەمنونی چاوپێکەوت، واقیعەن کوڕە گەورەکەی، کە دی باوکی، برا بچکۆلەکەی لە جێگەی خۆی داناوە بە حاکمی کەرگ، چوبووە سەری و ئەسیری کردبوو، وە بە رجای گۆڕینەوەی کەرگ لەگەڵ مەوقیعێکی تر بۆی، ئەم قەلایەی تەقدیمی مەلیك نەجم ئەددین کرد و مەلیك یەکێ لە ئومەرای بە میقدارێ لەشکرەوە ناردو ئیشغالی کرد.

مەلیك ئەلصالح نەجم ئەددین ئەیوب، لە ١٥ شعبان ٦٤٧ھ (٢٣ تشرینی پانی ١٢٤٩م)دا وەفاتی کرد.

## ئەفکارو ئاثاری:

غایەی موبارەکی ئەم حوکمدارە، تەئسیسی حکوومەتێکی بە شەوکەتی وەکوو حکوومەتی سوڵتان صەلاح ئەددین و مەلیك کاملی باوکی بوو، کە عیبارەت بوو لە میصر و فەلەستین و سوریە و جەزیرە، بە فەرقێکی زۆر کەم ئەم مەقصەدەی لە ئەواخیری دەوری سوڵتەنەتیدا هاتە جێ. تەنیا ئەمارەتی سەربەخۆی حەڵەب و موصڵ لە دائیرەی نفوزی بەدەر بوو. مەلیك نەجم ئەددین بۆ زیادکردنی قوەت و تەئسیری خۆی لەشکرێکی مملوکی[١٦] ئیجاد کرد و ئەم قوەتە لە زەمانی خۆیدا بەراستی زۆر بەعەمەل هات و فائیدەی بوو، بەڵام ئەم قوەتە غەریبەیە، وەکو ئەمثالی تاریخی، لە دواییدا بووە سەبەبی لەناو چوونی حکوومەتی ئەیوبیە.

مەلیك نەجم ئەددین بەسەر مەئمورین و ئومەرای خۆیدا نفوزو نەظارەتێکی بەقوەتی بوو، هیچیان لە حضوریدا، تا لێیان نەپرسرایە، نەیان ئەتوانی قسە بکەن. ئەم مەلیکە گەورەیە، بۆ ئیعمارو ئینشائات، زۆر هیمەتی کردوە. قەصرەکانی روضەتو کبشی وە مەدرەسەکانی، نموونەیەکی زۆر بڵندی هیمەتیە. بێجگە لەمانەش، شاری (صالحیە)یشی دروستکرد و مەقصەدیشی ئەوە بوو کە بیکا بە قەڵایەکی سەرحەد.

## دەوری سەڵتەنەتی تورانشاه:

کوڕی مەلیك صالح نەجم ئەددین ئەیوبە، لە وەقتی وەفاتی باوکیا، حاکمی جەزیرەو کوردستان بوو. هێشتا لە زەمانی باوکیا لە شەڕو شۆڕی بەدرئەددین لۆلوئی ئەتابکی موصڵ و سوڵتانی سەلجوقی رۆمدا لە ئیشوکاری سەرداری و ئیدارەدا پێگەیشتبوو. لە صەنعەتی حەربدا شۆرەتێکی گەورەی هەبوو، کە خەبەری وەفاتا

باوکی بیست، دەتبەجیّ هەڵساو رووی کردە میصر. (شجره الدر)ی باوەژنی ئافرەتێکی تێگەیشتوو و عاقڵ بوو. تا تورانشاه گەیشتە میصر، مورردنی مەلیك نەجم ئەددینی شاردەوە. تورانشاه، کە گەیشتە میصر، دەسبەجیّ لە تەرەف ئومەراوە بەیعەتی پیّ کراو بە سوڵتان ئیعلان کرا.

تا ئەو وەقتە لەشکری صەلیبی (سن لۆ) ، (دمیاگ)ی کردبوو بە ئوسی حەرەکەو لە دوای گەیشتنی ئیمداد، کە عیبارەت بوو لە ئینگلیز و فرانسز، رووی کردبووە پایەتەختی میصر. ئەووەڵ هەدەفی ئۆردووی صەلیب (منصوره)بوو. تورانشاه، لە دوای گەیشتنی بە میصر لەگەڵ کۆکردنەوەی لەشکرو تەئمینی مودافەعە خەریك بوو. ئەهلی صەلیب بە سستییەکی عەجائیب ئینجا لە ظرفی مانگێکدا لە دمیاطەوە گەیشتە مەنصورە. تورانشاه لە سستی و تەمەڵی ئەهلی صەلیب ئیستیفادەی کرد و لەشکرێکی باشی کۆکردەوەو لە لایەکی تریشەوە قەصەبەی مەنصورەشی باش تەحکیم کرد.

تا ئەو وەقتە، لەشکرێکی ئاڵمانیش هاتبوو بە ئیمدادی ئەهلی صەلیبەوەو ئەم لەشکرە بێ حیسابە، گەیشتبوە مەنصرەو موحاصەرەی کردبوو. فیضانی شطی نیل، پلانی (سن لۆ)ی تێکداو بە ئەمری تورانشاه پردەکانی بەینی مەنصورەو قاهیرە تێکردا و سەدەکانی شکێنراو لافاوی ئاو لە هەموو لایەکەوە دەروی ئۆردوگای صەلیبی داو خطی رەجعەتی برین و لە لایەکی تریشەوە لەشکری تەوانشاه لە هەموو لاوە، تەنگیان بە ئەهلی صەلیب هەڵچنی و هاتووچۆیانی لەگەڵ دمیاط تووشی نەخۆشیەکی خراپی کردن.

لە لایەکی ترەوە، تورانشاه تەشەبوسێکی خارقولعادەی بۆ زەوتی دمیاط و برینی رێگەی دەرچوونی ئەهلی صەلیب کرد، بەعزێ سەفائینی بەحری پارچە پارچەو بە پشتی حوشتر ناردە قەراغ بەحری سپی و لەویّ تێکی چەسپاندن و دونمایەکی

موناسیبی پێکەوەناو لە پرێکا ناردیە سەر دمیاط و إرتباطی بەحری صەلیبی لەگەڵ ئەوروپادا بڕی.

خولاصە لە لایەکەوە تضیقی لەشکری میصرو لە لایەکەوە هجومی دائیمی شەگی نیل و لە لایەکی تریشەوە برسیەتی و نەخۆشی، سەرداری لەشرکی صەلیبی لەگەڵ ئۆردووەکەیدا مەجبوری گەڕانەوە کردو لەم رەجعەتەدا لەشکری میصر زۆریان لێ کوشتن و تەنگیان پێ هەڵچنین و نیهایەت ئەسیریان کردن (٦٤٧هـ).

سن لۆ، بەو بەیاخەوە کە لە مناستری (سن دە نیس) وەرکی گرتبوو، کەوتە دەس تورانشاه و لە دوانی دانی سەرانەیەکی ٨٠٠,٠٠٠ ئاڵتوونی و تەسلیم کردنی دمیاط، ئینجا خۆی و روئەسای رزگار کرد و موعاهەدەیەکیشی لەگەڵ تورانشاهدا ئیمزا کرد کە بە گوێرەی ئەوە، ئەبوو دەسبەجێ لە خاکی میصر بچێتە دەرەوەو ئەم شەرتەشی بەجێ هێناو چووە سوریەو سێ ساڵێك لەوێدا ما. ضایعاتی ئۆردووی صەلیب لەم حەرەکەتە بێ فائیدەیەدا، نزیك ٣٠,٠٠٠ کەسێك بوو (معالم تاریخ العصور الوسطی).

لەدوای بڕانەوەی هەرای ئەهلی صەلیب، تورانشاه خەریکی تەئسیسی ضبط و رەبطێکی عەسکەری لەناو لەشکری مەملوکدا بوو. بەشی بەحری کە مەملوکی باوکی بوون، زۆر خودسەر بوون، تورانشاه بە لەشکری جەزیرەی پشت ئەستوور بوو، وە ویستی مەملوکی بەحری بهێنێتە ژێر ضبط و رەبتەوە. ئەم فیکری سوڵتانە بۆ لەشکری عەبدانی لە ئیطاعة دەرنەچوو، دەسی نەداو سوئی قەصدێکیان دەرحەقی تەرتیب کردو بە غافڵی کوشتیان (٦٤٨هـ).

بەعزێ لە موئەریخین ئەڵێن لەم جینایەتەدا، دەسی (شجره الدر)ی باوەژنی تیابوو رەنگە قسەی ئەمانە راست بێ، چونکە ئەم ئافرەتە چاوی لە سەڵتەنەت بوو، بەحتی باوەژنیی، بە گەبیعەت تورانشاه خۆش نەئەویست، لە لایەکی تریشەوە، لەگەڵ مورەتیبی ئەم جینایەتە، کە مەملوکی بەحری بوو، زۆر رێك بوو. وە حەتتا بەینێك لە دوای سەڵتەنەتیش، شووی کرد بە قوماندانی مەملوکی بەحری کە (ئیبیك)بوو، جا بە

گوێرەی ئەمە هیچ دوور نییە، کە تەرتیباتی ئەم جینایەتە، بە مەعلوماتی (شجره الدار)کرابێ.

خولاصە هەرچۆنێ بێ مەملەکەتی بەد طالعی ئەیوبی، لە حوکمدارێکی بە هەیبەت و لە سەردارێکی بە شۆرەت مەحرووم بوو. تورانشاه، ئاخیر سوڵتانی بە شەوکەتی ئەیوبی بوو، عەز و سەباتی، جورئەت و جەسارەتی، زۆر رەنگە کە رەونەقیەکی باشی بە سەڵتەنەتی ئەیوبی بدایە. بەلام قەزاو قەدەر و خیانەتی داخلی، مەیدانی نەدا. تاریخ، نەقلێ کردنی دوننمای بە پشتی حوشتر هەر لەم سەرداره دیوەو ئینجا لە دوای دوو عەصر و چوار سالێ، سوڵتان محەمەدی فاتیح، شتێکی وای لەبەر ئەستامولدا کردو هیچ شوبهە نییە کە درەسی ئەم خاریقەیەی لە مەناقیبی جەلادەتی تورانشاهەوە وەرگرتبێت، بێجگە لەمەش مەحوکردنەوەی ئۆردووی صەلیب و ئەسیرکردنی قەڕاڵی فرانسەش، خاطیرەیەکی ئەبەدی شان و شەرەفی ئەم حوکمدارەیە.

## دوایی حکوومەتی ئەیوبی میصر:

مەملوکی بەحری عاصی، لەدوای شەهید کردنی تورانشاه، شجره الدری باوەڕنیان کرد بە مەلیکەی میصر، خوتبەیان بەناویەوە خوێندەوەو سکەشیان بە ناویەوە لێدا، عینانی سکەی (المستعصمیة الصالحة الملكة المسليمن، ام ملك المنصور خليل)بوو. لە دوای ئیعلانی مەلیکە (معز ئەددین ئیبیك)ی رەئیسی مەملوکی بەحری، کرا بە قوماندانی ئۆردووی میصر.

سەڵتەنەتی شجره الدر، زۆر دەوامی نەکرد، چونکە ئومەرای میصر لەسەر تەعین کردنی حوکمدارێك لە خانەدانی ئەیوبی، ئیصراران کرد و نیهایەت مەلیك ئەلئەشرەف موسای کچەزای مەلیك کامل و کوڕەزای ئاخیر ئەمیری ئەیوبی (یەمەن)، لە جێگەی شجره الدر کرا بە مەلیکی میصر (ئیبیك)[١٧]ەوە بوو.

ساڵی دوایی ، میصر لەگەڵ مەلیك ناصری یوسفی حوکمداری حەلەبدا تێکچو. ئەم شەڕو ئیختیلافە سێ ساڵێك دەوامی کردو نیهایەت خەلیفەی بەغدا کەوتە بەینەوەو صوڵحی بە مەلیك ناصر یوسف و ئیبیك کرد (٦٢٥هـ).

ئەمیری مەملوکی بەحری و قوماندنی لەشکری میصر (ئیبیك)، لە ٦٥٣هـ دا حوکمداریی سەربەخۆی خۆی بەسەر میصردا ئیعلان کرد و مەلیك ئەشرەفی مەخلوعیشی ناردەوە یەمەن لای خزمەکانی. بەم تەرحە سەڵتەنەتی بەشەوکەتی ئەیوبی میصر، نیهایەت کەوتە دەس عەبدەکانیان و ئەو غەڵەتی سیاسی و عەشکەریە کە بوە سەبەبی لەناوچوونی حکوومەتی عەباسی، بووە سەبەبی مەحووی سەڵتەنەتی ئەیوبی میصریش. وەلحاڵ لازم بوو کە مەلیك عادل لە پێش دانانی بناغەی لەشکری مەمولك، تەماشایەکی تاریخی خەلافەتی عەباسیەی بکردایەو عیبرەتی لێ وەربگرتایە.

## حکوومەتی ئەیوبی حەڵەب:

### ٥٧٩ – ٦٨٥هـ

سوڵتان صەلاح ئەددین، ئەووەڵ جار ئەم وڵاتی حەڵەبەی دا بە مەلیك ظاهر غازی کوڕی، کە هێشتا یانزە ساڵە بوو. لەدوای چەند مانگێك ئیدارەی ئەم وڵاتەی دا بە مەلیك عادلی برای. لە ٥٨٢هـ دا سوڵتان سەرلەنوێ تەقسیماتی موڵکی کرد و مەلیك عادلی کرد بە ئەتاپکی مەلیك عەزیزی کوڕی لە میصرو وڵاتی حەڵەبی دیسانەوەدا بە مەلیك ظاهری غازی. وە (ضعیفة خاتوون)ی کچی مەلیك عادلی لێ مارە کرد. مەلیك ظاهر، لە حاڵی حەیاتی باوکیا، وەکوو تابیعێکی صادق، لە هەموو شەڕی ئەهلی صەلیبدا کۆمەکی باوکی کرد و لە دوای وەفاتی باوکی تابیعی مەلیك عادلی مامی بوو.

غایەی ئەم ئەمیرە ئەوە بوو کە بە ئیتیفاق، موازەنەی قوەتی حکووماتی ئەیوبی، محافظة بکرێ. وە بۆ خاتری ئەمەی کە بتوانێ بەرامبەر بە هەموو تەعەروزێکی

مودافەعە بکا، قەڵای حەلەبی زۆر مەحکەم، تەعمیر و تەقویە کرد. مەلیك ظاهر لە ٦١٣ﻫ دا وەفاتی کرد، مەرحوم لە پێش وەفاتیدا، مەلیك عەزیز مەحموودی کوڕە بچوکی کە کچەزای مەلیك عادل بوو، کردبووی بە خەڵەفی خۆی و مەقصەدیشی لەمە ئیستیفادە کردن لە نفوزو معاوەنەتی مەلیك عادل بوو.

مەلیك ئەشرەف موسای کوڕی مەلیك عادل ئەمرو قوماندانی لەشکری حەلەبی گرتە دەس خۆی، وە بەرامبەر بە تەعەروزی سوڵتان کەیکاوسی سەلجوقی، مودافەعەیەکی باشی کرد. ئومووری ئیدارەی موڵکیەی وڵاتەکە، بەدەس ئەتابك (طغرل)ی نائیبی مەلیك ظاهر و مەشهوور قاچی بهائەددین ئیبن شدادەوە بوو.

مەلیك عادل و مەلیك کاملی خەڵەفی و کوڕی، تەصدیقی حکوومەتی مەلیك عەزیزیان کرد. وە مەلیك عەزیز لە ساڵی ٦٢٨ ﻫ دا، ئیدارەی گرتە دەس خۆی و بۆ تەئمینی ئیدارەی خۆی، لە ئومەرای مەنسوبینی، مەئمورینی تازەی تەعین کرد و قوماندانی قەڵای حەلەبیشی دایە دەس ئەمیرێکی خۆی. بە یارمەتی مەلیك کاملی خاڵی، قەڵای شیرازی گرت. (ئەلبیرە) کە قەصەبەیەکی سەر فورات بوو، لەناو میراتی (ئەلزاهر) داودی میامیا، گەوتە دەسی چ باوکی و چ خۆی زۆر تەرەقییان بە شاری حەلەب کرد، عومران و تیجارەتی، زۆر پێشکەوت لە تەرەف جەزیرەو سوریە حدودی تەوەسوعی کرد.

مەلکی عەزیز لە ساڵی ٦٣٤ﻫ دا بە جوانەمەرگی مرد و مەقامی حکوومەتی بۆ مەلیك ناصر یوسفی دووەمی کوڕی بەجێ هێشت[١٨] کە هێشتا حەوت ساڵە بوو نەنکی یوسف (ضیفیة خاتوو) لە دەوری بوحرانێکی سیاسیدا بوو بە نائیبەی خەلیك ناصر یوسف، وە لە دوای عاجزییەکی لەگەڵ مەلیك کاملدا، لەگەڵ مەلیك ئەشرەفی حاکمی شام ئیتیفاقی کرد. لە وەقتێکدا کە لەشکری میصر هاتە سەری و وڵاتەکەی ئیستیلا کرد، زۆر باش توانی خۆی مودافەعە بکاو ئۆردوەکەی کە لە قوماندانی (المعظم) ی

کوری سوڵتان صلاح الدین دا بوو، لەشکری دوشمنی تووشی چایعاتێکی زۆر کردو گێڕایە دواوە.

(ضیفة خاتوون) بۆ زیادکردنی نفوزو قوەتی خۆی، بە ئاشکرا لەگەڵ سوڵتان کەیخەسرەوی سەلجوقی رۆمدا ئیتیفاقی کرد وئەوی بە مەتبوعی خۆی قبووڵ کرد، لە سکەو خوتبەدا ناوی ئەوی داناو خوشکی سوڵتان کەیخەسرەوی بۆ مەلیك ناصری کورەزای خواست لەم بەینەدا تەهلەکەیەکی گەورە رووی کردبووە سوریەو هەموو ئەهالی شەرکەری خوارەزمی، لە تەرەف جدەنگیزخانەوە، لە خاکی خۆی دەرکرابوو، لە جنوب بەحری خەزەرەوە رووی کردبووە جەزیرەو مەملەکەتی مەلیك صالح ئەیوبی کوری مەلیك کاملی ئیستیلا کردبوو.

جێگەی ئەسەفە کە ئەو حسی حەسادەتە کە لە بەینی ئومەرای ئەیوبیەدا هەبوو، نەیهێشت بەرامبەر بەم تەهلەکەیە ئیتیحاد بکەن وە یا بەگوێرەی مەنفوعەتی خۆیان لەگەڵ خوارەزمی یەك بگرن. نیهایەت لە ساڵی ٦٣٨ هـ دا، لەشکری حەلەب بەرامبەر بە قوەتی زۆر غالبی خارزمی شکاو (المعظم)ی قوماندانی، ئەسیر بوو. هەموو بارگرانیان کەوتە دەس دوژمن. وە تا حەمما هەموو ولاتەکە کەوتە ژێر ئیستیلای خوارزمیەوە.

لە پاشدا لەشکری حەلەب، لە تەرەف مەلیکی حمص و عاشایری بەدەوی، کە لە لەشکری خوارزمی رای کردبو، تەقویە کراو قودرەتێکی وای پەیا کرد کە بتوانێ سەرلەنوێ لەگەڵ لەشکری خوارزمی شەربکاو لە ئەووەڵ موصادەمەدا شکاندی و شوێنی خوارزمی کەوت و تا (رحبە) رادوی ناو لەوە زیاتر تەعقیبی نەکرد. خوارزمی شکاو بەسەر حەراندا تا عانە خۆی نەگرت و لەوێ داخلی ولاتی خەلیفەی عەباسی بوو. شارانی جەزیرە، کە لە تەرەف خوارزمیەوە زەوت کرابوو، هەمووی سێنرایەوە. ئەو ئەسیرانەی کەلە تەرەف خوارزمیەوە لە حەراندا حەبس کرابوون، هەمووی بەرەڵا بوون.

لە ٦٤٠دا لە شکری حەڵەب جارێکی تریش لەشکری خوارزمی شکاند. وە لە دوای ئەم غەلەبەیە بە چەند مانگێك، (ضفیة خاتوون) وەفاتی کرد. مەلیك ناصر یوسف ئەم جارە ئموری حکومەتی گرتە دەس خۆی و بەسەر بەشی زۆری سوریەدا لە (العریش)ەوە تا فورات حاکمیەتی خۆی جاری کرد. لە تەرەف خەلیفەی بەغدادەوە عینوانی سوڵتانی درایە. زۆر حەیف کە طالعی ناساز، موصیبەتی تاتاری هێنایە پێش، واقیعەن هۆلاکۆ لە ٦٥٨ ﻫ دا رووی کردە حەلەب. سوڵتان ناصر، بێ فائیدە ئیتیزاری معاوەنەتی لە میصر کردو نیهایەت ناعیلاج ما. حەلەبی بەجێ هێشت و چووە شام. بەلام دیسان نەجاتی نەبوو، وە کەوتە دەس هۆلاکوو لەناو چوو، وە حکوومەتی حەلەبی ئەیوبی بەم تەرحە دوایی هات.

## حکوومەتی ئەیوبی شام:

سوڵتان صلاح الدین لە حاڵی حەیاتیدا، شام و سوریەی دابوو بە مەلیکولئەفزەڵی کوڕە گەورەی لەدوای وەفاتی خۆی، زۆری پێ نەچوو، بەینی مەلیکئەفزەڵ و مەلیك عەزیزی حوکمداری میصر، تێك چوو. وە لە دواییدا مەلیك عادلیش خۆی تێکەڵی ئەم هەرایە کرد و مودەتێکی زۆر ئەم دەعوایە تووڵی کێشا، وە لەم بەینەدا مەرکەزی حکوومەتی مەلیك ئەفزەڵ، کە شام بوو، چەند جارێك کەوتە ژێر موحاصەرەوە.

ئینجا لە دوای وەفاتی مەلیك عەزیز و شکانی مەلیك ئەفزەڵ، شام و سوریە، لە ژێر ئیدارەی مەلیك عادل دا، حەسایەوە. لەدوای وەفاتی مەلیك عادل، حکوومەتی سوریە، کەوتە دەس (المعظم عیسا)ی کوڕی و لە زەمانی ئەمدا، تەملەکەی فەرەنگ، ئەو ولاتەی نارەحەت کرد. لە دوای وەفاتی المعظم، مەلیك ناصری کوڕی بوو بە حاکمی شام بەلام مەلیك کامل وازی لێ نەهێناو بە لەشکرەوە چووە سەری. مەلیك (ئەشرەف موسا)ی برای مەلیك کامل، ئەووەڵەن لای مەلیك ناصری گرت، بەلام لە دواییدا لەگەڵ

مـەلیك کامـل ڕێـك کـەوت و شـامیان گـرت و ئیـدارەی ئـەم شـارە کەوتـە دەس مـەلیك ئەشرەف (٦٢٦ھ).

ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو، مـەلیك ئەشـرەف، بـۆ دەفعـی تەهلەکـەی جـەلال الـدین خوارزمشاه، لەگەڵ سوڵتانی ڕۆم (کیقباد)دا، ئیتیفاقی کـردو لەشـکرێکی لـە قومانـدی (ئەمیر عزالدین عمر)ی حەکاریدا، نـارد و ئـەم دوو موتەفیقـەی جەلالـەدینیان لـە نزیـك ئەرزنجان شکاند (٢٨ ڕەمەزان ٦٢٧ھ) لە دوای بەینێ، مەلیك ئەشرەف لەگـەڵ مـەلیك کاملی برایدا، لەگـەڵ (علاوالـدین کیقبـاد) تێـك چـوو. تەعـەروزێکی کـەیقوباد بـۆ سـەر جەزیرە، ئینجا لە دوای دوو ساڵ لە ٦٣٣ھ دا، دەفع کرا. مەلیك ئەشرەف لە ئەواخیری حەیاتیدا لەگەڵ مەلیك کـاملیش تێـك چـوو، وە لەشـکری میـصر هاتەسـەر شـام و لـەو بەینەدا مەلیك ئەشرەف وەفاتی کرد.

لە زەمانی مەلیك عادلی دووەمدا، شەڕو دەعوای بەینی ئومەرای ئەیوبی دەسـی پـێ کرد و مەلیك صاڵح ئیسماعیلی حاکمی شام، بەرامبەر بە مەلیك صاڵح ئـەیوبی حـاکمی میصر، لەگەڵ فەرنگدا، ئیتیفـاقی کـرد. مـەلیك صـاڵح ئـەیوب، بـە یارمـەتی لەشـکری خوارزمی، موتەفیقینی (غزە)ی شکاند (٦٣٤ ھ ، ١٢٤٤م)و سەرلەنوێ سوریەو میصری تەوحید کرد.

لە دوای وەفاتی (معظم تورانشاه)ی کوڕی مـەلیك صـاڵح ئـەیوب، حـاکمی حەلـەب، مەلیك ناصر یوسف، شامی زەوت کرد. وە ئەم زاتە ئاخیر ئەمیری ئەیوبی شام بوو.

شاران و وڵاتـانی سـوریە، لـە زەمـانی ئەیوبیـدا، زۆر تـەعمیرات و ئیـصلاحاتی دی. ئومـەراو ئـەمیراتی خانـەدانی ئـەیوبی و ڕونەسـای ئـەم دەورە، لـە بینـاکردنی سـەراو قەصری جوان جوان، عادەتەن لەگەڵ یەك دەس پێشکەریان ئەکرد.با خـصوص شـام زۆر پێشکەوت و بەوە مەرکەزی عیلم و مەجمەعی مەداریس. (ابن جبیر) کە لە زەمـانی سوڵتان صلاح الدین دا، ئەم شارەی دیوە، ئەڵێ لە شامدا بیست مەدرەسەیەك هـەبوو، ئەوەندەی پێ نەچوو دوو میسلی ئەم عەدەدە مەدرەسە کرا.

## حکوومەتی شەیوبی حەمما:

لە دوای ئەمە کە لیوای حەمما کەوتە دەس ئەیوبی، سولّتان صلاح الدین، دای بە (مەلیك المظفر)ی کوڕی (تقي الدين عمر)ی برای، وە نەتەوەی ئەم ئەمیرە لێرەدا حاکم بوون و دایمە چاویان لەوە بووە کە لەگەلّ حوکمدارە گەورەکانی ئەیوبی، باش رابوێرن. لە وەقتێکدا کە هۆلاکۆ، هاتە سەر سوریە، نەیانتوانی بەرامبەری راوێستن و لەدوای شکان و گەڕانەوەی هۆلاکۆ لە سوریە، بوونە تابیعی حکوومەتی مەملوکی حەمما، ئەم خانەدانە، لە تەئریخی ٦٩٨هـ دا لەناو چوو. برازای ئاخیر مەلیکی حەمما، موئەریخ و عالمی مەشهوور، ئەمیر ئەبو ئەلفدا ئیسماعیل بوو، وە لەگەلّ (سولّتان محمد الناصر)دا، ئیشتراکی شەڕی کرد. ئەو سولّتانە، زۆری خۆش ئەویست و حەممای دایە وعینوان و حقوقی سولّتانیشی دایە. لە ئیدارەی (ئەبو ئەلفدا)، شاری حەمما زۆر تەرەقی کردو. قەبری ئەم ئەمیرە گەورەیە لەوێیە.

لەدوای سولّتان ئەبو ئەلفدا، مەلیك ئەفزەلّ محمدی کوڕی، بە سەبەبی بێ ئیدارەیی خۆی، ئەمنیەتی سولّتانی میصری ضایع کرد ونیهایەت گیراو لە شام دا قەلآبەند کرا.وە بەم تەرحە دوایی حکوومەتی ئەیوبی حەمما هات.

## ئەمارەتی ئەیوبی حمص:

ئەم ولآتی (حمص)ە، لە ٥٧٠هـ کەوتە دەس سولّتان صلاح الدین و لە دوای ئەم تاریخە بە چوار سالّ، دای بە محمدی کوڕی شێرکۆهی مامی.

بەینێك ئەم ولآتە لە تەرەف مەلیك ناصر یوسفی دووەمی حاکمی حەلەبەوە زەوت کرا (٦٤٦هـ)، بەلآم ئەوەندە بە دەسیەوە نەما وە لەگەلّ ئەم فاصیلە کورتەدا، دایمە بەدەس نەتەوەی شێرکۆهەوە بوو. وەحکوومەتی ئەم خانەدانە تا ٦٦١ هـ دەوامی کرد. وە لە هاتنی هۆلاکۆدا، بێ مقاوەمەت، قاپی حمصیان بۆ کردەوەو حکوومەتی خاندانی شێرکۆه لەناو چوو.

## ئەمارەتی ئەیوبی یەمەن:

ئەیزانین کە یەمەن لە تەرەف مەلیك المعظم تورانشاهی برای سولتان صلاح الدینەوە و لە تاریخی ٥٦٩ه فەتح کرا. وە مەلیك المعظم دوو ساڵێ لە یەمەندا، بە ناوی کاکیەوە حکومەتی کرد. لە دواییدا وەکیلێکی بە سەرەوە داناو خۆی گەڕایەوە میصر. لەدوای وەفاتی، یەمەن درا بە مەلیك ٥٩٣). لەدوای ئەم (المعز ئیسماعیل)ی کوڕی، هاتە جێگەی، بەڵام لە ٥٩٨ه دا کوژرا. (ناصر ئەیوب)ی برای، جێگەی گرتەوەو ئەمیش لە ١٢ محرم ٦١١ دا دەرمانخوار کرا.

لە دوای ئەمە، مەلیك مەسعود صلاح الدین یوسفی کوڕی مەلیك کامل، بۆتە حاکمی یەمەن و بە قوەتێکەوە رووی کردە یەمەن و لە ٢ محرم ٦١٢ دا گەیشتە مەرکەزی یەمەن کە (زبید) بوو. لە دوای گرتنی (تەعز) (سلێمان بن تەقی الدین عمر بن شهنشاه) بۆ میصر، لەگەڵ ئیمامدا کەوتە شەڕەوەو لە ٨ جماد الاخر ٥١٤ دا (صنعا)ی زەوت کرد.

لە ٦١٩ دا ئومـوری حکومەتی، تەودیعی کوڕانی (رەسولی) کرد و لە ٦٢٠ ه دا گەڕایەوە میصر. لە ٦٢٤ لە رەجەب دا، هاتەوە یەمەن و کوڕانی رەسولی حەپس کردو لە عەینی رۆژدا بەری دان . لە عەینی ساڵدا گەڕایەوە میصر و ئیدارەی یەمەن دیسان درایە دەس نورالدین عمر ی کوڕی عەلی رەسولی. وە لە دوای مودەتێك ئەمیر نورالدین ئیعلانی سەربەخۆیی کرد و حکومەتی (رەسولی)ی یەمەنی دامەزراند.

## ئەمارەتی ئەیوبی جزیرە:

لە ئەساسدا تا ساڵی ٦٤٣ه دەوامی کرد. مەرکەزی میافارقین بوو، وە لە زەمانی المظفر غازی دا بەدەس مەغۆلەوە لەناو چوو. بەڵام لە بەعزێ شارانی جەزیرەو کوردستاندا، بەقایای ئەیوبی هەر مابوو، وە حەتتا لەمانە ئەمارەتی حصن کیف تا عصری دەهەمی هجریش دەوامی کردوە.

## موتالەعەیەکی عمومی:

سەڵتەنەتی ئەیوبی، کە لەسەر میراتی خولەفای فاطمی و ئەتاپك دامەزرابوو، بە رەغمی هجومی یەك لە دوای یەکی ئەهلی صەلیب، لە دەوری سوڵتان صلاح الدین و مەلیك عادل و مەلیك کامل دا، شەوکەتێکی تەواوی بوو. لە دەوری مەلیك عادلی دووەمدا، بێ ئیدارەیی و سستی، بێ هێزی کرد. بەلام مەلیك صالح نجم الدین ئەیوب بە ئەزیەت و کوێرەوەرییەکی زۆر، نیهایەت غەلەبەی بەسەر بەعزێ ئومەرای بێ ئیدارەو تەمەعکارو موفسیددا کرد، وە بە دەرەجەیەك رەونەقی پێشووی دایەوە بە حکومەتی تورانشاه ی کوڕی. ئەگەر بە سەبەبی شیددەتیەوە تووشی عوصیانی لەشکری مەملوك نەبووایە، مومکین بوو خزمەتێکی گەورەی ئەم حکومەتە بکا، چونکە سەردارێکی مومتاز بوو.

فەعالیەتی سلاطینی ئەیوبی، تەنیا لە مەیدانی شەڕدا نەبوو، بەڵکو لە مەیدانی عیرفان و عومران و ئقتیصادیاتیشدا، ئاسارێکی گەورو بەناوبانگی بە جێهێشت. لەگەڵ ئوموری زراعەت و رێکخستنی ئوصوڵی ئەسقادا، زۆر خەریك بوون. لە زەمانی خۆیانا بۆ تەشویق و تەسهیلی ئیشوکاری تیجارەت، گەلێ موعاهەدەیان لەگەڵ حکوماتی ئەوروپادا کردوە.

ئۆردووی ئەیوبی دوو بەش بوو. لەشکری خاصە (مملوك)، لەشکری ئومەرای تابیعە، ئەم نەوعە تەشکیلاتە بە گوێرەی ئەو زەمانەوە. زۆر باش بوو، وە لەگەڵ واریداتی حکومەتدا، موتەناسیب بوو. لەشکری مەملوك، کە هەمووی عەبدی بە پارە کڕاو و تەربیە کراوبوو، بە فیکرێکی عەسکەری هێنرابوە وجود، لە ئیبتیدادا وەکوو لەشکری تورکی عەباسی و یەکیچری عوسمانی، زۆر باش بوو، وە گەلێ خزمەتی کرد، بەلام وەکو ئەمسالی، لە دەوری ضعفی حکوومەتدا بوو بە میقرۆبێکی موهلیك و نهایەت بونیەی حکوومەتی تووشی نەخۆشی إنقراض کرد.

دەوری سەڵتەنەتی ئەیوبی، بۆ عالەمی ئیسلام، بناغەیەکی بە قوەتی پێشکەوتنی دانا. لە هەموو لایەکەوە عولەماو موتەخەصیصینی مەشهوور، روویان کردە سەرای سلاطینی ئەیوبی و حورمەت و عیزەتێکی زۆریان دی. بۆ عیرفان و عومرانی مەملەکەت، زۆریان خزمەت کرد. ئوصولی ئیدارە، وە کرکردنەوەی رسومی حکومەت، هێنرایە ژێر قاعیدەیەکی مونتەزەمە. ئاداب و مەراسیمی سەرای حکومەت و عینوانی رەسمی، تەنزیم کرا. ئوصوڵی ئەمارەت (دەرەبەگی) لە مەملەکەتی ئەیوبی دا زۆر تەرەقی کرد. وە ئەم ئوصوڵە بە واسیتەی ئەهلی صەلیبەوە داخلی ئەورووپاش کرا. زۆر ئوصوڵ و مەراسیمی شوالیەی ئەوروپا لە ئەساسدا لە ئوصوڵی دەوری ئەیوبی، وەرگیراوە. مەسەلەن ئارمەی خانەدان لە $A$ و $B$ یەکانەوە ئیقتیباس کرابوو.

# پەراوێزەکان

( ١ ) ئەم مەسئەلەی (دوین)ە بەراستی موهیمە، لە داخلی مەنتیقەی هەولێریشدا شارێکی بەم ناوەوە هەبوو. بەینێك مەرکەزی حکوومەتی سۆران بوو. قۆڵێکی گەورەی عێلی (ئەزبەنی)ش لە دەوری ئەتاپکاندا، لەو ناوەدا بووە. رەنگە لە بەینی ئەم (دوین)ەو ئەم قۆڵی ئەزبەنیەو خێڵی شادیدا، موناسەبەتێك هەبێت. ئەم جیهەتە پێویستی بە تەدقیقێکی باشە، لەفزی (دوین) رەنگە کوردی بێ و مەعناکەشی قسەکردن یا پرسینە.

( ٢ ) ئەم ئەجدانکانە گوندێکی نزیکی دوین بووە (حیاه صلاح الدین الایوبی. ل ٥٧).

( ٣ )رەنگە شێخان بێ.

( ٤ ) صاحێبی کتێبی (حیاة صلاح الدین الایوبي) ئەڵێ ٥٢٠هـ (ل٦١).

( ٥ )ئینسیقلوپەدیای ئیسلام ٥٦٠هـ ئەڵێ.

(٦) مەجموعەی (کل شیء) لە نوسخەی ٢٦٩، وە لە تاریخی ١١ ی یۆلیە ١٣١٩ لەژێر عینوانی (صلاح الدین والامیره الافرنجیەدا، دەرحەق بەم موحاصەرەی کەرگە حیکایەتێکی نووسیوە و خولاصە ئەڵێ:

" لە تشرینی پانی ٥٧٩هـ دا، سوڵتان صەلاح ئەددین قەلای کەرگی تەچیق کرد. لەو بەینەدا هەمفروای چوارەم (کۆنت دی تۆرۆن) کچی ( کۆنت رینۆدی شاتلیۆن) ی مارە کردبوو. وە لە بورجێکی قەلاکەدا خەریکی شایی بوون. دایکی زاوا پرنسس (ئیتانات) ئیلجییەکی لەگەڵ بەعزێ پیاو ماقوڵ و دیاری دا ، نارد بۆ لای سوڵتان و کاغەزێکی بۆ نووسی و رجای کرد کە لەشەوی مەعلومدا ئەو بورجە ناراحەت نەکەن و تەرەفی ئیسلامیششایی قبووڵ بکەن، پرێسس لە کاغەزەکەیدا، خەتاب بە سوڵتان ئەڵێ ( لە وەقتێکدا لە قەصری ئێمە ئەسیر بووی وە دایمە منت ئەگرت بە باوەشەوەو ئەتگێڕام، لەبەر خاتری دۆستایەتی ئەو رۆژەمان شایی کوڕەکەم مەشێوێنە) واقیعەن سوڵتان

صەلاح ئەددینئەمیردایو مۆقەتی وازی لە تەچیق هێناو سولتان بە ئیمزای خۆی کاغەزێکی دڵنەوایی بۆ پرنسس نووسی و ناردی". بە گوێرەی ئەم مەعلوماتە وا حاڵی ئەبین کە سولتان لە وەقتی خۆیدا، ئەسیر بووەو مودەتێك بە دەس ( هومفروا)وە ماوەتەوە.

( ٧ ) مەرحوم ئیبراهیم ئەفەندی حەیدری، پێی گوتم کە قازی محێددین ئەم شیعرەی کرد بە موقەدیمەی خوتبەکەی:

الحمد لله الذي ذلت دولة الصليبي

وعز بالكردي دين مصطفى العربي

زۆر جێگەی ئەسەفە کە مەرحوم مەئخەزەکەی لە فیکر چووبووەوە، بەڵام لە صیحەتی ئەمەدا هیچ شوبهەی نەبوو.

( ٨ ) لە نەتیجەدا غەلەبە لە تەرەف سولتانەوە بوو، لە ئەهلی صەلیب ١٠،٠٠٠ کەسێك مەحوو بووە (تأريخ اسلام.ل ٣٨٢)

( ٩ ) سەیید ئەمیر عەلی لە جەڵدی دووەمینی (مصور تاريخ اسلام)یدا ئەڵێ، بە سەبەبی تەعەفوونی جەنازەی مەفتولین، (وە با) کەوتە ناو لەشکرەوەو سولتانیش بیلزات تووشی ئەو نەخۆشیە بوو، وە لەسەر تەوصیەی حوکەما ئۆردووی کێشایە (خروبە).

( ١٠ ) قەڕاڵی ئینگلیز و فرانسز، کە گەیشتە عەککا، تووشی نەخۆشی بوون. سولتان صەلاح ئەددین بۆ ئەم دوژمنە نەخۆشانەی، لە جەبەلی لوبنانەوە بەفرو میوەی ئەنارد ( مصور تاريخ اسلام).

( ١١ ) مەشهوور سیاح عبدالطيف، لە دوای موصاڵەحە لە قودس بە خزمەت سولتان صەلاح ئەددین گەیشتوەو ئەڵێ:

"ئەووەڵ شەو، کە چووە لای، لە ناو جەمعیەتێکی عولەمادا دیم و گوێی لە گفتوگۆی ئەوان ئەگرت و جارجارێکیشی ئیشتیراکی موناقەشەی ئەکرد. بۆ شورەی

قودس زۆر جار بەشانی خۆی بەردی ئەکێشا. هەموو رۆژێك لە رۆژهەڵاتەوە ئەهاتە سەر تەحکیمات و بە سەریانەوە ئەوێستا. بە شەویش لەگەڵ ئیشوکاری حکومەت خەریك بوو" (مصور تاریخ اسلام).

( ١٢ ) مصور تاریخی اسلام، ئەڵێ حەڕان و رەها و رقە، دراوە بە مەلیك ناصر، بەڵام بە گوێرەی وقوعاتی دوایی ئەمە راست نییە.

( ١٣ ) ئەم ملك عادل ئەبوبەكرە، تا ٦٤٥ هـ حەپس بوو، وە لەم تاریخەدا ئیعدام كرا.

( ١٤ ) ئەم شازادەیە لە وەقتی چوونی مەلیك صالح نەجم ئەددین ئەیوب بۆ نابلس‌و ئەسیر بوونی، كەوتەوە دەس ئەمیر ئیسماعیل.

( ١٥ ) قودسی شەریف لە دەوری بێهێزی خولەفای عەباسیدا دەس سەلجوقی كەوتبوو. خەلیفە موستەنصەری فاطیمی لە ٤٣٩ هـ دا لێی سەندۆتەوە، لە دواییدا لە ٤٩٢ دا كەوتە دەس فەرەنگ و حەوت رۆژ قەتڵ و عامیان تیا كرد و لە مسجد ئەلئەقصی دا ٩٠,٠٠٠ كەسێكیان كوشت. لە ٥٣٨ هـ دا كەوتە دەس سوڵتان صەلاح ئەددین.

(١٦) ئەم مەملوكانە، عەساكیری خاصەی سوڵتان نەجم ئەددین ئەیوب بوون و (مەملوكی بەحری)یان پێ ئەگوتن. هەموویان عەبدی بەپارە كڕاوی چەركەس بوون. لە قەد نیلداو لە جەزیرەی رەوچەدا قشڵەیەكی مەخصوصیان بوو. لە زەمانی سوڵتان مەملوك (قلاون)دا صنفێكی تری لەمانە ئیجاد كراو ناویان نرا (برجی)، چونكە لە برجەكانی ئیچ قەڵای (قاهیرە)دا بوون.

بەشی ئەووەڵی حكوومەتی ئەیوبی، لە ناو (    ) لە (٦٤٨ هـ تا ٧٩٢ هـ) سەڵتەنەتی لە میصر سوریەدا كرد. صنفی دووەمیش سەڵتەنەتی (مەملوكی بەحری)ی لەناوبرد، تا دەوری یاوەز دەوامی كرد. ( لە ٧٨٤ هـ تا ٩٢٢هـ).

( ١٧ ) صاحێبی مصور تاریخی اسلام، سەید ئەمیر محەمەد عەلی لە باتی (ئیبیك) (ئاغابك) ئەڵێ.

( ١٨ ) ئەم مەلیك ناصرە، لە فاطیمة خاتوونی کچی مەلیك کامل بوو.

## حکومەتی ئەیوبی:

بنیاتی ئەم حکومەتە نەتەوەی (کورد) لە کیشوەری میسر داینـاوە، لەدواییدا ولاتانی (یەمەن) و (سوریە) و (فەلەستین) و بەشی باشووری خۆرهەلات لە کوردستانی ئەنادۆڵیشی خراوەتە سەرو بووەتە یەکەمین دەوڵەتی گەورەی ئەو کاتە. مایەوە جەوهەری دەوڵەتەکە ئیسلامەتی و پشتیوانیش کورد و عەرەب بووە، کە فەرتەنەی ئەهلی صەلیب لە ئەوروپا روویدا ئەمانە وەك هار روویان کردووەتە خۆرهەلات، سوریەو فەلەستینیان پلیشاندەوە. وا رێکەوت لەو کاتەدا ئەم دوژمنە درندەیە وەستاون کەوتنە بزووتن، سەردارو ماقولانی کورد داوێنی مەردایەتیان کردووە بەلاداو ئیسلامەتیان زیندوو کردووەتەوە، ئەگینا لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە هەر ئەو کاتە کەیانی ئیسلامییەت لەناو ئەبرا، چونکە (ئەهی صەلیب) کوتو پڕ کە دەستیان وەشاند خەلیفەی ئیسلامی (قاهیرە)ش و عەباسی بەغداش کە پشت و پەنای ئیسلامیەت بوون دەستەوسان دانیشتوبوون. هیچ زیندوویەتێکیان نەنواند. بەڵکو هەر ئەتابوکی زەنگیی موسڵ و کوردەکان بەرامبەر ئەم دەستدرێژیە خۆیان نەگرتووەو بازووی مەردانەیان لێهەڵماییبوەو پڕیان داوەتە صەلیبیەکان تەفروتونایان کردوون و نەیانهێشتووە جێگیر ببن. جا ئەو سەردارە بۆ هاوتایە کە بەرەنگاری ئەم رووداوە بووە، سوڵتان (صەلاحەدینی ئەیوبی)ی کوردە، کە بناغەی دەوڵەتی ئەیوبی داناوەو لە مێژووی میللەتانی خۆرهەلات و خۆرئاوادا بە بزورگی ناوی نوسراوە.

## سەرگوزشتەی پەیدابوونی ئەم دەوڵەتە:

باپیرەی صەلاحەدین (شادی) کوڕی (مروان)ی ناوە. یەکێك بووە لە ماقولانی خێڵی روادی کە لکێکی گەورەی ئێلی (هازبەنی)یە لە ناوچەی هەولێردا دانیشتووی شاری (دوێن) بووە. وادیارە پیاوماقولانی ئەو ناوە خەیاڵی گەورەیان لەسەرا هەبووە، چونکە ناوبانگی حکومەتی (شەدادی)ی کورد کە لەو ناوەدا پەیدا ببو، هێشتا لەبیر

نەچووبێوە، وا زانراوە کە (شادی) لە بنەرەتا خەڵکی گوندی (ئەجدانکان) بووە، لەدواییدا لەگەڵ (أیوب) و (شێرکۆ) گۆڕانیا هاتوونەتە شاری (دوێن)، لەوێ بووەتە دۆستی (بهرۆز)ی رۆمی ناو پیاوماقوڵێکی سەلجوقییان، لەدواییدا ئەم کابرایە چووەتە بەغدا لەوێ دەستەڵاتی پەیدا کردووە، ئەوسا (شادی)ی بانگ کردووەتە لای خۆیی و کردوویە بە سەردارو ناردوویەتە (تکریت) کە بۆی ئیدارە بکات. لەدوای ماوەیەك شادی لەوێ مردووە، ئەمجا (نجم الدین أیوب)ی کوڕی دانراوە لەجێی، لەم بەینەدا (عماد الدین زنگی) ئەتابەگی موسڵ چووە بەگژ پادشای سەلجووقیداو (نجم الدین أیوب) کە میوانداری عماد الدینی کردووە حکومەتی بەغدای لێ زویر بووە، لەسەر ئەمە بە خاوو خێزانەوە (تکریت)یان جێ هێشتووەو چوونەتە موسڵ، ئەڵێن (سەلاحەدین) لەم کاتەدا لەدایك بووە (٥٣٢هـ — ١١٣٧م). عماد الدین بەرامبەر ئەم دوو برایە وێڵی نواندووە لەلای خۆی دایمەزراندوون و فەرمانی گەورەی پێ سپاردوون. جا (جەنگی صەلیب) کاتێك لەمەپێش هەڵگیرساوە لە (١٠٩٥م)دا، هێرشی لەشکری ئەورووپی مەسیحی بەناو خوێن و وێرانەدا خۆی گەیاندبووە خۆرهەڵات. سوریەو فەلەستینی عەرەبی داگیر کردووە. لەوێ لەسەر لاشەی موسڵمانەکان چەند حکومەتێکی بچوکیان پێکەوە ناوە. ملوك و ئومەرای عەرەبی موسڵ کەوتبوونە تەقەلای تۆڵەکردنەوە لە ئەهلی صەلیب و دەرکردنیان لە وڵاتی ئیسلام. عماد الدینی زەنگی ئەتا بەگی موسڵ کە (لەلە)ی شاهزادەکانی سەلجووق و بەڕەگەز تورك بوو لە باکووری عێراقدا حکومەتێکی بەهێزی پێکەوە نابوو، بووە سەرداری ئەم بیرە بەڕێزە یەعنی صەلیبیەکان بخرێنە بەحرەوە. جا ئەم شاسواری بەنرخە بە پێ‌و شوێنی ئەم خەیاڵەدا بە لەشکری کورد و عەرەبەوە رووی کردووەتە سوریە، شاری بەعلەبەگی داگیرکردووە. نجم الدین أیوبی کردووە بە حاکمی ئەوێ (٥٣٤هـ)، بەڵام کە عماد الدین مرد پشێوی کەوتە ناو کوڕەکانیانەوە. ئەوسا (دیمەشق)ییەکان ویستیان بەعلەبەگ بسێننەوە، لەسەر ئەمە نجم الدین ئایوب لە سەلیقەی سیاسیی خۆی لەگەڵ دیمەشقییەکان رێکەوت و چووە شام، لەوێ بووەتە

سەرکردەی سوپاکەیان. شێرکۆی براشی کە لە موسڵدا مابووەوە بە سایەی زرنگیی و زیرەکیی خۆیەوە لەوێ ببوەتە سەرداری سوپای سوڵتان (نورالدین)ی کوڕی عماد الدین کە ببوە جێنشینی باوکی. جا ئەم سوڵتان (نورالدین)ە لە باوکییەوە بیری بە گژ ئەهلی صەلیبا چوونی بە میرات بۆ بە جێما بوو، لە شەڕی دووەمی ئەهلی صەلیبدا (نجم الدین ایوب) زۆر بە مەردی شاری شامی لە هەڵمەت ی لەشکری صەلیب پارستووە، ئەم سەردارە ماقووڵە ئەیزانی تا شام و موصلّ یەك نەگرن هێزێکی وەها پەیدا نابێت بتوانێت بەرامبەری لەشکری صەلیب بوەستێت. لەبەرئەوە لەگەلّ (سوڵتان نورالدین)دا بیریان یەکی گرتووە. تووڕەی شام خراوەتە سەر حیمایەی (نورالدین)ەوە. نجم الدین خۆیشی بووە بە حاکمی دیمەشق و (شێرکۆ)ی برایشی بووەتە سەرداری سوپای ئەوێ.

## پێگەیشتنی میر سەلاحەدین:

سەلاحەدین بە منداڵیی لە خزمەت باوکیا گەورەبووە. تەمەنی هەرزەکاری لە بەعلەبەك و لە شام بە خوێندن و سورایگەریی رابواردووە. باوکی مامۆستای تایبەتی بە زانایانی وەخت بۆ راگرتووە، قورئان، صەرف و نەحو، عیلمی حەدیس، مێژوو و وێژەو ئینشای پێ فێرکراوە. زانینی فەقێیەتیشی خوێندووە، هەڕەتی جەهێڵێتی لە شاما رابواردووە. زیرەکیی و زرنگی و بڕشتی بیرو هۆشی هەر ئەودەمە دیاری داوە. سەلاحەدین ئەچووە بارەگای سوڵتان نورالدین، ناوبانگی زیرەکیی و ئەدەب و دینداریێتیی بلاوبووبووەوە. جوانێکی هۆشیار بووە. زۆرجار سوڵتان نورالدین یاری (گۆیین)ی لەگەلا ئەکرد. لە خزمەتی باوك و ماميا زۆرجار چووەتە جەنگ و شەڕ. سوارچاکێکی ئازاو لەبیر لە شکرگێرییدا سەر ئەفراز بووە. سوڵتان نورالدین حەیرانی زیرەکیی و بیرجوانیی ئەم قارەمانە بوو. لەم کاتەدا حکومەتی فاتیمی میسر ئێجگار کز ببوو. دووبەرەکیی و ناکۆکیی پیاوماقوڵانی حکوومەتەکەی خستبووە گێژو

لەناوچوون. سوڵتان نورالدین ئاگاداری ئەم کارەساتانە بوو. نجم الدین ایوب وەزیری نورالدین، اسد الدین شێرکۆش سەرداری سوپاکەی بوو. ئەمانە لە (نورالدین)یان گەیاندبوو ئەگەر میسر بکەوێتە ژێر دەسەلاتیان و حکومەتێکی بەهێزی تیا دانێ، ئەوسا ئەتوانن حکومەتەکانی ئەهلی صەلیبی سوریە بپێچن و لەناویان بەرن. جا کە (شاور) وەزیری خەلیفەی میسر داوای کۆمەکی لە سوڵتان نورالدین کرد، زانییان ئەو هەلەی کە ئەیانویست بۆیان هەڵکەوت. نورالدین خێرا شێرکۆی بە لەشکرەوە نارد بۆ میسر لە (٥٦٠ هـ – ١١٦٤م)دا، ئەمیر ( سەلاحەدین)یش بە سەرکردەیی قۆڵە سوپایەك لەم لەشکرەدا لە خزمەت مامیا بووە، چونکە مامی لە تێبینیی و تەدبیرو رای برازاکەی زۆر ئەمین بوو، تومەز (شاور) ئەم کۆمەکەی بۆ ئەوە ئەویست کە (چەرغام)ی ناحەزی لەناوبەرێت. جا شێرکۆ گەیشتە میسر، لە شەڕا شەرغام کوژراو لەشکرەکەی شکاو قاهیرە زەوتکرا.

لە دوای ئەمانە ئینجا شاور بۆ لەناوبردنی (شێرکۆ) کەوتووەتە تەقەلاو موئامەرەکردن. ئەمیر (سەلاحەدین) لەسەر فەرموودەی مامی هەندێك شاری میسری گرت. لەسەر ئەمە بە رەزامەندی هەردوو وەها رێککەوتوون کە هیچ کامێکیان سوپا نەنێرن بۆ سەر میسر. لەسەر ئەم بڕیارە لەشکری شێرکۆ میسری بەجێهێشت و گەڕایەوە شام. کەچی شاوری فێڵباز لە ژێرەوە لەگەڵ قەڕاڵی قودس دا رێکەوت کە بە دزییەوە سوپایەکی بچووك بنێرێت بۆ میسر.

ئەم سایەبانێتی (حمایە)ی سوپای صەلیبە لەسەر میصر بۆ حکومەتی شام زۆر خراپ بوو، لەبەرئەوە سوڵتان نورالدین لەگەڵ شێرکۆ بڕیاریان دا کە میسر بگرن و رەزامەندی خەلیفەی عەبباسی بەغداشیان جێبەجێ کرد. ئەوسا شێرکۆو سەلاحەدین بە لەشکری تازەوە چوونە سەر میسر. لەگەڵ سوپای صەلیبی قەڕاڵی قودس دا کەوتنە موبارەزەی جەنگ. لە سایەی ئیدارەو تەدبیرە جوانەکانی سەلاحەددین و ئازاییەکانییەوە لەشکری صەلیب زۆر خراپ شکا. لە دوای ئەم سەرکەوتنە لەشکری

شێرکۆ ئەمجارە (ئەسکەندەرییە)شی داگیر کرد.سەلاحەدینی کرد بە فەرمانڕەوای ئەم قەڵا گەورەیە. ئەمە سفتاحی حوکمڕانی سەلاحەدین بوو. لەشکری قودس بە یارمەتی شاور هێزی تازەی بۆ هات، ئەمجا چوونە سەر ئەسکەندەرییەو پێچایانەوەو لە دەریاشەوە ئەستۆلیان بۆ هات.

ئەمجا جەنگ قورس بوو، لەم شەڕانەدا ئەمیر سەلاحەدین قارەمانێتی نواندو ئەسکەندەرییەی پاراست. ئازایی و هۆشیارییەکی بێهاوتای نواند. شێرکۆ بە جیا تاوی داوەتە سەر قاهیرە. بەمانە ترس کەوتە دڵی دوژمنەوە، لە تاوانا داوای رێکەوتنیان کرد. ئەنجامی کار هەردوولا بە ئاشتیی لە میسر چوونە دەرەوە. کەچی ئەم ئاشتییەش درۆزنانە بوو. قەڕاڵی قودس لەگەڵ لەشکرا هاتەوە سەر میسرو شاری بەلبیسی گرت، کوشتارێکی زۆری لە خەڵکی شارەکە کرد. ئەمجا خەلیفەی فاتیمی پرچی ئافرەتی خۆی بە هاوار نامەیەکەوە نارد بۆ سوڵتا نورالدین، تکای یارمەتی لێکردووە. لەسەر ئەمە سێیەم جار لەشکری نورالدین بە سەرداری شێرکۆو سەلاحەدین هاتووەتە میسر، بڕیاری ئەمجارەیان بە تەواوی زەوتکردنی میسر بوو. قەڕاڵی قودس (ئەملەریك) کە ئەم هەڵمەتە کوتوپڕەی دی و زانی کە میسرییەکانیش دۆست و سوێند خواریانن، نەیتوانی بوەستێت بە سوپایەکەوە گەڕایەوە قودس (١١٦٩م — ٥٦٤هـ).

ئەوسا میسرییەکان لەگەڵ خەلیفەدا هاتن بە پیر لەشکری شامەوە شاوری دوودڵیشیان لەگەڵ بوو. کەچی لە دوای ئەمە شاور لە ژێرەوە خەریك بوو بە فێڵێکی ناپاکانە سەردارانی کورد لەناوبەرێت، هەموو کەس دڵپیسیی شاوری زانیبوو لەبەرئەوە بە فەرمانی (سەلاحەدین) لە کاتی ڕاوا گرتیان و ناردیان بۆ خەلیفەی (عاضد)، ئەویش فەرمانی دا کوشتیان. بەم تەرحە ئەم ناپاکە لەناوبرا کە لە پێناوی رقەبەریدا ئەیویست میسر بدات بە فەرەنگەکان. لە دوای ئەمە خەلیفە عاجد اسد الدین شێرکۆی کرد بە وەزیرو خەڵاتی کرد و ناوی نا مەلیك مەنصور (ئەمیری سوپا)، کەچی زۆری پێنەچوو شێرکۆ ئەمری خوای کرد لە (٥٦٤هـ — ١١٦٨م).

## وەزارەتی ئەمیر سەلاحەدین:

لە دوای مردنی مامی، ئەمیر سەلاحەدین لە جێی ئەو، کرا بە وەزیر، چونکە لەناو سەردارەکانا کەسی تر نەبوو ئەو شوێنە پڕبکاتەوە. خەلیفە ناوی (الملك الناصر المظفر صلاح الدین یوسف ابن ایوب). سوڵتان (نورالدین) یش کردی بە سوپا سالاری میسرو، مەلیك ناصر ئەوکاتە لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا بوو. لە دوای نواندنی کارامەیی و سیاسی و لەشکرگێڕی گەیشتووەتە ئەم پایە بەرزە. ئنیجا لە دوای ئەوە ناردی بەدوای باوك و کەسوکاریا بردنیە میسر. بە راستی سەلاحەددین لە سیاسەتا زۆر بالا بوو. لە ئیدارەی فەرمانی دەوڵەتا بە هەڵە نەئەچوو. پەلەی مەسڵەحەتی خۆی نەبوو. بۆ ئەوەی دڵی میسرییەکان خۆش بکات ئیشی چاکی بۆ ئەکردن. خۆی کە سوننی مەزهەب بوو دەسی لە فەرمانی مەزهەبی میسرییەکان نەدا کە شیعی مەزهەب بوون، تەنیا فەرمووی بە خوێندنەوەی ناوی (نورالدین) لە دوای ناوی خەلیفەی میسر لە خوتبەدا، ئەمەش سیاسەتێکی ماقووڵ و دڵسۆزانە بوو بەرامبەر گەورەی خۆی وەفای بەجێهێناو پاشەرۆژی خویندووەتەوە. لەم دەورەدا مەلیك ناصر لەشکری صەلیبی لە (دمیاط) دەرکرد وشاری (عەقەبە)شی زەوت کرد کە سەرەرێگای حەجاج بوو بۆ میسر. بەمانە پایەی ونرخی سەلاحەدین لای میسرییەکان زۆر بەرزبووەوەو ناوبانگی رۆیشت. سەلاحەدین بە چاوێکی وریا ناحەزەکانی خۆی ئەدۆزییەوە، لەناوی ئەبردن. لەشکری (سودانی) کە یاخیی ببوون تەفرو توونای کرد. بەوە وڵاتی نۆبەی بۆ (میسر) ساغ کردەوەو ئەمیر (عادل)ی باری کرد بە حاکمی ئەوێ بێینەوە سەر رەفتاری ئەهلی صەلیب کە وازیان لە میسر نەئەهێنا. دووبارەهاتنەوە سەر (دمیاط) بەلام هیچ خۆیان نەگرت شکان. ئەمجا مەلیك ناصر خۆی دەستی کرد بە پەلاماردانی فەلەستین، یەعنی جەنگی لە میسرەوە بردە ئەوێ. ئینجا گۆڕانی باری عەسکەری و سیاسی بەمجۆرە لای میسرییەکان شتێکی عاجباتی بوو، دەمێك بوو لە ترسی فەرەنگ خەڵکی میسر ئارامی نەبوو. بەلام دەستی پۆلاین و بلیمەتیی سەرداری کورد ژیاندبوونیەوە. ئەوسا

میسرییەکان بەدڵ و بە گیان تەسلیمی سەلاحەدین بوون. لە دوای ئەم سەرکەوتنە جوانانە ئەمجا سەلاحەدین دەستیکرد بە تەدبیرو رای فەرمانی سەربەخۆیی بۆ خۆی. ویستی مەزهەبی سوننیەتی بخاتە میسرەوە بۆ ئەم مەبەرستە دوو (حوجرە) یەعنی دوو (مەدرەسە)ی گەورەی ئایینی کردەوە یەکێکیان (ناصریە)و ئەوی تریان (کاملیە)ی ناونا. لەمانەدا بەرنامەی مەزهەبی شافیع بەجێ ئەهێنرا.

هەرچی (قاضی) شیعە هەبوو لە میسرا نەیهێشت لە جێی ئەوانە قازی (شافیعی)ی دانا! لە دوای ئەمانە ئینجا کۆمەڵێکی شوورای لە پیاوماقووڵ کۆکردەوەو پرسی پێکردن کە پێویستە خوتبە بەناوی خەلیفەی عەبباسی بخوێنرێتەوەو بۆ ئەمەش بڕیاری پێدان. بە کورتی: سەلاحەدین بۆ ئەمجۆرە ئالوگۆڕی سیاسی و ئیداریە قورسانە لە میسردا بیری خەڵکەکەی خووساندبوو. لەم کاتانەدا خەلیفە عاچد نەخۆش بوو سەلاحەدین نەیهێشت ئەمانە بیبەنەوەو وا رێکەوت لە پاش چەند رۆژێك خەلیفەشی بەسەرا مرد لە (٥٦٧هـ)دا کەچی سەلاحەدین ئەم مردنەی لا خۆشبوو، چونکە مردنی خەلیفە عاچد لەم کاتەدا بۆ راگرتنی مابەینی سوڵتان نورالدین و سەلاحەدین قازانجی نەبوو، بەڵکو دوودڵیی هێنایە پێشەوە، چونکە لە لایەکەوە سەلاحەدین وەزیری خەلیفە عاضد بوو، کەچی لەولاوە سوپای سالاری نورالدین بوو. مەلیك ناصر بۆ دڵخۆشکردنی میسرییەکان هەرچی گەنج و سامانی سارایی خەلیفەکانی فاتیمی هەبوو بەسەر پیاوماقووڵانی میسرا دابەشی کرد. نێرو مێ مرۆڤەکانی خانەدانی خەلیفەی لێك جیاکردەوە بۆ ئەوەی زاووزێیان تێکەڵ نەبێت (٥٦٧ هـ – ١١٧١م) لە دوای مردنی عاچد مەلیك ناصر بوو بە حوکمداری سەربەخۆی میسر. قاهیرەی بە قەڵا قایم کردو بە کۆشك و سەرا رازاندییەوە، بەڵام باری سیاسەتی لە خوتبەدا هیچ نەگۆڕی. ناوی سوڵتان نورالدین هەروەك جاران ئەخوێنرایەوەو سکەی پارەی میسر بەناوی ئەوەوە لێدرا، سەرەڕای ئەمانە دیارییەکی زۆر گرانبەهاشی بۆ نارد، سوڵتان سەلاحەدین ئەیویست تا نورالدین بمێنێت لانەدا لێی، بەڵام هیچ حەزیشی نەئەکرد بە

خزمەتی بگات لەبەر ئەوە هەمیشە خۆی لێ لائەدا. هەندێك سەردارو ماقوولانی کە حەزیان لە سەلاحەدین نەئەکرد. دڵی سولتان نورالدینیان لێ کرمێ کردبوو، وایان تێگیاندبوو کە سەلاحەدین لە سەودای سەربەخۆیی دایە، بەڵام سەلاحەدین قەت رێی نەداوە کە ناحەزیی لەوەوە داکەوێت. بەڵام هەرچی نورالدین بوو متمانەی نەمابوو، لە هەل ئەگەڕا کە بیکا بە بیانوو کە سەلاحەدین لە میسرا لابەرێت. ئەوەندە هەیە لە بێ تالیعی سولتان نورالدین لای (جزیرە)و هەمیشە ئاژاوەی بۆ پەیدا ئەبوو. لەبەرئەوە نەیپەرژاوە ئەم دوودڵییەی دەروونی خۆی لە تەك سەلاحەدینی بەوەفا ئاشکرا بکات. ئەوەندە هەیە کە سولتان نورالدین قاقەزی ئیتاعەت و تابیعیەتی لە سەلاحەدین وەرگرت. ئینجا فەرمانی دا کە بە لەشکری میسرەوە بچێت بۆ فەلەستین تا پێکەوە بچن (قودس) بگرن. بەڵام لە رێ سەلاحەدین باسی نەخۆشی باوکی بۆ هات، لەبەر ئەوە گەڕایەوە میسر. لەسەر ئەوە سولتان نورالدین زۆر زویر بوو، ویستی بە لەشکرەوە بچێتە سەر میسر داگیری بکاو سەلاحەدینیش عەزل بکات، بەڵام (ئەجەل) نەیهێشت لەو رۆژانەدا مرد (٥٦٩هـ – ١١٧٣م) لەم بەینەدا سولتان سەلاح ئەددین هیچ ئارامی نەبووە، خەریکی رێکخستنی میسر بوو، و تارەکاتی سوپایەکی گەورەی بەدستەوە بوو. هێشتا نورالدین نەمردبوو کە تا شاری (قابس) هەموو (تارابلوسی غەرب) و (تونس)ی داگیر کرد  لە باکووری ئەفریقیا. tووران شای براشی ناردووە بۆ یەمەن، ئەوێشی خستووەتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە. سەلاحەدین پشتی بە نەتەوەی (کورد) قایم بوو. تیپە سوپای قورسی لە (کورد)بوو. ئەوکاتەی وڵاتەکانی داگیر ئەکرد. قۆڵە لەشکری کورد لە سۆرانی و هەکاری و میرانی و حەمیدی و زەرزارییەکان پۆلی هەرە بە جەرنگ و بە کاری سوپای گەورەکەی بوون. سەرداری ئەم کۆمارانە وێنەی بەرزو بە شەوکەتی بارەگاکەی بوون. بە کورتی: سولتان سەلاحەدین دەوڵەتێکی بە دەستەڵاتی ئەو دەروەی پێکەوە نابوو، خۆشی پادشای بەکارو بە سامی ئەو دەوڵەتە بوو. لە دوای مردنی سولتان نورالدین هیچ قورتێك نەمابوو رێگای

سەربەخۆیی لە سولّتان سەلاحەدین بگرێت. رێکەوت وای هێنابوو حاکمیەتی خۆرهەلاّتو سەرداریێتیی سولّتان کەوتبووە عۆدەی سولّتان سەلاحەددینەوە، چونکە منالّەکانی سولّتان نورالدین و سیف الدینی حاکمی موصلّ و پادشای سەجلووقی رۆم هیچیان لەوانە نەبوون کە بتوانن لە رووی سەلاحەدیندا وەرگەڕێنەوە. پێویستە ئەوەی بزانرێت کە سەلاحەدین نەیئەویست لەگەلّ ئەم حاکمە موسلّمانانەدا یەك بگرێت تاکو حکومەتەکانی ئەهلی صەلیبی ئەو ناوە لەناوبەرێت. جا ئەم بیروباوەڕی شاهانەیە بنچینەی سیاسەتی لەمەودوای سولّتان سەلاحەدین بووە هەتا مردن لەسەر ئەوە رۆیشتووە، مەلیك صالّح إسماعیل کوڕی سولّتان نورالدین کە چووبووە سەر تەختی باوکی یانزە سالاّن بووە، لەبەرئەوە سەردارەکان و خزمەکانی کەوتبوونە سەودای سەربەخۆیی بۆ خۆیان. (سیف الدین) ی ئامۆزای ناوچەی موسلّ و جزیرەی بڕ دابوو بۆخۆی سولّتان سەلاحەدین لەسەر ئەم پاشاگەردانیە قاقەزی بۆ نوسین و لۆمەی کردن. کەچی ئەمیرەکان لەجیاتی گوێگرتن لە بەرامبەر سولّتانی کورد، لەگەلّ قەڕالّی فەڕەنگی قودسا یەکیانگرت، بەلاّم سەلاحەدین ئەیزانی باری دنیا بۆخۆی باشە چونکە لەگەلّ پشێوی ئیدارەی مەلیك صالّح إسماعیلدا منالّکاری قەڕالّی قودس تینی لە پەیمانەکەیانا نەهێشتبوو، جا سەلاحەدین بەبێ هەلّشەکردن لەلایەکەوە بۆ جەنگ تارەکانی ئەکردو لەولاشەوە قاقەزی ناکۆکی ماقولاّن و کارگێڕانی مەلیك صالّح وایکرد کە خەلّکی شام پەنا ببەن بۆ سەلاحەدین. بەم جۆرە ئاواتی سەلاحەدین بەجێهات. بۆ ئەم مەبەستە رەزامەندی خەلیفەی بەغدادیشی وەرگرت. لەدوای ئەمانە ئەمجا سەلاحەدین بەسوپاوە بە چۆلّی تەیهو فەلەستیندا تێپەڕیکرد گەیشتە شام (٥٧٠هـ). خەلّکی ئەم ولاّتە زۆر بە کەیفخۆشی بەپیریەوە چوون ، چونکە هەموو کەس هیوای بەو بوو کە ئیسلامیەت لەدەست فەرەنگ رزگار بکات، کە هاتە شام مالّێکی زۆری دەستکەوت، گشتی دابەشکرد بەسەر خەلّکا. سەلاحەدین بەهەموو جۆرێك وای ئەنواند کە بۆ رزگاری مەلیك صالّح هاتوونە ئەو ناوە. جا بەم تیژی بیرو زرنگیە تاق و تەرا

ئومەرا نەبێ هەموو خەڵکەکەی کردبوو بەدۆستی خۆی. لەدوای رێکخستنی ئیش و کاری شام بە سوپاوە رووی کردووەتە حەڵەب و حومص و حەمای گرت و شاری حەڵەبی پێچاوە، قەڵای حەڵەب زۆر قایم بوو، پێچانەکەی درێژەی کێشا، (کومەشتەکین)ی حاکمی حەڵەب کە مەلیك صالحی لەپەنادا بوو هەندێك فیدایی نارد کە سوڵتان سەلاحەدین بکوژن، بەڵام فیداییەکان گیران و خۆیان کوژران. دیسان بە فێڵ و دەلەسەی ئەم کابرایە مەلیك صالح لەگەڵ حاکمی فەرەنگی تەرابولس (ریمۆند) ناوا یەکی گرت و کۆمەکی لە حاکمی موسڵ (سیف الدین)ی ئامۆزاشی کرد. سەلاحەدین بۆ تارەکاتی گەورەتر گەڕابووەوە (شام)، کە دەنگی هاتنی سوپای دوژمنی بیست بۆئەوەی خوێن لەبەینا نەڕژێت داوای ئاشتی لێ کردن، بەڵام مەلیك صالح رێنەکەوت. لەسەر ئەوە لای شاری حەما شەڕێکی قورس قەوما. لەشکری سەلاحەدین سەرکەوت و دوژمن پەرێشان بوو تا حەڵەب راوی نان. جا لەوێدا هەموویانی پێچا، قۆڵی سیف الدین بەرەو موسڵ ویستی خۆی دەرباز بکات، بەڵام لەشکری سەرکەوتوو لەکۆڵی نەبووەوە، هەرچەند سیف الدین شەرێکی تریشی کرد کە دوژمن بوەستێنێت، بەڵام خراپتر شکا. دیل و تالانێکی زۆر دەستی لەشکری موسڵ کەوت و ئەو ناوچەیە بۆ سوڵتان سەلاحەدین ساغ بووەوە، ئەمجا بۆ زەوت کردن حەڵەب سەغڵەت کرا. لەسەر ئەمە بەهەندێك شەرت ئاشتی دروست کرا، هەر شاری حەڵەب و چواردەوری شارەکە بۆ مەلیك صالح مایەوە، ئیتر هەموو سوریە بە سوڵتان سەلاحەدین برا (٥٧٠هـ – ١١٧٤م). لەدوای ئەم ئاشتی یە سوڵتان گەڕایەوە شام، لەوێ خەڵاتی خەلیفەی عەباسی بۆهات. بەناوی خەلیفەدا ناوی مەلیك صالح هەڵگیراو بەناوی مەلیك (ناصر یوسف أیوب)ەوە ناوی سەلاحەدین لە جێیان دانرا. لەدوای ئەمانە هەرچی تالانێك هەبوو بەسەر سوپادا دابەش کرا.

## دەوری سەڵتەنەتی سەلاحەدین:

سوڵتان سەلاحەدین ئیشوکاری سوریەی دامەزراندو (تورانشا)ی برای کردە وەکیلی خۆی و لەگەڵ سوپاکەیا گەڕایەوە میسر، لەوێ قەڵاو شورەی قاهیرەی تەواو کرد. ئەمجا ئاڵای سوڵتان سەلاحەدین کە (هەڵۆ)یەکی سورە لەسەر زەمینی زەرد هەڵکرا ئێستەش لەسەر دیوارێکی ئەو قەڵایە رەسمی (ئاڵا)کە ماوە. لە دوای ئەمانە ئەمجا بە جێهێنانی فەرمانە گرنگەکە هاتە پێشەوە، ئەویش نەهێشتنی ئەهلی صەلیبە کە بڕیاردرا لە وڵاتی ئیسلام دەرکێن.

حکومەتە وردەڵەکانی صەلیبی سوریەو فەلەستین لە کردەوەکانی سوڵتان سەلاحەدین زۆر ترسابوون، ئەیانزانی ئەم پادشاهە شاسوارە بیری وایە کە ئەوان دەرکا و لەناویان بەرێت. لەبەرئەوە خۆیان ویستیان دەستپێشکەیی بکەن نەیەڵن موسڵمانەکان بحەسێنەوە. بۆیە لە دوای گەڕانەوەی سوڵتان سەلاحەدین بۆ میسر هەڵمەتیان بردە سەر شام و بەعلەبەك و ئەو ناوەیان وێران کرد و تاڵانەکەیان برد و زۆریشیان لە خەڵك کوشت یا بەدیل گرت. بە بۆنەی ئەم هاوارەوە سوڵتان پەلە پەلی کرد و بە سوپایەکی بچووکەوە لە (٥٧٣هـ - ١١٧٧م)دا هات، ئەیویست بێ شەڕکردن بچێتە شام، بەلام فەرەنگەکان لای رەملە رێیان لێگرت و عامبازی بوون، لەم جەنگەدا لەشکری میسر شکا. تۆزێکی مابوو سوڵتان خۆشی لەناوبچێت و گەلێك دیلیشیان دابوو بە دەستەوە کە ئەمیر عیسای (هەکاریی)شیان لەناوا بوو، تەنانەت لە دواییدا سوڵتان بە پارە کڕییەوە لە فەرنەگەکان. ئەمجا فەرەنگەکان لە سوریە کەوتنە دەستوەشاندن. موسوڵمانەکانیان زۆر تەنگەتاو کرد. لەسەر ئەمە سوڵتان سەلاحەدین لەگەڵ سوپایەکی ئەستوورترا لە میسرەوە هات بۆ سوریە. فەرەنگەکان کە ئەمەیان بیست ترسیان کەوتە دڵەوە، دەستیان کرد بە قایمکردنی سنوورەکانیان. لە دوای ئەمە ئەمیر فەڕوخ شای برازای سوڵتان لەشکرێکی قەڕاڵی قودسی شکاند، نەختێکی مابوو قەڕاڵی قودس بە دیل بگیرێت. ئیتر هەرای سوریە چووبووە تەحری شەڕی

ئایینییەوە. قەڕاڵی قودس بۆ تۆڵەسەندن بە لەشکرێکی زۆرەوە لە (برج العیون)دا جەنگێکی خوێنڕێژانە لەگەڵ سوپای سوڵتان سەلاحەدین کرد، بەلام خۆیان پەرێشان بوون. گەلێك حاکمی ناودارو پیاوماقووڵیان لێرەدا بەدیل گیرا (٥٧٥هـ – ١١٧٩م) لە دوای ئەمە قەڵای بەناوبانگی (بیت یعقوب) یش گیراو تێکومەکان درا. لەسەر ئەمە فەرەنگەکان زۆر ترسان و داوای ئاشتییەکی دوو ساڵەیان کرد لە سوڵتان و ئەویش قبوڵی کرد. سوڵتان ئەیویست موسڵمانەکان هەموو رێك بکەون تاکو بەهێز بین، ئەوسا بە ئاسانی ئەتوانن فەرەنگەکان ئەهلی صەلیب لەو ناوە دەرپەڕێنن.

لەبەر ئەمە سوڵتان بۆ پێکهێنانی ئەم نیازە موبارەکە لەم کاتەدا زۆر هەوڵ و تەقەلای داوە تا بەشێکی نیازەکەی بەجێهێناوە. لە لایەکی تریشەوە ئەیویست ئیشوکاری کوردەکان رێکخا. فەرمانی (جزیرە) و (بۆتان) ساغ بکاتەوە، چونکە هیوای گەورەی بە بازووە قەوییەکانی ئێرە بوو. ئەیزانی بناغەی شەوکەتی دەوڵەتەکەی بەمان ئەستوور ئەبێت، لەبەرئەوەی کە ئەمان لە گیان و خوێنی خۆی بوون. بەرەکەتدا تەقەلای سوڵتان بە خۆڕایی نەچوو. گەلێك ئومەرای ئیسلام سەریان بۆ سوڵتان دانەواندو شوێن نییەتە بەرزەکەی کەوتن.دوو ساڵ پەیمانیان لەگەلا کرد لە (٥٧٥ هـ – ١١٨٠م)دا. حاکمەکانی موسڵ و جزیرەو هەولێر و حسن کێف و ماردێن و سوڵتانی رۆم و قەڕاڵی ئەرمەن تێکەڵاوی ئەم پەیمانە بوون کە تا دوو ساڵ شەڕ لەگەڵ یەك نەکەن. بەمجۆرە لەناو موسڵمانەکاندا جەنگ بۆ دوو ساڵ وەستا. جا لە رووی ئەم سەرکەوتنانەوە ناوبانگی گەورەیی سوڵتان بەناو وڵاتانی گوێ (دەریای رەش)و (خەلیجی فارس) و (دەریای سپی)دا بلاوبووەوە. توانای بەکارهێنانی زۆربەی هێزی ئیسلامەتی بەرامبەر بە فەرەنگ پەیدا کرد. ئەوسا سوڵتان سەلاح الدین فەڕوخ شای برازای بەسەر شامەوە بەجێهێشت و لە (٥٧٦هـ)دا بە دڵێکی خۆشەوە گەڕایەوە میسر. لەم کاتەدا حاکمی فەرەنگی (کەرگ)بە پێچەوانەی مەرجی ئاشتی کاروانێکی ئیسلامەکانی رووت کردەوە. سوڵتان لەمە زۆر رقی هەڵسا. جگە لەمە سەرکردەکانی

سوریەو جزیرەش هەندێك ئاڵوگۆڕیان تێکەوتبوو شیرازەی ئیدارەکەیان تێکدابوو. سەرۆکە تازە قەلاکان و فەرەنگەکان خەریکی ناحەزیکردن بوون لە دژی سوڵتان لەسەر ئەمانە (شاهسواری) ئیسلامیش بە تارەکاتی لەشکرگەرییەو خۆی ئەخلافاندو چاوەڕوانی تەواوبوونی ماوەی ئاشتییەکەی ئەکرد. کە ماوەی ئاشتی تەواو بوو، بە سوپایەکی پڕ تارەکانی گرانەوە سوڵتان لە میسرەوە بەرەو سوریە کەوتووەتە ڕێ. (تاج الملوك بوری)برای بە بارگرانیی سوپاکەیەوە پێشەکی ناردی بۆ شام، خۆی و لەشکرەکەشی بەدەم تالانکردنی وڵاتی فەرەنگەکانەوە لە (٥٧٨هـ - ١١٨٢م) گەیشتە شام.

لەگەڵ فەرەنگەکانا ڕێگای ئاشتی نەمابوو. کاتی بەجێهێنانی ئاواتی لەناوبردنی ئەم بێگانە ئایین دوژمنانە هاتبوو.لەبەر ئەوە وردە وردە دەستیکرد بە شپرزەکردنی فەرەنگەکان. شاری (بیسان)ی داگیر کرد. لەشکرێکی تری نارد، لە وشکانی و لە دەریاوە (بێرووت)یان پێچا خۆشی چوو بۆ سەمتی جەزیرە لەوێ سنجاری گرت. تیپە لەشکری کوردی ئەو ناوەی شوێن خۆی خست و چوو (دیاربەکر)یشی گرت و گەڕایەوە (حەلەب)یشی خستە ژێر دەستی خۆیەوە (٥٧٩هـ - ١١٨٢م). بە تەمای ئەوەی فەرەنگەکان لەناوبەرێت، ئیسلامی ئەوکاتە ئەمجۆرە کردەوانەی سەلاحەدینیان زۆر لە لا خۆش بوو کەس نەیئەتوانی سەرپێچی بکات. عالەمی ئیسلامی ئەو حەلە سەلاحەدینی بە سەرداری هەرە گەورەی خۆی دانابوو، تەنیا موسڵ نەبێ ئیتر گشت وڵاتانی جەزیرەو سوریەو لەفەستینی ئیسلامی لەژێر فەرمانیا بوو. تەنیا هەر مەراقێکی مابوو ئەویش دەرکردنی فەرەنگەکان بوو. فەرنگەکان چونکە ئەیانزانی سەلاحەدین خەریکی چییە, لە تاوا ئەوانیش ئارامیان نەمابوو. کەوتبوونە تەقەلای دوژمنایەتی لەگەڵ ئیسلامەکانا. بۆیە لە هەموو لایەکەوە ئاگری جەنگ بڵێسەی دابوو. پۆل پۆل بە لەشکرەوە ئەهاتنە سەر وڵاتی ئیسلام، تالانیان ئەکرد و ئەیانسووتاند. تەنانەت جارێکیان حاکمی (کەرگ) تۆزێکی مابوو شاری (مەدینەی مونەوەرە) زەوت

بکا. سوڵتانیش لەشکری ئەنارده سەر گاورەکان زۆر شپرزەی ئەکردن. لەسەر ئەمانە فەرنگەکان داوای ئاشتییان کردو سوڵتانیش قەبووڵی کرد، چونکە لەو کاتەدا حاکمی موسڵ کە لە لای خۆی ئیسلام بوو لەباتی یارمەتیدان ئاژاوەی ئەنایەوەو هەرای ئەخستە کوردستانەوە. جا لەبەر ئەوە سوڵتان چارەی نەما ویستی جارێ ناوچەی کوردستان ساغ بکاتەوە، بۆیە داوای ئاشتی فەرەنگەکانی لە گوێ گرت. حاکمی موسڵ کە ئەمەی دی ترسا. ویستی رێك بکەوێ، بەڵام سیاسەتی سوڵتان بە جۆرێکی تر بوو، ئەیویست دەوڵەتێکی ئیسلامیی بەرزی بە چنگ پێکەوە بنێت. دەوری بڵند و بەرزی ئیسلامەتی جارانی بژێنێتەوە. لەبەر ئەوە بەمجۆرە رێکەوتنە سووکانە (بەڵێن) نەئەبوو. بۆیە بە سوپاوە چووە سەر موسڵ، دەورەی شارەکەی پێچاو لەشکری نارد (میافارقین)یشی داگیر کرد، کەچی لە بەخت چاکی حاکمی موسڵ لەم کاتەدا سوڵتان تووشی نەخۆشی بوو (١١٨٥م — ٥٨١ھ) سوڵتان چارەی نەما گەڕایەوە (حەڕان)، لەبەر ئەم تەگەرانە ئیتر سوڵتان لەسەر سزاکردنی حاکمی موسڵ نەرۆیشت، بە شەرتەکانی لای خواروو ڕازی بوو، دەستی لێهەلگرت، وەکو: کوردستانەکەی باکووری موسڵ و جەزیرە بۆ سوڵتان مایەوەو حاکمی موسڵ رازی بوو کە بەناوی سەلاحەدینەوە خوتبە بخوێنێ، هەر بەناوی ئەوەوە سکەی پارەش لێبدات. بەمجۆرە فەرمانی ئەو ناوە بڕایەوەو سەرداری ئیسلامیش گەڕایەوە شام (٥٨٢ھ — ١١٨٦م).

## سوڵتان سەلاحەدین و ئەهلی صەلیب:

سوڵتان کە ئیشوکاری سوریەو جزیرەی بڕییەوەو ئاگری ناکۆکی ئومەراکانی کوژاندەوەو کردنی بە فەرمانبەری خۆی، بۆی گونجا کە هێزە پەرش و بڵاوەکەی ئیسلام بۆ ئاواتە بەرزەکەی بەکاربهێنێ، کە ئەمانە جاران لە بەربەرکانی ناوخۆدا خەرج ئەکار. سوڵتان ئیسلام ئەمجا بە تەواوی بڕیاری دا کە شاری قودس بگرێت و ئەهلی صەلیب لە فەلەستین دەرپەڕێنێت. ئەمجا بڕوای بەهێزی خۆی کرد کە دەتوانێ

ئـەم ئەرکـە قورسـە هەرچـۆنێك بێـت بـە جێبێنـێ. لـەناو سـەردارەکانی فەرەنگـدا فەلەستینیان بەدەستەوە بوو. ئەوکاتـە نـاکۆکی و دووبـەرەکی ئەوەنـدە قـایم بـوو بۆ ئەوە ئەشیا کە موسڵمانەکان موترسییان لێ نەکەن. حاکمی تـەرابلوس کـە (ریمۆنـد)ی ناو بوو، ئەیویست حوکم بکا بەسەر قودسا و بۆ ئەم مەبەستە کابرا داوای کۆمـەکی لـە سـوڵتان کـرد. لەسـەر ئەمەشـا سـوڵتان نەیئەویـست لـە پـێش تـەواوبوونی مـاوەی پەیمانەکادا لەلای خۆیەوە ئاشتیی بـشکێنرێت. خـواو ڕاسـتان ئـەم کـردەوە ناشـیرینە فەرەنگـەکان خۆیـان کردیـان. ئـەمجارەش حـاکمی (کـەرك) کـە نـاوی (رنۆڵـە) بـوو کاروانێکی گەورەی ئیسلامی داماڵی، هەموو شتومەکەکانی بـردن و کاروانچییەکانیـشی بە دیـل گـرت و توخـونی ئاینیـشیان کـەوتن. سـوڵتان کـە ئـەم هـاوارەی بـۆ هـات زۆر سەغڵەت بوو، سوێندی خوارد کە ئەگەر رینۆڵدی دەستکەوێ بەدەستی خۆی بیکوژێ. جا لەسەر ئەمە بانگی (جیهاد)یدا بۆ سەر فەرەنگەکان.

سوڵتان لە ئاقار شاری (بوسرا) بارەکای هەڵدا، لە هەموو لایەکەوە لەشکر ئـەهات و کۆبوورەوە فەرەنگەکان ئەمەیان دی هەموو ئاشـتبوونەوەو یـەککگیر بـوون. سـوڵتان لـە بارەگادا شـوورای جـەنگی بەسـت. لـە هـەموو لایـەوە پیاومـاقوولی ئیـسلام ئـەهاتن و مەجلیسیان ئەگرت. لێرەدا بڕیـاری شـەڕ درا لەسـەر فەرەنگـەکان کـە هـەتا هەناسـەی دوایـی بـە گژیانا بـچن. ئـەمجا لـە بـەردەمی سـوڵتاندا سـوپای ئیـسلام تیـپ تیـپ بـە ئیستیعراز رۆیشتن (٥٨٣هـ – ١١٨٧م).

بۆ بەیانی لەشکری سوڵتان بەرەو دوژمن دەستیکرد بە بزووتن، قەڵای (تەبریە)یـان پێچا لەولاوە فەرەنگەکانیش خۆیان ئامادە کردبوو لەشکرێکی زۆریان گرد کردبـووەوە ئەوسا لەگەڵ لەشکری سوڵتانا شەڕێکی مێژوویی دەسـتی پـێ کـرد لەبـەر (حطـین)دا. ئەو رۆژە دوژمن لە تینوانا پڕووکەی تێکەوت. رۆژی دوایی شەڕەکە دەستی پێکردەوە لەشـکری سـوڵتان بـە هەڵمـەتی شـێرانە دوژمنـی شـکاند و تـەفروتووناى کـردن. جا شکستی (حطـین) بناغـەی رووخـانی حکومەتـەکانی لـەرەنگی فەلەستینە (دارعاسـای

پیرۆزی صەلیب) لەناو تالآنا دەست سوپای ئیسلام کەوتووەو ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی صەلیب بە دیل گیراوە.

مەلیکی قودس و براکەی حاکمی کەرك و گەلێك لە ئەمیر و ماقوولانی تر لەناو دیلەکانا بوون. سولتان لە پاش ئەوەی لە رووی ئومەراکانی فەرەنگدا کردەوە ناشیرینەکانی حاکمی کەرکی هێنایە پێش چاوی، بە دەستی خۆی کوشتی، وە فەرمانی بە کوشتنی هەندێك خراپەکاری تریش دا لە گاورەکان.

لەدوای ئەوە دیلەکانی تری بە قەدرو بە شیرینی ناردەوە بۆ شام واتە (دیمەشق) لەمەولا لەشکری سولتان پێی نایە فەلەستینەوە. فەرەنگەکان هێزیان تیا نەمابوو کە بەرامبەری بوەستن کردەوەی جوان دەریارەی ئەم لێقەوماوانە ئەکرا. زۆری پێ نەچوو (عەکا) کەوت و تالآنێکی زۆر دەست ئیسلام کەوت.

ئیتر وردە وردە شارەکانی قەراغ دەریا ئەگیران. بەلآم شاری (صور)کە لەسەر جزیرەیەك بوو نەگیرا. کە پێویست بوو داگیر بکرایە، چونکە ئەم نەگرتنە بۆ دوارۆژ خراپەی هێنا بەسەر ئیسلامەکانا، ئەوەبوو لە دواییدا کە جەنگی صەلیبی سێهەم پەیدابوو ئێرە بوو بە شوێنێکی (ستراتیجی) بۆ سوپای فەرەنگ، کردیان بە مەڵبەندی ئارامگرتن و بزووتنی لەشرکەکانیان.

سولتان ئەمجارە رووی کردە (عەسقەلان) بە زۆر گرتی. ئیتر (غەززە، رەملە، خەلیل رەحمان، بەیت لەحم)و گەلێك جێگای تری گرت، ئەم هەموو داگیرکارییە لە دوو مانگدا تەواوبووە کە سەرکەوتنێکی وا بە نرخ بۆ هەموو پادشایەك نەلواوە. ئەمجا رێگای (قودس)بۆ لەشکری ئیسلام کرابووەوە.

سولتان ئەیویست بەبێ زیان ئێرە بگرێت نەك شارەکە تووشی رووخان بێت. بە بیری ئینسانیەت کاریی دەستەیەك پیاوماقووڵی نارد بۆ شاری (قودس)عەرەب لە چەند رۆژێکا پڵنگ ئاسایی شورەی شارەکەیان دڕی، فەرەنگەکان کە تێگەیشتن بە کوشت ئەچن کەوتنە ئامان خواستن، ئەمجا تەسلیم بوون.

ئەو حەلە مەجلیس گیرا. لە دوای گفتوگۆ بەو مەرجەی لە ماوەی چل ڕۆژا فەرەنگەکان بە سەربەستی لە شارەکە بڕۆن و بۆ هەر پیاوە (١٠) دینارو بۆ ژن (٥) دینار و بۆ منالٚ (٢) دینار سەرانەی ڕزگاری بدەن هەردوولا ڕێکەوتن و گفتیشیان دا کە جارێکی تر شەڕنەکەن. جا بەم قەول و بڕییە شاری قودس تەسلیمی سولٚتان بووە. ئەو ڕۆژەی سوپای ئیسلام چووەتە شاری قودسەوە قازی شام (محی الدین) کوڕی (زکی) ناو کە بە فەرموودەی سولٚتان هاتبووە ئەویٚ خوتبەیەکی شادیی داوە بۆ ئەو عەشامە کە لەویٚ ڕاوەستاوە لە سەرەتای خوتبەکەیا ئەم شیعرەی فەرمووە:

الحمد لله: ذلنا دولة الصلب وعز بالكرد دين مصطفى العرب

ئەم گاورانە لە شاری قودس دەرچوون و ئیتر لە وڵاتی ئیسلاما نەئەمان تیپ تیپ بە بەردەمی بارەگای سولٚتانا تێپەڕ ئەبوون. لەم دەرچوونەدا سولٚتان فەرموودەی ئەو سەرداره قەشەکان تا توانیویانە شتومەکی خۆیان ببەن. مێژوونووسی گاورکان لە نووسینەکانیاندا لەم ڕووەوە زۆر مەردانە ڕاستیان وتووە لە پیاوەتی سولٚتان سەلاح الدین زۆر قسەیان کردووەو لەناو ئەوانا ناوبانگی زیاتر ڕۆیشتووە کە چی بەرامبەر بەمە کرداری گاورەکان دەربارەی موسڵمانەکان هەمیشە خراپەکردن بووە. سولٚتان نزیک مانگێك لە قودسا ماوەتەوە ئیشوکاری ئەوێی ڕێکخستووە، مزگەوتەکانی ژیاندووەتەوەو قوتابخانەکانی دامەزراندووەتەوە. لە دوای ئەمانە سولٚتان بە لەشکرەوە چووەتە سرە صوور لە بەرو دەریاوە پێچاویەتی، بەلام چاری نەکرا وازی لێهێناوە. بەمجۆرە گاورەکان بۆیان لوا لە م قەلایەدا گردببنەوەو بۆ شەڕێکی تازە خۆ کۆبکەنەوە. لەولاوە ناوبانگی سەندنەوەی قودس لە لایەن موسڵمانەکانەوە کە گەیشتە ئەوروپا ئاگری تەعەصبیان دووبارە بلێسەی سەندەوە، هەموویان بە جارێك بۆ تۆڵە کردنەوە هەڵسانە سەرپیٚ، دراوێکی زۆریان کۆکردەوە ناویان نا (سەرانەی سەلاحەدین)و لەشکرێکی بێدادیان پێکەوە ناو لە هەموو لایەکەوە بەرەو خۆرهەلات هاتن بۆ فەلەستین. ئەمجارە پادشاکانیان سەردار لەشکر بوون. ئیمپەراتۆری ئەڵمان و

مەلیکی ئینگلیز کە (ریچارد شێردڵ) یان پێ ئەگوت و مەلیکی فەرەنسا و گەلێك ئەمیری ناودار هاورێی هاتنی ئەمجارە بوون! سوڵتان گەڕایەوە شام، چونکە ئەیزانی گاورەکان دێنەوە سەری. لەوێ دەستی کرد بە تارەکانی سوپاگەری. لە (صوور) بەولاوە هەرچی قەڵای نەگیراوی فەلەستین مابوو گشتی زەوت کرد. لە دوای ئەمانە ئەمجا پێشایی لەشکری صەلیبی سێیەم دەستیکرد بە هاتن، لە (٥٨٥ﻫ)دا.

جۆری سوپاگەریی سوڵتان گۆڕابوو، لە پرکێشییەوە کەوتبووە قایمکاریی.

باری گەردوون وای ئەگەیاند کە فەرتەنەیەکی خوێنرێژیی گەورە ئەبێت. ئەو فەرەنگانەی کە بەرەڵا ببون زۆربەیان لە صورو لە تەرابلوسدا بە پێچەوانەی قەول و پەیمانەکەیان چەکیان هەلگرتبووەوە. ئەمان هاتن دەوری قەڵای (عەکا)یان دا، سوڵتان بە لەشکرەوە هات بۆ یارمەتی قەڵاکە. ئەم پێچانە دوو ساڵ درێژ بووەوە. سوڵتان ئەیتوانی دوژمن بشکێنێ و عەکا رزگار بکات، لێرەشا دووبارە کەمتەرخەمی کرایەوە. لەبەر ئەمە کۆمەکەکانی دوژمن هەمیشە بە ئاسانی ئەهات و لە عەکادا شەڕی خوێنرێژانە ئەکرا گەلێجار هێرشی لەشکری سوڵتان فەرەنگەکانی بە پاشا شکاندووەو کۆمەك چووەتە عەکاوە بۆ ئیسلامەکان، بەلام لەسەر ئەمەشا دوژمن نەبەزیوە، دووبارە شارەکەی پێچاوەتەوەو قەڵای تازەیان بە دەوریا ئەکردەوە. زاتیان وەها زۆر ببوو ئەمجا ئەوان پەلاماری لەشکری سوڵتانیان ئەدا باری ڕەزم ئارایی بڵاوەی بە هێزی ئیسلام کردبوو. تیپێك لەشکر بەرامبەر (انتاکیە) وەستابوو، تیپێکی تریش لە تەرابلوسی شام بوو. لەشکرێکیش بۆ پاراستنی (دمیاگ) و (ئەسکەندەریە) لە میسر بوو. لەشکری گەورەی لە (حزروبە)دا دووراو دوور بۆ یارمەتی (عکا) زستانی رائەبوارد. سوڵتان لە نەبەزیی دوژمن و سستیی و خۆ لەشەڕ پاراستنی سەردارەکانی خۆی مەترسی دوارۆژی کەوتبووە دڵەوە. لە تاوا بۆ کۆمەك بە هەموو لایەکا نووسراوی ئەنارد. دوژمنیش لە دەوری عەککا زستانەکەی بە تارەکات کردین رابوارد. لە (٥٨٦ﻫ)دا جەنگ داگیرسایەوە. ئوستۆلی میسر ئوستۆڵەکەی دوژمنی شکاند و

کۆمەکی گەیاندە عەککا. لەم کاتەدا بەرایی لەشکری ئەڵمان دەیشتە ئەدەنەو وا ڕێکەوت لەوێ ئیمپراتۆرەکەیان لە ئاوا خنکا.

سوڵتان کە ئەمەی بیست بە هیوای کۆمەك ناردن قاقەزی بۆ پادشاکانی ئیسلام نارد. کەچی هیچیان بە دەنگییەوە نەهاتن. بەمجۆرە ئەم قارەمانی کورد و پشتیوانی ئیسلامە بەرامبەر بە لێشاوی ئەهلی صەلیب بە هیوای یارمەتی خواو بازووی مەردانەی خۆی مایەوە. لەم بەینەدا هەندێك لەشکری ئەڵمانی گەیشتبووە فەلەستین. ئەو حەلە دوژمن قۆڵێکی خەریکی پێچان بوو، قۆڵەکەی تری پەلاماری سوپای سوڵتانی دا (٥٨٦هـ – ١١٩٠م) لە هەڵمەتی سەرەتاییدا ئیسلامەکان شکاون و هەندێکیان تەرە بوون. بەلام ئەوی خۆی گرتبوو نەشکابوو، ئەمانە وەکو شێر خۆیان داوە بە دوژمناو شەق و پەقیان کردوون، مەیدانی جەنگ بە لاشەی کوژراو داپۆشرابوو، دوژمن بەمە چاوی شکا، لەولاوە لەشکری ناو عەککاش دەستی خۆی وەشاند و هەندێك قەلای دوژمنی سوتاند. دووبارە لەشکرێکی تازە لە دەریاوە گەیشت بە فریای فەرەنگەکاندا. ئەمانە ئینگلیز بوون لای عەککا دابەزین. سوڵتان کە ئەمەی دی گەڕایەوە (حزوربە) ئەو کاتە صەلیبەکان بە دڵێکی قایم دەستیان کرد بە هێرشکردن بۆ سەر قەلاکانی عەککا. سوپای پێچراوی ناو قەلا مەردانە شەڕی ئەکرد. زات و زۆری میر (حسان الدین)ی سورداری، قەلای دوژمنی حەیرانی سەرسام کردبوو، سوپای ناو قەلاکە تەنگەتاو ئەبوون پەلاماری قولەکانی دوژمنیان ئەداو ئەیان سووتان. وە تاویان ئەدایە سەر دوژمن و ئەیانگەڕاندنەوە بە پاشدا. کۆمەکی ئەهلی صەلیب دوایی نەئەهات. لە دەریاوە وەك هەڵقوڵێت هەمیشە لە هاتندا بوو.

قەڕاڵی فەرەنسا (فیلیپ ئۆگۆست)یش لە (٥٨٧هـ) دا بە لەشکرێکی زۆرەوە گەیشتە بەردەمی عەککا زۆری پێنەچوو قەڕاڵی ئینگلیزیش لەگەڵ دوایی لەشکرەکەیدا گەیشتن و لە دەریا هاتنە دەرەوە ئەهلی صەلیب ئەوەندە زۆر بوو سامیان لێ ئەکرا. لەم بەینەدا هەندێك کۆمەکیش بۆ سوڵتان هاتبوو، لەسەر (ئەوەشا) نەیئەتوانی

یارمەتی (عەککا) بدات. دوژمن لەبەرو لە دەریاوە شارەکەی ئێجگار تەنگەتاو کردبوو، برسێتیو نەخۆشیی لە لایەکەوەو ئاگری مەنجەنیقی دوژمن لە لایەکی ترەوە هێزی خۆگرتنی لە شەرکەرەکانی ناو قەلادا نەهێشتبوو. ئەم قەلا پڕ شان و شەرەفی ئیسلامە دوو ساڵ بۆ خۆی لەبەر هەڵمەتی صەلیبەکاندا گرتبوو، بە هیچ جۆرێ و لە هیچ لەیەکەوە کۆمەکی نەئەگەیشتێ بە راستی کەڵکی خۆگرتن نەمابوو لە قەلاکەدا . لەبەر ئەوە بە ناچاری لە هاوینی ساڵی (٥٨٧ هـ – ١١٩١م) دا بە هەندێك شەرت و مەرج قەلاکە خۆیدا بە دەستەوە. یەکێك لەو مەرجانە ئەوەبوو کە دیل ناکوژرێت. بەلام لەولاوە لە فەرەنگەکاندا هیچ هۆشی ئینسانییەت نەمابوو، چەکدارو بێچەك وەك جانەوەر هەموو خەڵکی شارەکەیان کوشت. لەم خوێنخوارییەدا قەراڵەکانی ئینگلیز و فەرنسایش بەشداربوون لە مێژوودا دەنگ وا بلاوە لەم فەلاکەتەدا ٦٠ هەزار موسڵمان لە ناوچووە. هێشتا عەککا نەگیرابوو کە بەرەبەرەکانێ و ناکۆکی کەوتبووە ناو سەردارەکانی فەرەنگەوە.

قەراڵی فەرەنسە و قەراڵی ئینگلیز ناخۆشییان بوو. لەسەر قسەی رەقی مەلیکی ئینگلیز مەلیکی فەرەنسە تۆراو لە دوای کەوتنی عەککا فەلەستینی بەجێهێشت. بەکورتی ناکۆکیی و تێکچوونی ئەمانە هێزو پەرۆشی فەرەنگەکانی سست کردبوو کە ئەمە بە کەڵکی ئیسلام هات.

لەمەولا سوڵتان لەگەڵ دوژمندا کەوتە جەنگی چەتە گەرییەوە. دوورو نزیك کێشەی پێئەکردن. هەرچی لە سوپای صەلیب جیابووایەتەوە لەناوی ئەبردن. تەنانەت جارێکیان وەختبوو (ریچارد)ی مەلیکی ئینگلیز بە دیل بگرێت. مەبەستیش لەمە ئەوەبوو کە فەرەنگەکان بێزار ببن و فەلەستین بە جێهێڵن. جا (ریچارد شێردڵ) زۆر چاك تێگەیشتبوو کە سوڵتان سەلاح ئەددین لە تین ناکەوێت و بە درێژەی جەنگ بەیدەست ناکرێت. لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەم دوژمنە گەورەیەی لەسەر جەنگ رۆیشتن کەڵکی نییە. جا چ ئەم پەروایەو چ ئارەزووی گەرانەوە بۆ بەریتانیا بە ئەنجام ریچاردی

هێنایە سەر ئەوە کە داوای ئاشتیخوازیی لە سوڵتان بکات! هەرچەند هیچ شتێك نەبوو کۆڵ بە سوڵتان بدان، بەڵام بۆ ئەوەی ڕێی خوێنڕشتن نەمێنێ و لەبەر دوورئەندێشیی تر، سوڵتان قبوڵکردنی داوای ئاشتیی بە باش زانی. ئینجا (مەلیك عادل)ی برای سوڵتان و (ریچارد) بۆ گفتوگۆی ئاشتیی یەکتریان بینی. لە دوای گەلێك هاتوو چۆ وەها ڕێکەوتن کە (ریچارد) خوشکی خۆی بدات بە مەلیك عادل و خاکی فەلەستینی فەرەنگیش بە ناوی جیازییەوە بدرێت بە خوشکەکەی و سوڵتانیش قودس بدات بە مەلیك عادل، بەڵام قەشەکان بەمجۆرە ڕێکەتنە رازی نەبوون. لەم بەینەدا سوڵتان خەریکی هەندێك فەرمان بوو کە ئەگەر هاتوو جەنگ گەڕایەوە، ڕێگای هەڵسووڕان لە دوژمن بگیرێت. لەبەر ئەوە ناردی (عەسقەلان) و (ڕەملە)و گەلێك جێگای تریان وێران کرد تاکو دوژمن لەو ناوەدا نەتوانێت بحەوێتەوە.

لەم کاتەدا هەندێك دەنگوباسی خراپی ناو بەریتانیا لە فەلەستین بلاوبووەوە، ئەمە لە لایەکەوە، لەو لاشەوە بەربەرەکانی سوڵتانیش لە فەلەستین هیچ هیوای لە فەرنەگەکاندا نەهێشتبوو. لەبەر ئەمانە مەلیکی ئینگلیز دووبارە تەنگەتاو بووەتەوە. مەترسیی شکان و نەگرتنەوەی قودس هیوای ریزاردی هیچ نەهێشت وڵات هەمووی وێران بوو. ئەم ڕووداوانە ئومەراکانی صەلیبشی بە تەواوی بێزار کرد. لەبەر ئەمانە (کۆگایەکی حەربی) گیرا لەوێدا بڕیاریان دا کە واز لە قودس بێنن و بچنە سەر میسر. ئەمجا ریچارد بەناوی ئەهلی صەلیبەوە داوای ئاشتی لە سوڵتان کرد لەسەر ئەوە لە ڕەملە مەجلیس گیرا.

لە دوای گفتوگرکردن ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە (یافە)ش بەدەست ئەهلی صەلیبەوە بمێنێت. جا بەوجۆرە هەردوو لا جاڕی ئاشتییان دا لە ڕەملە لە (١١٩٢م – ٥٨٨ھ)دا. ئەمە بوو ئەنجامی سێیەم سەفەری ئەهلی صەلیب. ئەم چەند صەد هەزار فیداییە کە بۆ گرتنی قودس هاتبووە فەلەستین و ئەیویست خوێنی هەموو ئیسلامی خۆرهەڵات بڕژێنێت. کەچی بەرامبەر نەبەزیی و تێکۆشەری بە جەرگی وەك سوڵتان

سەلاح ئەددن هیچی پێنەکراوە. تەنیا دوای لەناوچوونی دووبەشی ئەم هۆردووە کینە لە دڵە، دوو شاری گوێ بەحریان بە دەستەوە ماوە، بەشی سێهەمیشی کە گیانی رزگاربووە بە سایەی (گەمیی)یەکانیانەوە خۆیان دەربازکردو گەڕانەوە ئەورووپا. جا قارەمانی کورد و ئیسلام لە دای جەنگ وەشاندنێکی پێنج ساڵە لەگەڵ لێشاوی دەمبەخوێنی ئەورووپاییان، بە شان و شەرەف گەڕاوەتەوە (قودس)و دەستی کردووە بە رێکخستنی فەرمانی وڵاتەکە. ئەوی رووخابوو تازەی کردەوە. مەکتەب و نەخۆشخانەی تازەشی دروستکردو، بە ناوچەکانی وڵاتدا گەڕاوە چووەتە بەیرووت و لەوێشەوە چووە شام. کەچی داخی گرانم ئیتر نەحەسایەوە دوای فەرماندان بۆ ئاواکردنەوەی جێگا وێرانەکان نەخۆش کەوت.

## مردنی سوڵتان:

سوڵتان پێنج شەش ساڵ لەگەڵ فەرنەگەکاندا بێئارام لە جەنگدا بووە. ئەم ئەرکە دووردرێژە شپرزەی کردبوو.لەسەر ئەوەشدا مشووری فەقیرو هەژاری ئەخوارد و مەشرووعی بۆ ئەدۆزینەوە کە لە برسییەتی رزگاریان بکات. جا بەم ئەرکە تازانە وەك لای سەرەوە وتمان نەخۆش کەوت. ئەمجارە زۆر نەژیا لە (٥٨٩هـ – ١١٩٣م)دا لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا ئەمری خوای بەجێهێنا.

مردنی سوڵتان سەلاحەدین بەبێ ریا عالەمی خستووەتە گریان. بە راستی زۆربەی ئەمجۆرە پیاوە بەرزانە لە ناکاوو بێوەخت لەناو ئەچن. بە مردنی کوتوپڕی سەلاحەدینو بە تایبەتی نەتەوەی کورد زیانێکی بێدادیان لێکەوتووە، هەموو کەسێك ئەیسەلمێنێ کە سەلاحەدین نەبوایە ئەهلی صەلیب، کەیانی ئیسلامەتی لەناوبردبوو. لە ئیسلامەکان زیاتر خەڵکی ئەورووپا کە دوژمنی ئەون هونەرو خزمەتەکانی سەلاحەدین ئەژمێرن و پەسەندی ئەکەن. هەموویان بە یەك زمان ئەڵێن ئەم شاسوارە بلیمەتە بوو نەیهێشت هیوای فەرەنگەکان بێتە جێ. سەرەڕای ئازاییەکانی کە لە رۆژی

شەڕا ئەینواند. بە رەوشتیش نموونەی کەرەم و وێنەی خولقی جوان و سەرچاوەی مەرحەمەت و دڵسۆزیی بووە. لە دوای مردنی بە سێ ساڵ بە فەرمانی مەلیك ئەفزەڵی کوڕی نزیك مزگەوتی (ئەمەوی) گۆڕێکی تازە دروستکراوە ئەمجا ئێسکی (سوڵتانی نەمر) گواستراوەتەوە ئەوێ، لەوێ ناشتوویانە کەوا مەرقەدەکەی ئێستایەتی لە شاری شام (دیمەشق) سەلاحەدین ١٧ کوڕو کچی بووە.

## ئەوصافی سەلاحەدین:

مەدح و سەنای جوانیی سەلاحەدین تەواو نابێت! بەکورتی یەکێکە لە پیاوە هەرە گەورەکانی مێژوو لە کاتی شەڕدا بەرامبەر دوژمن توند و بێئامان بوو، بەلام لە کاتی ئاشتییدا بۆ رەعیەت دڵسۆزو بۆ داماوو لێقەوماو بە مەرحەمەت، لە سیاسەتدا دووربین‌و کارئاشنا بووە. ناجەزی زۆردارو پیاوخراپ و خزمەتگوزاری بە دڵ و گیانی ئیسلامەتییەت بووە، بەڵکو لەتەك دوژمنیشدا لە چاکەکردن دوانەکەوتووە. کاتێك کە قەراڵەکانی ئینگلیز و فەرەنسا بە دوژمنایەتی هاتبوونە سەری، کە بیستی نەخۆشن دوختەرو دەرمانی بۆ ناردوون. لە لایەکی ترەوە پشتیوانی زانست و زانین و زانا بووە. لە ئیشوکاری دەوڵەتیدا بێ موشاوەرەکردن فەرمانی نەکردووە. ئەنجوومەنی زانستیی‌و شوورای ناوخۆیی ئیدارەو کۆگای راو تەدبیو رەزم و جەنگی جیاجیا بووە، هیچ دەعیەی نەبووە. لەگەڵ فەقیرو هەژاردا بێپەرواو زۆر بە سەربەستی ئەدوا. حەزی لە دەبدەبەو دارا نەئەکرد. کە کۆچی دنیای کرد پارەو پوول و زەوی و زاری بەجێنەهێشت. قیبتیەکانی میسر نیگار (رەسم)ی سەلاحەدینیان لە تەنیشت کاسەی موقەددەسی دینی خۆیان داناوە لە کڵێسەدا لەسەرەمەرگدا فەرموویەتی، کە مردم بۆ ئەوەی لە رۆژی قیامەتدا شاهیدی غەزاکانم بێت، شمشێرەکەم لەگەڵ خۆمدا بنێژن.

خزمەتی بۆ ئاوەدانی: گەورەیی سوڵتان سەلاحەدین هەر ئەوە نییە کە لە شەڕدا قارەمانێکی نەبەزو ئازاو بەتین بووە. بەڵکو لە فەرمانڕەوایشدا زۆرزان و سیاسی

بووەو، لەگەڵ ئەمانەدا وڵاتەکەشی بە بینای جوان ئاواکردووەتەوە. لە هەموو لایەکی میسردا گەلێك بینای دروستکردووە بۆ قوتابخانە. لەوانە ئێستاش هەندێکیان ماوە بەناوی دیوانی ئوستۆڵەوە بینایەکی شاهانەی پێکهێناوەو هەر لە میسردا دوو بینای بەرزی بۆ نەخۆشخانە دروستکردووە بۆ میللەت. لە (شام)یشدا نەخۆشخانە کراوەتەوەو گەلێك مەدرەستەشی تیا کراوەتەوە. ئەوەندە هەیە لەبەر درێژەی جەنگو رەزمی دوابڕاوی ئەهلی صەلیب لەمانە زیاتر نەیپەرژاوە لەسەر ئاواکردنەوەی هەموو ناوچەکانی کیشوەرەگەورەکەی بڕوات.

## لە دوای مردنی سوڵتان:

سوڵتان سەلاحەدین کە کۆچی دوایی کرد، کەسی نەکرد بە جێنشینی خۆی، کوڕو خزمەکانی هەریەکە فەرمانڕەوای شوێنێك بوون. (الملك الافضل)ی کوڕی، حاکمی فەلەستین و سوریە بوو. (الملك العزیز عثمان)ی کوڕیشی حاکمی میسر بوو. تورەی حەڵەبیش (الملك الظاهر)ی کوڕی لەسەر بوو (مەلیك عادل)ی برایشی بەشێکی جەزیرەی بە دەستەوە بوو. کوڕانی (شێکرۆ)ی مامیشی لە (حمص) جێگیر ببوون. وڵاتی یەمەنیش درابوو بە کوڕانی (سیف الاسلام تەفتەگین)ی برای. کە سوڵتان مرد، هەرکەس لە جێگەی خۆی مایەوە تا ساڵێك، فەرمانڕەوایی مەلیك ئەفزەڵیان بەجێهێنا.

## تێکچوونی ئیدارە:

بە مێژوو ساغ بووەتەوە هەتا میللەتێك تێنەکەوێت، رژێمی ئەم میللەتە لە خۆیەوە ناگۆڕێت.

باری حکومەتانیش بەو پێیە بەبێ رووداو لە خۆیەوە تێکناچێت. جا حکومەتی ئەیوبییش ئەوسا (لەسەر) ئەو پێودانگە رۆیشتووە، چونکە ئەوکاتە لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا رژێمی (دەرەبەگێتی) باوبووە. هەر کە سەلاحەدین مرد، کوڕان و براو

برازاکانی تورەکانی لە خۆیانا کەوتوونە سەودای سەربەخۆیی و شیرازەی حکومەت گەورەکەیان تێکاوە کە خاوەنەکەی بەو هەموو تەقەلاو خوێنی جگەرە دروستی کردبوو. مەلیک ئەفزەڵی کوڕە گەورەی سوڵتان بەناو (مەتبوع) بوو لە لایەن هەموویانەوە، بەلام چونکە ئیدارەکەی رێکوپێك نەبوو براکانی لێی زیز بوون. (مەلیک عەزیز) لە میسر بانگی سەربەخۆیی بۆ خۆی دا (٥٩٠هـ — ١١٩٣م) و بە لەشکرەوە هاتە سەر سوریە. (مەلیک عادل)ی مامیان کە تێفکریی لە رووی بێهونەریی لە رووی بێهونەریی برازاکانیەوە خەریکە رەنجی سوڵتان سەلاحەدینی برای بە باد بچێ و حکومەتی ئەیوبی نشوست بێنێت، ویستی ئیدارەی کیشوەرەکە بگرێتە دەستی خۆی. لەبەرئەوە کەوتە نێوانی برازاکانیەوە. جارجار ئەیکردن بە گژ یەکداو لە دواییدا ئاشتی ئەکردنەوە. بەینێك چووە (میسر)و بووە پشتیوانی مەلیك عەزیز و پێکەوە لە (٥٩٢هـ)دا سوریەیان زەوت کرد، بەناوی میسرەوە، ئەمجا مەلیک عادل خۆی فەرمانڕەوایی سوریەی گرتە دەست. ئەگەر چی ئەمە بە پیشەی خزمایەتی شتێکی ناشیرین بوو، بەلام لەو دەورە تووشەی ئەهلی صەلیبەدا پێویست بوو فەرمانڕەوایەکی بە چنگ و سەردارێکی دنیادیدە لەسەر کیشوەری ئەیوبیی بێت. جا لەبەر ئەم قازانجی گشتییە کردەوەکانی مەلیك عادل بە دەستدرێژی نەژمێرراوە. وا رێکەوت لە مێژووی (٥٩٥هـ)دا مەلیك عەزیز مرد. کوڕێکی بچوکی هەبوو کرا بە مەلیکی میسر و مەلکی ئەفزەڵی مامیشی کرا بە نوێنەر (نائب)ی ئەم پادشاهە بچکۆلەیە. بەلام مەلیك عادل کە ناکۆکی سەردارەکانی میسری بیست بە لەشکرەوە چووە سەریان، میسری گرت و خۆی بوو بە مەلیك و مەلیك ئەفچەلی دەرکرد و لە (٥٩٦هـ — ١٢٠٠م) دا ئیتر مەلیك عادل بە تەواوی حکومەتی ئەیوبی خستبووە ژێر دەستی خۆیەوە. مەلیك ظاهیر کە حاکمی حەڵەب بوو، مەلیك ئەفزەڵیش کە لەم دواییەدا قەلای (سەرخەد)ی درابوویە لەو ناوچەیەدا بەشتێکی نرخداری ئەوتۆ نەئەژمێرران.

## پادشایەتی مەلیك عادل:

لە دوای ئەم ئەنجامانە مەلیك عادل کوڕەکانی خۆی کردووەتە فەرمانڕەوا (حاکم)ی ناوچەکان و ئەوسا دەستیکردووە بە فەرمانڕەوایی گشتی کیشوەرەکە. ئیدارە مەلیك عادل لەسەر پێوانگی سوڵتان سەلاحەدین ڕۆیشتووە. لە دەوری فەرمانڕەوایی، واتە حوکمداری مەلیك عادل دا هەرای صەلیبەکان ئەوەندە بەهێز نەبووە، ئەگەرچی لەم چەرخەدا جەنگی چوارەمی صەلیبییان هەلگیرساندووە، بەلام سوپای صەلیبییەکان ئەمجارە نەگەیشتووەتە سوریەن، بەڵکو لە ڕێگادا شاری (ئەستەمبووڵ)یان گرتووە، جارێ لەوێ نەترازاون. لەسەر ئەوەشدا لە دواییدا فەرەنگەکان لە سوریەدا (بێرووت)یان هەر داگیر کردووە. مەلیك عادلیش (یافا)ی لێسەندوونەتەوە. ئەم پادشایە لە ڕواڵەتدا لەبەر خزمایەتی لە ژێرەوە، لەبەر سیاسەت دەستی نەبردووە بۆ مافی مەلیك ظاهیری برازای، بەلام لە (٦١٣هـ)دا کە ئەم برازایەی مرد ناوچەی حەڵەب کە موڵکی ئەو بوو داگیرکراو ئەوەندەی پێنەچوو

(مەلیك ئەفزەڵی)یش بە کڵۆڵی مرد. بەمجۆرە کوڕەکانی قارەمانی گەورەی ئیسلام دوایی بە فەرمانڕەواییان هات، ئیتر لە ڕووی ئیدارەی مەلیك عادلدا هیچ قۆرتێك نەما.

لەم دواییەدا شەڕی پێنجەم و شەشەمی صەلیب یەك لە دوای یەك دەستی پێکردووەو ئەوروپاییەکان هاتوونەتە ئەو ناوەو کەناری دەریای (عەکا)یان وەك بەلا وێرانکردووە لەوێوە چوونەتە سەر میسر شاری (دمیاط)یان پێچاوە.

مەلیك عادل ئەم کاتانە لە سوریە بوو، بە تاڵووکە سوپایەکی پێکەوەنا ، کە بگا بە فریای میسردا، بەلام مردن مۆڵەتی نەدا نزیك شاری شام لە شوێنێکدا مرد لە (٦١٥هـ – ١٢١٨م)دا. مەلیك عادل فەرمانڕەوایەکی گەورە بوو، نەیهێشت فەرمانڕەوایی ئەیوبییەکان لەناو بچێت، خۆی لە بەردەستی کاکیدا گەورە ببوو. لە شەڕدا بە جەرگو لە سیاسەتدا زۆر دووربین و وریا بووە، لەگەڵ مەلیکی ئینگلیز (ریچارد شێردڵ) دا

هەمیشە نووسراویان ئەنارد بۆ یەك. لە سكەی پارەدا ناوی (عینوان) (ابو الفداو)ی بۆ خۆی دانابوو.

## دەوری فەرمانڕەوایی مەلیك كامل:

لەدوای مردنی مەلیك عادل مەلیك كاملی كوڕی بووەتە فەرمانڕەوای میسر، ئەوسا مەلیك (معظم عیسی)ی برای فەرمانڕەوایی سوریەو مەلیك ئەشرەفی براشی حوكمداری ناوچەی حەڵەب بوو. ئەهلی صەلیب وازیان لە میسر نەئەهێنا. چونكە زانیبوویان تتاكو میسر نەگرن فەلەستینیان بۆ ساغ نابێتەوە. بەو هۆیەوە لەشكرەكانیان كە تاوی دابووە سەر میسر شاری (دمیاط)یان ساڵ و نیوێك زۆر بە تەندی پێچاوەو لە دوای كوشتارێكی زۆر گرتوویانەو خوێنخۆرانە شەڕكەور شەڕنەكەر گشت خەڵكەكەیان كوشتووە. هەرچەندە لە براكانیەوە كۆمەك هاتووە بۆ مەلیك كامل دیسان لەشكری ئیسلام بەربەستی دوژمنیان پێنەكراوە، تا گەیشتوونەتە بەردەم قاهیرە. مەلیك كامل ئەیویست بە شەرتێك ئەهلی صەلیب لە میسر دەرچن، فەلەستینیان بداتێ. كەچی ئەوان رازی نەئەبوون. خواوڕاستان وا رێكەوت لەو كاتەدا رووباری (نیل) زۆر هەڵسا جا بە فەرموودەی مەلیك كامیل بەندو بناوانی نیلیان سەرەپا تێك شكاندووە لەسەر ئەوە لافاو زەوی و زاری دەلتای داگیر كردووە. ئاو پشتی سوپای صەلیبییەكانی گرت. ئیتر خواردەمەنییان نەئەگەیشتێ ولە لایەكی تریشەوە سوپای ئیسلام كەوتە چەتەگەری لێیان. لەسەر ئەوە فەرەگەكان تەنگەتاو بوون و بە ئاشتی رازیبوون و لە میسر دەرچوون.

لە دوای بڕانەوەی ئەم جەنگانەی ئەهلی صەلیب و كوڕەكانی مەلیك عادل ئەمجا بەگژیەكداچوون. بەڵام لەم كاتەدا مەلیك عیسا بەسەریا مرد. لەسەر ئەوە دوو براكەی تر رێكەوتن و كیشوەرەكەیان بەشكرد. ناوچەی سوریەو شام بەر مەلیك ئەشرەف كەوت و میسریش بۆ مەلیك كامل مایەوە لە (٦٢٦هـ — ١٢٢٨م)دا مەلیك كامل هەرێمی

جزیرەو بۆتانیشی بۆ خۆی هێتبووەوە بۆ پاشە رۆژ. لەم کاتەدا بوو کە کیشوەری ئیسلام تووشی فەرتەنەی (مەغۆل) بوو، پێویستە لێرەدا پێشڕەویێك بۆ ئەم رووداوە بنووسین. لەو کاتەدا خوارەزم شاهەکان دەوڵەتێکی ئیسلامیی زۆر بەهێزیان پێکەوە نابوو لە تورکمانستان بە لەشکرو سوپای خۆیانەوە ئەنازین و هەر لە مکاتەشدا لە خۆرهەلاتی خوارەزمدا جەنگیزخان پەیدابووەو دەولەتێکی عالەمی زۆر بەشەوکەتی هێناوەتە کایەوە.

خوارەزمییەکان بێئەوەی لە هێز و توانای جەنگیزخان بگەن بەبێ حیساب چوون بە گژ مەغۆلەکاندا. لەسەر ئەوە سوپای مەغۆل وەك لافاو رووی کردووەتە ولاتی ئیسلام. خوارەزم هە زوو لەناوچوون. ئەمجا هەموو کیشوەری ئیسلام بوو بە پێخوست لەژێر پێی لەشکری مەغۆلدا. جا بۆ بەربەستکردنی هێرشی سوپاکانی مەغۆل و خوارەزم مەلیك کامل چووەتە (جزیرە - میزۆپۆتامیا) کاروباری ئەو ناوەی بە پەلەپەل رێکخستووەو مەلیك (نجم الدین)ی کوڕە گەورەی کردووەتە حاکمی ئەو ناوە. ئەمیشی لە دواییدا کە لەشکری خوارەزمیان بێخاوەن مانەوەو هاتنە ئەو ناوە بووە سەرکردەیان و ئەمجا بۆ بەربەستی لافاوی مەغۆل هەموو لایەك کەوتوونە هەوڵ و تەقەلا. بە راستی ئەو رۆژانە رۆژی رەشی ئیسلام بووە.

لە لایەکەوە مەغۆلەکان کیشوەرە جوانەکەی ئیسلامیان ژێرەوزەبەر ئەکرد و لەم لاشەوە فەردریك ئیمپراتووری ئەلمانی لەم کاتە قەلبەدا بە لەشکری صەلیبی شەشەوە روی کردبووە میسرو سوریە و سەرزەمینەکانی ئەشیلاو ولاتی ویران ئەکرد. مەلیك کامیل دەمێك بوو لەگەلیدا خەریکی گفتوگۆی ئاشتی بوو. بەرەکەتدا لە (٦٢٦هـ - ١٢٢٩م)دا هەردوولا رێکەوتن. بەپێی پەیمانی تازە ناوچەی قودس و لە (عەکا)وە تا (یافا) پارچەیەك لە کەناری دەریا درا بە فەردریك بەو مەرجەی هەتا ١٠سالی تر شەڕ نەکرێت، پەیمانیان کرد. بە کورتی ئیمپەراتوور ئەیویست بگەڕێتەوە بۆ ئەورووپا، بۆیە بە هەموو مەرجێك رازی ئەبوو.

جا لە دوای ئەمە سەلجووقی و رۆم و ئەیوبییەکان بە بێسوود سەردەمێك شەڕیان کرد، زۆری پێنەچوو مەلیك کامل و مەلیك ئەشرەفیش بەگژ یەکداهاتن، بەلام لە کاتێکدا کە سوپای مەلیك کامل هاتو سوریەوە، مەلیك ئەشرەف مرد. ئەوسا بەبێ شەڕ شام کەوتە دەست مەلیك کامل لە دوای ئەمە زۆری پێنەچوو مەلیك کاملیش لە چاری شام (دیمەشق) کۆچی دوایی کرد لە (٦٢٥هـ – ١٢٣٨م)دا. مردنی ئەم پادشایە سەرەتای نوشستی دەوڵەتی ئەیوبییە بوو. مەلیك کامل پادشایەکی زۆرداروو لە سیاسەتدا وریا بووە. بۆ پێشخستنی فەرمانی کشتوکاڵ لە میسردا زۆر خەریك بووە، لەمەولا وڵات رووی کردووەتە ئاوابوونەوە، قەڵای قاهیرە ئەم تەواوی کردووە. جا نالەباری زەمانە بوو، قودسی پێدا بە ئیمپەراتووری ئەڵەمانی. ئەگینا مەلیك کامل پادشایەکی ئەوەندە بێکارەو بێکەڵك نەبووە. کاتەکە زۆر کاتێکی بە ئاشووب و پڕ فەلاکەتیی بوو، لەبەر هەراو لێشاوی فیتنەی (مەغۆل)ەکان و چەتوونیی براو کەسەکانی خۆی بوو کەهەمیشە ئەیانویست ئاژاوە بنێنەوە.

## مەلیك عادل دووەم:

لە دوای مردنی مەلیك عادل، مەجلیسی ماقووڵان بەڵێنی دا کە شازادە عادل لە جێگای باوکی مەلیك عادلی دووەمەوە ببێتە مەلیکی دەوڵەتی ئەیوبی. ماقووڵان ئەم هەڵبژاردنەیان بۆ قازانجی خۆیان کردبوو، چونکە مەلیك کامل بێکارە بوو، پادشایەتی هی (نجم الدین)ی بار گەورەی بوو کەلەو کاتدا حاکمی جەزیرە بوو، خەریکی جەنگ بوو لەگەڵ حاکمی موسڵ دوتای ئاشتبوونەوەی خوارەزمییەکان کە ئەو حاکمی موسڵە هانی دابوون. ئازادە نجم الدین حاکمەکەی شکاندو چووە سەر دیاربەکرو لەوێ سوڵتانی رۆمیشی شکاند. ئەمجا شازادەی ئازا کەوتە بیری سەندنەوەی تەخت و تاجی باوکی کە بەهی خۆی ئەزانی. لە ساڵی (٦٣٦هـ)دا شازادە (تووران شاه)ی کوڕی بەسەر جەزیرەوە بەجێهێشت و خۆی بە لەشکرەوە رووی کردە سوریەو (شام)ی گرت.

لـە دوای ئـەوە لەگـەڵ (مـیرداود)ی ئامۆزایـا کـە حـاکمی (کـەرەك)بـوو کەوتنـە دووبەرەکیی. ئەوەندە هەیە سەردارەکانی مەلیك نجم الـدین لـەم کـەین و بەینـەدا لێـی یاخی بوون. ئەمیر داود لەم هەلەدا هەڵی کوتایە سەر (نابولس) کە مـەلیك نجم الـدینی لێبوو، شارەکەی داگیر کرد و مەلیك (نجم الدین) ی بە دیل گرت.

لە دوای ئەم ڕووداوە ئەستێرەی میرداود ڕووی کردووەتە درەوشـانەوە، دوای ئەمـە ئەنجا میر داود لەشکری هەڵگرت و چووە شـاری قودسـی لـە فەرەنگـەکان سـەندەوە، بەڵام بەختی مەلیك نجم الدین چاکی هێنا، مـیرداود لەگـەڵ مـەلیك عـادلو ئومـەراکانی تردا ڕێك نەکەوت. لەسەر ئەوە میرداود مەلیك نجم الدینی هێناو لەگەڵیدا ڕێکـەوت. بـە پێـی پـەیمانێك کـە کردیـان میـسر درا بـە مـەلیك نجـم الـدین و ناوچـەکانی سـوریەو فەلەستینیش بەر میرداود کەوت. کە مەلیك عادل ئەمەی بیست بە لەشکرەوە لە میـسر هەڵـسا ویـستی بێـت ئـەم یەککرتووانـە لـە ناوبـەرێت. کەچـی دەسـتەی لەشـکری مەملووکەکانی خۆی لێ یاخی بوون و لە پادشایەتییان خست و لـە بەندیخانەشـان قـایم کرد. جا پادشایەتی مەلیك (عادل)ی دووەم بەمجۆرە کۆتایی هات (٦٣٧هـ – ١٢٤٠م).

## مەلیك ساڵح نەجمەدین ئەیوب:

وەکو لای سەرەوە وتمان لەشکری یاخیی کە مەلیك عادلی لە پادشـایەتی خـستبوو، لە جێی ئەو مەلیك نەجمەدینیان هەڵبژاردو بانگیان کردە میسر و کردیانە حوکمدار.

ئەم پادشایە لە شاهزادیدا وەك لە سەرەوە دیمـا زۆرئـازارو ناسـۆری دیـوە.لـەکاتی باوکیدا تووشی بوختانی باوەژنی بووەو لەسەر ئەوە دوورخراوەتەوە لـە میـسر. بـەڵام لەم دواییـەدا بـەخت باشـی بـۆ هێنـاو بووبـە حوکمـدار. خەلیفـەی بەغـدایش فـەرمانی پادشایی بۆ ناردو چووە سەر تەختی میسر. بەمجۆرە کیشوەری میسر لـە ئاسـانی بـۆ مـەلیك نەجمـەدین سـاغ بـووەوە (تـووران شـاه) ی کوڕیـشی وڵاتـەکانی جزیـرە ی بـۆ خستبووە ژێر ئیدارەی خۆی. هەر سوریە بەدەست سەردارانی ئەییوبیەوە لە شۆڕشـدا

مابووەوە.مەلیك سالّح نەجمەدین پەیمانەکەی قودس لەمەڕ میر داودی بە شتێکی راستەقینە دائەنا. بۆیە هەر کە بووە فەرمانڕەوا خێرا ئەو پەیمانەی بەتالّ کردەوە. لەسەر ئەوەشدا جارێك توخنی میرداود نەکەوتووە لە میسردا خۆی بە ئیشوکاری دەولّەتەکەیەوە خەریك کردووە. بەلاّم لەملاوە ئەمیرەکانی سوریە لە ترسی تارەکانی مەلیك سالّح نەجمەدین کەوتبوونە کۆکردنەوەی خۆیان، تەنانەت لەگەلّ فەرەنگەکانیشدا یەکیان گرتووە، هەندێك شاری ئیسلامیشیان پێشەکی داوە بەو فەرەنگە ناحەزانە. بەمجۆرە رقەرەبییەوە ئەم سەردارە بێمێشکانە سەلامەتیی کیشوەری ئیسلامیان خستە بەختی فەرەنگەکانەوە. لەولاوە (بدرالدین لؤلؤ)ی حاکمی موسلّیش چووە بەگژ توووران شاه دا، گەلێك شوێنی لێسەندووە.

ئەم هەموو فیتنەبازییەش ئەمیر ئیسماعیل مامی مەلیك سالّح نەجمەدین ئەیگێڕا. لە دوای تەدارەکات (لەشکری) میسر هات بۆ فەلەستین لەشکری ئومەرای ناپاك و فەرنەگەکانیش پێکەوە بەرنگارییان بوون لای غەززە، جەنگێکی زۆر قورسیان کرد. لە گەرمەی شەڕدا تاقمێك لە موسلّمانەکان لایانداوەتە لای مەلیکی میسر. بەوە دوژمنەکان زۆر خراپ شکان. بەلاّم ئەم شکستە جەنگەکەی نەبردەوە، ئەمجارەش لەگەلّ قوسدا هەندێك جێگای تریشیان داوە بە فەرەنگەکان، بەوە سوپایەکی ئەستووریان کۆکردەوە. مەلیك نەجمەدین ئەیوبیش بەمە لەگەلّ خوارەزمییەکاندا رێکەوتووەو لە میسریشەوە لەشکری تری هێناوە. ئەمجارەیش هەردوو لەشکرەکە لەبەر غەززەدا شەڕێکی زۆر خوێنڕێژانەیان کردووە. بەخت یاریدەی مەلیکی میسری دا، دوژمنەکانی تارومارو بوون، تالاّنێکی بێشوماریشیان دا بە دەستەوە، لەسەر ئەمە لەگەلّ قودسدا فەلەستینیش گیرایەوە ( ٦٤٢هـ) ئەم سەرکەوتنە هیوای لسیبیەکانی لە رەگ دەرهێنا، لەو ساوە تا دوایی شەڕی گەورەی جیهان کە (١٩٨)ی زانییە جارێکی تر ئەم ولاّتانە لە دەست ئیسلام نەچووەتە دەرەوە. لە دوای ئەم ئەنجامە بە میر ئیسماعیل و میرداورد هەر بۆ ئەوەی داسەکنێن، هەندێك جێگایان دراوەتێ، بەلاّن

چونکە ئەم بەدبەختانە خولقی سەلامەتییان لە گیاندا نەبووە ئەمجارەش فەسادێکی تازەیان ناوەتەوە. خوارەزمییەکانیان کردووە بە ئالەتی شەڕو ئاژاوەیان خستووەتە ئەو ناوە، بەم هۆیەوە گەلێك شەڕی تازە روویان داوەتەوەو زۆر خوێنی تازە رژاوە هەتا خوارەزمییەکان تەفروتوونا کراون، سەرداره نارەحەتەکان شکاون و بۆ لای حەلەب رادوویان ناون، کەچی ئەمجارە حاکمی حەلەب میر یوسفی دووەم لەسەر ئەمانە هاتووەتە کایەوە، مەلیك نجم الدين ئەیوبیش بۆ بڕاندنەوەی ئەم نارەحەتیانە لە مسرەوە بە سوپایەکی زۆرەوە هاتووەتە شام ٦٤٦هـ. بەلام هەرلەم کاتەدا سەلیبییەکان جەنگی حەوتەمیان پەیداکردووە. ئەمجارە قەڕاڵی فەرەنسا (لویسی حەوتەم) بە لەشکرێکی زۆرەوە رووی کردووەتە میسر. لەسەر ئەمە مەلیکی میسر بە ناچاریی لەگەڵ ئومەرا یاخییەکاندا رێکەوتووەو بە نەخۆشی گیانەوە لەگەڵ سوپاکەیدا گەڕاوەتەوە بۆ میسر. تا ئەم کەین و بەینە کراوە، لەشکری فەرەنگ چووەتە میسرەوە (دمياط) یشیان گرتووە. قەڕاڵی فەرەنسا (دێوانە)یەکی ئایینی عیسا بوو، خۆی ئەخستە هەموو ئاگرێکەوە لە رێگای مەسیحدا.

بۆیە هاتبوو کە تۆڵەی ئەهلی صەلیبی رابردوو لە ئیسلامەکان بکاتەوە. داخی گرانە مەلیك نەجم الدين ئەمجارە بەخت یاریدەی نەدا کە دوارۆژی ئەم قەڕاڵە دێوانەیە ببینێت. چونکە لە هۆردووگاکەی خۆیدا کۆچی دوایی کردووە لە (٦٤٧ هـ — ١٢٤٩ زاینی)دا. ئەم پادشا بزورگەوارە ئەیویست حکومەتەکی سوڵتان سەلاح الدين دروست بکاتەوەو دەوڵەتی ئەیوبی بگەیەنێتەوە پلەکەی جارانی. ئەگەر هەرای فەرەنگ تازە نەبوایەتەوە حەلەب و بەڵکو موسڵیشی ئەگرت و مەرامی شاهانەی بەجێ ئەهات. بەلام مردن هیچی لەگەڵدا ناکرێت. مەلیك نەجم الدين بەو ناسۆرانەوە چووە ژێر خاکەوە. لەم دواییەدا تیپێك لەشکری لە (کۆڵەمەن) پێکهێنابوو پڕ تەعلیم و پڕ چەکی کردبوون. مەلیك پشت و پەنای بەمانە بەستبوو. بە راستی ئەم لەشکرە جوانە هەتا خۆی ماوە بە کەڵکی هاتووە.

## تۆران شاه:

کوڕی مەلیك سالْح نەجمەدین ئەیوبە. کە باوکی مرد حاکمی جزیرەو کوردستان بوو. شارەزای ئەو ناوە بوو، سەرداری سوپاکەی ئەویش بۆ ئەم پادشایە لە سەنعەتی شەڕدا ناوبانگی رۆییبوو. هەتا ئەم گەیشتووەتە میسر (شجرة الدر)ی باوەژنی نەیهێشتووە کەس بە مردنی باوکی بزانێت لەم هەنگامەدا بوو کە لەشکری صەلیب دەمی ژەندبووە میسر، خەریك بوون (منصورە)بگرن، تورانشا کە گەیشتە ئەوێ دەستیکرد بە تارەکاتی لەشکرو خێرا کەوتە خۆی. پەیتا پەیتا کۆمەك بۆ دوژمن ئەهات. لەسەر ئەوەشدا توووران شاه بە دەستوبردتر بوو، لەشکری فەرەنگ هەر خەیکی مەنسوورە بوو، بەرەکەتدا رووباری (نیل) ئەوکاتە هەڵسابوو. ئەمە پیلانی قەراڵی فەرەنسای تێکداوە. جا بەم بۆنەیەوە لافاو لە هەموو لایەکەوە دەوری سوپای سەلیبی گرتبوو، سوپاکەی توووران شاه شارەزابوون لە هەموو لایەکەوە تەنگیان بە دوژمن هەڵچنی و رێگەی (دمیاط)یان لێ برین. زۆری پێنەچوو دوژمن تووشی برسیەت و نەخۆشیی بوو. لەم کاتەدا توووران شاه بە تەدبیرێکی سەردارانە هەندێك (گەمیی)ی بە پارەچەپارچەکراوی بە پشتی وشتر گەیاندووەتە سەر دەریا. لەوێ گەمێکان دووبارە سەریەك خراونەتەوە. بەو جۆرە ئەستۆلێك دروستکرا. ئەم گەمیانە لە پڕێکدا گەیشتە سەر (دمیاط) و رێگای دەریایان لە دوژمن گرت. بە کورتی فەرەنگەکان لە سێ لاوە دەوریان گیرابوو: لایەك لەشکری میسر ، لاکەی تر لافاوی (نیل). سێهەم لا برسییەتیو نەخۆشی، ئەم سێ هێزە فەرەنگەکانی شپرزە کرد، هیچ چارەیان نەما بەرەو پاش دەستیان کرد بە گەڕانەوە. ئەوسا سوپای میسر ئێلجارییان لێ کردن و گەلێکیان لێ کوشتن و هەرچ مابووەوە بە دیل گیران. جا لە دوای ئەم ئەنجامە فەرەنسا گیانی خۆیو لەشکرە پەرێشانەکەی بە ٨٠٠ هەزار ئاڵتوون کڕییەوەو لە میسر چووە دەرەوە. لە دوای ئەم رووداوە، توووران شاه کە لە سوپاکەی خۆی وردبووەوەو هەستی کرد کە تیپە سوپای کۆلەمەنەکان خەریکی سەرکەشی کردنن. ویستی بە

گورجی و توندوتیژی عەسکەریەتی بیانخاتەوە ژێر رژێمی عەسکەری چونکە بۆ ئەم فەرمانە بە ترسە پشتی بە لەشکری کوردی جزیرە ئەستوور بوو کە هێنابوونی لەگەڵ خۆیدا. بەلام کۆڵەمەنەکان هەستیان بەمە کرد. ویستیان دەستپێشکەری بکەن، لەبەرئەوە لەناکاو توورانشایان کوشت (٦٤٨٩هـ)– ١٢٥٠م) شۆرەت وایە لەم جینایەتەدا دەستی (شجرة الدر)ی باوەژنی توورانشا هەیە، چونکە ئەم ئافرەتە چاوی لە فەرمانڕەوایی ببوو، خۆی بە ئاشکرا دۆستی جانییەکانیش بوو، تەنانەت لە پاشدا شووی کرد بە (عیزەدین ئیپەك) کە سەرداری کۆڵەمەنەکان بوو، جا بەماندا دیارە کە (شجره الدر) حەزی لە توورانشای هەنەزای نەکردووەو بە کوشتنی داوە. بەکورتی کیشوەرە بەدبەختەکەی ئەیوبی فەرمانڕەوایەکی بە سام و سەردارێکی بە کارو ناوبانگی لە کیس چوو، فەرمانڕەوایەکی بە دەسەڵات و سەردارێکی مومتازی ئەیوبییانە، ئەگونجا توووران شاه دەوڵەتی ئەیوبی بژیاندایەتەوە. بە پشتی حوشتر گەمیی گەیاندن بۆ سەر دەریا کاری هەموو جۆرە پادشایەك نەبووە. بێجگە لەمە لەناوبردنی لەشکری سەلیب و بە دیلگرتنی قەڕاڵی فەرەنساش خاترەیەکی پرشان و هەمیشە ژیاوی ئەم فەرمانڕەوایەیە.

## دوایی حکومەتی ئەیوبی میسر:

سوپاکەی کۆڵەمەنی یاخی، لە دوای کوشتنی توورانشا (شجرة الدر)یان کرد بە (مەلیکە)ی میسر بەناوی (المستعصمة ملكة المسلمين)، سەردارەکەشیان (عزالدين ايبك)ی ناو بوو. ئیپەك واتە (ئاغا بەگ) کرا بە سەرداری لەشکری میسر. بەلام سەردارەکان ئەیانویست ئەمیرێکی ئەیوبی بێت بە فەرمانڕەوا (حوکمدار) لەسەر ئەمە (ملك اشرف موسى)ی کچەزای مەلیك کامل لە جیاتی (شجره الدر) بەینێك کرا بە مەلیکی میسر. ئەوەندە هەیە دیسان حوکم بە دەستی عیزەدین ئایبەکەوە بوو کە دواجار هەر ئەم ئەمیرە لە (٦٥٣هـ — ١٢٥٥م) دا سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتی خۆی لە

میسر بڵاوکردوەوەو مەلیك ئەشرەف موسای عەزل کرد و ناردییەوە یەمەن. جا حکومەتی ئەیوبی میسر بەمجۆرە لەناوچووەو فەرمانڕەوایی ئەو کیشوەرە کەوتووەتە دەست کۆڵەمەنەکان کە پادشاکانی ئەیوبی لەوەپێش بە پارە ئەمانەیان کڕیبوو.

جا ئەم هەڵە سیاسی و عەسکەرایەتییە کە عەباسییەکان و ئەمەوییەکانی ئەندەلوس کردبوویان و تووشی فەلاکەتی لەناوچوون بووبوون بە دەستیانەوە، ئەمانیش دووبارەیان کردووەتەوە کە پێویست وابوو پێش ئەوەی ئەمجۆرە لەشکرە بێگانەیە دروست بکرێت ئەبوو پادشاکانی ئەیوبی تەماشای مێژووی رابوردوویان بکردایەو پەندیان لێوەرگرتایە، کەچی داخم ناچێت ئەمانیش لە مێژوو پەندیان وەرنەگرتووە.

## ئەمارەتی ئەیوبی:

لەناو خاکی حکومەتی ئەیوبیدا هەندێك وردە ئومەرا هەبوون هەتا بۆیان لواوە سەربەخۆ بوون. ئەمان وەك برین وابوون بە لەشی حکومەتەکەوە، هەمیشە جێگای ئازار بوون و لە هێزیان خستوون. بە راستی ئەمانە بۆ ئەوە ناشێن کە حکومەتیان پێ بڵێن، بەڵکو وەها ئەگونجێت هەر بە ئەمارەتیان دانێین، لەبەر ئەوە وا لێرەدا زۆر بە کورتی ناویان ئەبەین.

## ئەمارەتی حەلەب:

لە ٥٧٩ی هیجرییەوە تا ٦٥٨ی هیجری پایەدار بوو. بناغەی ئەم ئەمارەتە مەلیك زاهیری کوڕی سەلاحەدینی ئەیوبی دایناوە لە حەلەب، واتە باوکی لەوێ دایناوە. ئەم ئەمارەتە لە ژوو خۆیەوە هاوسنووری دەوڵەتی سەلجووقی رۆم بووەو زۆر شەڕو داوایان لە بەیندا پەیدا بووە، لە ٦٣٨ هیجری بەدواوە لەگەڵ حکومەتی ئەیوبی میسردا کەوتووەتە رقەبەریی و دوژمنایەتی و لەم بەینەدا دووچاری هێرشی

خوارزمییان بووە کە ئەمانەش مەغۆلەکان رادوویان نابوون. دوایی جار (هۆلاکۆ) ئێرەی داگیر کردو ئەمارەتەکەی لەناوبرد.

## ئەمارەتی شام:

ئەم ئەمارەتە هەمیشە دەستاودەست ئومەرای ئەیوبی کەوتووەو گەلێك شەڕو هەرای دیوە. لە دواییدا بەینێکیش چووەتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەمارەتی حەڵەب تاکو هۆلاکۆ هەردوو ئەمارەتەکەی لەناو بردووە.

## ئەمارەتی حەما:

ئەم ئەمارەتە زۆر بچووکە بەدەست برازاکانی سوڵتان سەلاحەدین، واتە کوڕانی مەلیك مزەفەرەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەوانی تر، سەردارەکانی ئەم ئەمارەتە هەمیشە ویستوویانە لە میسر لانەدەن و ئاسوودە بژین. لە دوای هۆلاکۆ بە جارێك بووتە ژێر دەستەی حکومەتی کۆڵەمەنی میسر، ئەوسا خانەدانەکەش لەناو چووە.

## ئەمارەتی حومس:

ئەم ئەمارەتە بەدەست نەتەوەی (شێرکۆ)ی مامی سەلاحەدین بووەو بە هاتنی هۆلاکۆ لە (٦٦١ ی هـ) لەناوچووە.

## ئەمارەتی یەمەن:

لە (٥٦٩هـ)دا یەمەن دەست سوڵتان سەلاحەدین کەوتووە هەتا (٦١٩هـ) بە دەست ئومەرای ئەیوبییەوە ماوە. لەوەدوا دەست خانەدانی (رەسوولی) کەوتووە کە تورکمان بوون. گەلێك هۆزی کورد، واتە خانەدان، بەهۆی ئیدارەی ئەیوبییەکانەوە لە یەمەندا جێگیربووە.

## ئەمارەتی جزیرە:

ولاتـی جزیـرە سـوڵتان سـەلاحەدین داگـیری کـردووە، تـاکو (٦٤٣هـ)، بـە دەست ئومـەرای ئەیوبییـەوە مـاوەو بـە میـسرەوە بەسـتراوە. شـاری میافـارقین جێنـشینی ئەمیرەکانی بووە. ئەمیش مەغۆلەکان لەناویان بردووە. بەڵام لە هەندێك شاری جزیرەو کوردستاندا وردە ئومەرای ئەیوبی تا سەدەی دەیەمی هیجری (کۆچی) ماوە.

## خزمەتەکانی دەوڵەتی ئەیوبی:

لەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەیوبی کە جڵەوەکەی بەدەست خانەدانێکی کـردەوە بـووەو لە سەر میراتی خولەفای (فاتمی)و ئەتابەکەکان دامەزراوە. لەگەڵ ئـەو هـەموو هێرشـە قورسانەی ئەهلی سەلیبیشدا بە شەوکەتێکی تەواوەوە ٨٤ساڵ پەیەدار بـووە. ئەمانـە لەو کاتە تەنگوچەڵەمەیەدا کەیانی عالەمی ئیسلامییان پاراستووە. لەو دەورەدا هەموو حکومەتەکانی سەرزەمین بەدەست رژێمی بۆگەنی دەرەبەگییەوە شپرزە بوون. هێـزی فـەرمانڕەوایی لـە نـاوەرۆکی حکومەتـدا نـەمابوو. بەگـەکان دەسـەڵاتی پادشـاکانیان نەهێشتبوو. لەسەر ئەمانەشدا توانای حکومەتی کورد ئەوەنـدە بـە بڕشـت بـوو لەگـەڵ ئەو هەموو شەڕ وهەرا ئەهلی سەلیب و یاخیگەری ناو خۆیـەدا تـا ٦٤٨هـ ئـەم دەوڵەتـە گەورەیی و دەسەڵاتی ناوخۆیی راگرتووە. ئەگەر تـەبیات تونـدی تورانـشا نەبوایـە کـە بووتە هۆی یاخیگەری لەشـکرەکەی و بـە ئـەنجام لەناوچـوونی خـۆی و دەوڵەتەکـەی، بێگومان ئەم حکومەتە گەلێك کاتی تریش پایەدار ئەبوو. پاشـاکانی ئـەیوبی تـەنیا بـۆ سەرکەوتن لە مەیدانی شەڕدا هەوڵیان نەداوە، بەڵکو لە مەیدانی زانـستی و ئـاوەدانی و ئابووریشدا بۆ بەرزکرنەوەی بارستی ژیانی ئەهالی تەقـەلای زۆریـان داوە. کـشتوکاڵیان پێشخستووە. جۆگای گەورەیان هەڵبەستووە، برەویان داوە بە فـەرمانی تەندروسـتی، لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئەروپادا پەیمانی بازرگانییان بەستووە. سوپای دەوڵـەتی ئـەیوبی دووبەش بووە: یەکێکیان لەشـکری تایبـەتی دەوڵەتەکە بـوو کـە لـە (کۆڵەمـەن)ەکان

دروست کرابوون. ئەویتر تیپە لەشکری ئومەرای دەرەبەگ بوو. لەو دەورەدا ئەمجۆرە چەکهەڵگرتن و چەشنە سوپای رێکخستنە باو بوە. لەشکری کۆڵەمەن لە تاقمە جەهێڵی تورك و چەرکەزو میللەتە بێگانەکانی تر کە بە پارە لەناو بازاڕ ئەکڕان دروست ئەکرا کە کۆڵەمەنی تورك یا بەحرییان ناونابوون لە منالییەوە لەسەر تەربییەی عەسکەری پێئەگەیەنران. جا ئەمانە لە پێشدا وەکو لەشکری تورکی عەباسی و (بەنی چەری) عوسمانی و (صقالبە)کانی ئەندەلوسی، زۆرباش و بەکەڵك بوون خزمەتی دەوڵەتەکەی خۆیان کرد، بەڵام لە دواییدا کە حکومەت کزبوو، ئەمانیش خولقیان گۆڕاو بوون بە میقرۆبی کوشندەی ئەوتۆ کە بونیەی حکومەتەکەیان تووشی نەخۆشی لەناوبردن کرد.

دەوری فەرمانڕەوایی (سەڵتەنەت)ی ئەیوبییەکان بناغەیەکی بەهێزی پێشکەوتنی بەخشیوە بە عالەمی ئیسلام. لە هەموو لایەکەوە زاناو مرۆڤی بە هونەری ئەوکاتە رووی کردووەتە کۆش و سەرای پادشاکانی ئەیوبی. ئەمانە قەدریان گیراوەو مووچەیان بۆ دانراوەو کردوویانن بە مامۆستای زانیاری و ئاوەدانی کیشوەرەکە. لە لایەکی تریشەوە لە شارەکاندا ئاوەدانییان خستووەتەوە، کۆشك و سەراو قەلای گەورەیان دروستکردووە، وەستای بە هونەریان لەم فەرمانە گەورانەدا بەکارهێناوە. جۆری ئیدارەو کۆکردنەوەی باج و خەراجی حکومەتییان هێناوەتە ژێر قاعیدەوە، هەڵسان و دانیشتنی کۆشك و تەلاری پادشاکانی ئەیوبی هەمیشە حوکمەتەکەیان خستووەتە ژێر رژێمەوە. بارەگای پادشاکانی ئەیوبی هەمیشە پڕبووە لە ئومەرای ئەهلی سەلیب ئەمانە رەوشتی ئیسلامەکانی ئەوکاتە فێربون کە چوونەتەوە بۆ ئەوروپا لەوێ بڵاویان کردووەتەوە. تەنانەت وێنەی دروشمی خانەدانی ئەیوبییەکانیان وەرگرتووەو بردوویانەتەوە ئەوروپا لەگەڵ خۆیاندا.

# بەشی چوارەم

# صلاح الدینی ئەیوبی

# لە دووتوێی (مێژووی کورد و کوردستان)ی

# شوکرواللە ی بابان دا

# زنجیرە پادشایانی میسر شام ئەیوبی

بی پێ نوسراوی مێژوونووسەکان لە یەکێ لە گوندەکانی ئازەربایجانی ئێرانا بە ناوی "دوین" هۆزێکی کورد لە کوردانی (روادی) لە نزیکی ئەڕاندا ئەژیان کە سەرەك و سەرداری ئەم هۆزە ناوی "شادی" بوو، زۆرتری مێژوونووسەکان شادیان بە کوڕی "مەروان" ناوبردووە، بەڵام (ستانلی لین پول) لە پێرەسی خۆیا شادی کوڕی "ئەیوب" ئەنوسێ و ئەڵێ ناونانی بنەماڵەش هەر بەم بۆنەوە بوە.

لە ئەنسکلوپیدی ئیسلامیا نوسراوە کە ئەم بنەماڵە لە هۆزی هازینی بو ئەڕۆنەوە سەر پادشایانی شەدادی کورد لە دوێندا.

شادی دوو کوڕی بوە بە ناوی "ئەیوب نەجم الدین" وە "ئەسەدالدین شێرکۆ" کوڕی ئەیوب نەجم الدین ناوی (یوسف سەلاح الدین)ە کە دەوڵەتی خۆی بە ناوی باوکیەوە ناوناوە.

ئەیوب نەجم الدین باوکی سەلاح الدین لە ئاوایی (ئیحدانقان) یا (ئیخوانقاه) لە بەرامبەری دوینەوە هاتوە دونیا، بەلام قازی بەهاالدین (ئێبن شەداد) ئەوی بەخەڵکی دوین داناوە، بەپێ نوسراوەییێکی تر لە (شێخەتانا) هاتوەتە دونیاوە شادی لەگەڵ (موجاهیدین بهروز) دا دۆست و هاوەڵ بون کە بەهرۆز لەلەی کوڕانی پادشای سەلجوقی بوە، پادشای سەلجوقی (بهروز) ئە کاتا حوکمڕانی بەغداو شارو قەڵای (تکریت) بەناوی زیادە بەش ئەدا بەئەو.

بێهروز شادی بانگ ئەکا بۆ لای خۆی و فەرمانڕەوایی تکریتی پێئەدا، شادی و کوڕەکان و خێزانیان ئەڕۆنە تەکریت و لەوێ دائەمەزرێن، بەلام زۆری پێ ناچێ شادی کۆچی دوایی ئەکات و لەوێ ئەنێژرێ کەئێستاش قەبرو مەرقەدەکەی هە ماوە.

پاش مردنی شادی ئەیوب نەجم الدین کوڕی نیشتەجێگەی وەبو بە فەرمانڕەوای تەکریت (٥٢٦)ی کۆچی.

بەینێ بەشوێن ئەمەدا (عمادالدین زەنگی ) ئەتابەکی موسڵ لەشەڕدا کە لەگەڵ لەشکری خەلیفەو (قەراجا) کردی تێکشکاو بە تێشکاوی هاتە تەکریت ئەیوب نەجم الدین ئەوی بەڕێز گرت و یارمەتی داو گەلێ گەمی و پاپۆڕی پێدا تا خۆی و لەشکرەکەی لە چۆمی دەجلە تێپەڕین و گەڕانەوە ئەم کارە بوە هۆی ئالۆزی بێهرۆز، چەندێ بەشوێن ئەمەدا یەکێ لە پایەبەرزەکانی دەزگای بێهروز لە لایەن ئەسەدالدین شێرکۆوە کوژراو نێوان بە تەواوی تێکچوو موجاهید الدین بێهروز ناردیە سەریان کەئەبێ بڕۆن ئەوانیش خۆیان کۆکردەوەو کەوتنەرێ بۆ لای عیماد الدین و ئەتابەك هەر ئەو شەوە کە کۆچ و بار ئەکەوتەڕێ سەلاح الدین لە دایك بو (عیمادالدین زەنگی بە چەشنێکی زۆر باش قوبولی کردن و بەعلەبەکی پێدا کە شۆڕشیان کردبوو دایمرکێنن‌و ببنە فەرمانڕەوا.

بەم جۆرە فەرمانڕەوایی ئەیوب نەجم الدین لەتەکریتەوە گوێزرایەوە بەعلەبەك (٥٢٤)کۆچی وە تا ساڵی (٥٤١) تا کاتێ عمادالدین زیندوو بو لەوێ حکومەتی کرد.

کاتێ عمادالدین کۆچی داویی کرد کوڕی گەورەی نورالدین بوە فەرمانڕەواو ئەتابەك‌و هەر ئەو بەڕێز گیری لە نەجم الدینەی بەلاوە بو، تا لەساڵی ٥٤٩ی کۆچی ١١٥٤ زاینی کردی بە حاکمی (دیمەشق) و هاودەنگی تایبەتی خۆی وە تا رۆژێ کە ئەیوب نەجم الدین رۆیشتە میسر بۆ لای سەلاح الدین هەر لەم پلەدا مایەوەو فەرمانڕەوای دیمەشق بۆ سەلاح الدینی ئەیوبی: (مەلیك ناسرالدین ئەبو الموزەفەر یوسو سەلاح الدین) کورشی ئەیوب نەجم الدین کوڕی شادی دامەزرێنەرو یەکەم پادشای فەرمانڕەوایانی دەوڵەتەکانی ئەیوبی مێسرو لقەکانی بەهاودەنگی مێژوونووسەکان لەساڵی ٥٣٢ی کۆچی ١١٣٨ ی زاینی لە شاری تەکریتا هاتووە دونیاو ناوی یوسو سەلاح الدین بو خەلیفەی فاتمی (العازدین الله) رۆژێ کە کردی بەوەزیر نازناوی (ئەلمەلیك الناسر ئەبو الموزەفەر سەلاح الدینی و دونیا)ی پێداوە، وە لە ساڵی ٥٧٠ی کۆچیدا لە لایەن خەلیفەی عەباسی (المستفی بامر الله) نازناوی (سوڵتان الاسلام

والمسلمین)ی پێدراوە، لە ساڵی ٥٧٤ کۆچیدا دووبارە هەر ئەم خەلیفە نازناوی (الموعێز ئەمیر المومنین) ناوەکانی تری زیادە پێداوە، سەلاح الدین دەورەی منداڵی وەکو شازادەکانی تر خراوەتە بە خوێندن و فێربوونی سواری و کاروباری شەڕو وەڵاتداری (ئێستانلی) ئەڵێ باشترین و چاکترین مامۆستایان سەلاح الدینیان بارهێناوە.

خاوەنی کتێبی (حیاة صلاح الدین الایوبی) ئەڵێ، چونکو کورد بوە سوارچاك و لە ئازایی و نەترسیدا سەربەرزبوە.

قازی بەهائەدین شەداد لە کتێبی (النوادر السلطانیة) دا ئەنوسێ سەلاح الدین لە خزمەتی باوکیا لە خەرمانی مرۆڤایەتی گوڵەوچنی ئەکرد تا بەناوبانگ بێ.

مێژوونووسەکان و لێکۆڵەران بڕوایان وایە کە لەناو پێشهاتەکانی ئیسلام و قەوماوەکانی گرنگی مێژوودا، پەیدابوونی سەلاح الدین و خزمەتە بەنرخەکانی ئەو لە رێگەی سەرکەوتوو پەرەسەندنی تەوانایی ئیسلام و بەرزی و سەرکەوتی وەڵاتە ئیسلامییەکان و ئەو شەڕانە کە لەگەڵ ئەهلی سەلیبدا بە پێچەوانەی دەسدرێژیەکانیان‌و ئەو خەباتە کە بۆ هەڵکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و پێشڕەوتی وەڵاتە ئیسلامیەکانا کردویە، یەکێ لەو پێشهاتە گەورەو گرنگانەیە کە ئەبێ هەتا هەتایە لەهەموو مێژووەکانا بە درێژایی باسی بکرێ.

بەناوبانگە کە لە تەواوخۆو خدەکانا وێنەیێکی تەواو دیاری لە خەلیفەی دووەمی ئیسلامە.

## سەفەری یەکەم بۆ میسر ٥٥٩ی کۆچی ١١٦٤ زایینی:

بەرلەوەی مەبەستی رۆیشتنی بۆ میسر بنوسین پێویستە کورتەیێ لە کاروباری ئەوکاتەی میسر باس بکەین.

لە ساڵی ٣٥٨ ی کۆچیدا سەردار جەوهەر ناوێ بەیارمەتی چەن هۆزێکی عەرەب و بەربەر هێرشی کردە سەر میسرو زنجیرەی (ئەخشیدی) هەڵپێچاو زنجیرەی

خەلیفەکانی فاتمی میسری دامەزراند ((پاش ئەو دە کەسی دیکە لە میسرا بون بە خەلیفە کەدوا خەلیفە ئەم رەگەزە (العازیدلدین الله) (ئەبو عەبدولا موحەمەد کوڕی فاین)ە کە لە ساڵی ٥٥٢ تا ٥٦٧ی کۆچی فەرمانڕەوایی و خەلافەتی کرد)) ئیتر لە کاتی خەلافەتی ئەلعازیدا خولی ناتەوانی و پیری و لەناوچوونی ئەم زنجیرە گەیشت.

زۆرجار لە نێوانی گەورەکان و ئەمیرەکانی میسردا، لەسەر پلەی وەزارەت شەڕو هەرا پەیدا ئەبو، وە ئەم ناحەزی و شڵەژاویە پێ بێگانەی ئەکێشا ناو کاروباری میسر.

لە ساڵی ٥٥٨ی کۆچیا پیاوێ بەناوی (شاور) بەرهەڵستی ئەلعادیل وەزیری خەلیفە وەستاو ئەوی لەکارخست و خۆی بوبە وەزیرو دەسەڵاتی بەسەر میسرا بەناوی (زەرغم) کوڕی عامێر بە پێوانەی شاور هەستاو شاور هەڵات و ڕۆیشت بۆ شام وەلە (نورەدین مەحمود) کوڕی ئەتابەك زەنگی داوای یارمەتی کرد، لەبەرانبەرەوە بەڵێنی دا کەسێ یەکی داهاتی میسر پێکەش کا.

(نورالدین) "ئەسەدالدین شێرکۆ" و "یوسو سەلاح الدین" لەگەڵ تاقمێ لە پێشمەرگەکانی خۆیا بۆ یارمەتی نارد.

شاور لە ناو ڕێگەدا بەڵێنی بە ئەسەدالدین دا.

(ابن خلكان) ئەنوسێ ناردنی سوپا لە لایەن نورالدینەوە بۆ میسر لەبەر دوو شت بو یەکێ بریتی بوو لە پەنادانی شاور وە ئەویتر ئەوەبو کە لە کاروباری میسر تێبگات، بەم چەشنە لەبەرواری ٥٥٩دا ڕۆیشتن بۆ میسر.

ئەمین زەکی بەگ خاوەن مێژووی کورد و کوردستان ئەم بەروارەی ساڵی ٥٦٢ی نوسیوە.

ئەنسکلوپیدی ئیسلام ٥٦٠ی نوسیوە.

(ئیبن شەداد) ئەنوسێ جومادی الاخری ٥٥٨ی کۆچی، بەڵام چونکو زۆرتر مێژوونووسەکان کوژرانی زەرغامیان ٥٥٩ نوسیوە ئەم بەروارە راستە" پاش گرتن و کوشتنی زەرغام شاور بەیارمەتی ئەسەدالدین شێرکۆو سەلاح الدین نیشتەوە

سەرکەتی وەزارەت، بەلام لە دواییا هیچکام لەوادەو بەڵێنەکانی بەجێ نەهێنا، لەسەر ئەمە ئەسەدالدین شێرکۆ سەلاح الدین برازای خۆی ناردە سەر بیلیبیس بۆ کۆکردنەوەی خەرج و باج، وە بۆ خۆیشی مەڵبەندەکانی رۆژهەڵاتی داگیر کرد و شاور پەنای بردە (ئاموری) پادشای بەیت المقدس ئەویش هاتە هاوار شاورەوەو شاری بیلیبیس و لەشرکی سەلاح الدینی گەمارەدا، بەلام بە هۆی قارمانی سەلاح الدینەوە هیچی پێ نەکرا لە لایەکی ترەوە نورالدین کە ئەترسا میسر کەوێتە دەس ئەهلی سەلیب لەشکرێکی ناردە یارمەتیان.

شاور لە تاوا پێشنیاری ئاشتی بە ئەسەدالدین شێرکۆدا ئەویش قبوڵی کرد و گەمارە دوایی هات " پاش دامرکاندنی شڵەژاویەکی ئەسەدالدین و سەلاح الدین گەڕانەوە شام.

## سەفەری دووەمی سەلاح الدین بۆ میسر ٥٦٢کۆچی:

پاش ئەوەی کە شێرکۆو سەلاح الدین ئەو ئاژاوەشیان کوژاندەوە گەڕانەوە بۆ شام، بەڵام بە چاکی لە کاروباری نالەبارو شڵەژاوی میسر ئاگاداربوبون و چاوی تەمایان تێ بڕیبو.

لە لایەکی ترەوە شاور تێ گەیشتبو کە ئەمانە سوك و ئاسان دەستی لە کۆڵ ناکەنەوە لەبەر ئەم مەترسیە نامەی نارد بۆ ئاموری و داوای یارمەتی لێکردو بڕیارێکیان پێکەوە بەست "ئەم هەواڵ گەیشتە نورالدین و لەوە ترسا کە میسر دیسان بکەوێتە داوێنی گاور.

لەبەر ئەمە ئیزنی لە خەلفەی عەباسی وەرگرت و جارێکی تر لەشکرێکی هەر بەسەرۆکایەتی ئەسەدالدین شێرکۆ خستەڕێ بۆ میسر" ئەسەدالدین پێی داگرت کە ئەبێ سەلاح الدین لە گەڵیا بڕوا" هەم سەلاح الدین دڵی پێوە نەبو، هەم نورالدین

حەزی نەئەکرد سەلاح الدین بڕواو، بەڵام پێداگرتنی ئەسەدالدین هەردوکیانی ناچار کرد رەزا بدەن.

سوپای شێرکۆ گەیشتە میسر و لە جیزەدا ئوردو بەزی "لەشکری ئاموریش هاتە ئەلفەستات و لەوێ خێوەتی لێدا ئاموری لەگەڵ خەلیفەی فاتمی دا بڕیاریان دابو لە دووقۆڵەوە هێرش بکەنە سەر سوپای ئەسەدالدین، سوپای ئەمان لە پڕا توشی ئەم هێرشە بون کەسەرەتا شڵەژان، بەلام بە هۆی ژیری و راسپێری سەلاح الدینەوە لەشکریان کردە دوو بەشەوەو لەبەر وپشتەوە دایانە مل سوپای میسرو ئامورياو بە چەشنێکی خراپ تیانیان شکاند، شێرکۆ کەوتە شوێن لەشکری تێکشکاوی میسر تاکو تەفرو تونایان کرد، ئەسکەندەریەیان داگیر کرد شێرکۆ سەلاح الدین لە ئەسکەندەرەیە داناو کردیە فەرمانڕەوای ئەوێ، ئەمە یەکەم حکومەتی سەربەخۆی سەلاح الدین بوو.

لەم بەینا ئاموری بە لەشکرەیەوە هاتە قاهیرەو هێزی خەلیفەشی تەیار کردو هێزی دەریایی سەلیبی خستەرێ و رۆیشتن دەوری ئەسکەندەرییەیان گەمارە دا، سەلاح الدین ماوەی حەفتا رۆژ شەڕی کرد و بەرگری لەشکری ئاموری و میسری کرد لەم بەینا ئەسەد الدین شێرکۆ هێرشی کردە سەر قاهیرە ئەم کارە مەترسێکی زۆری خستە دڵی ئاموری و خەلیفە ناچاربون گەمارەی ئەسکەندەریەیان شکاند و ئاشتیان راگەیاند.

بڕیاری ئاشتی بەسرا کەلەوەدا پەنجا هەزار دینار زیادە لەوەی کە لە دەستیانا بۆ بیاندەنێ و فەرانساوییەکان سوپای خۆیان لە میسر ببنەوەو تەنانەت تەنیا گوندێ لە دەستیانا نەبێ بۆ بەستنی ئەم پەیمانە لە لایەن ئەسەدالدین شێرکۆوە سەلاح الدین دیاری کراو رۆیشتە ناو لەشکری فەرانساوییەکان و چەن رۆژ لەوێ مایەوە تا بۆ خۆی بەوردی لە کاروباری عەسکەری ئەوان تێبگاو برێ نوسراوەی بۆ خۆی نوسی.

پاش دامەزرانی هێمنی و بەستنی بڕیاری ئاشتی بەو چەشنە رۆژی ١٨ی زی قەعیدە ساڵی ٥٦٢ی کۆچی گەڕانەوە بۆ شام.

## سەفەری سێیەمی سەلاح الدین بۆ میسر ٥٦٤ی کۆچی ١١٦٩ی زاینی:

چونکو شاور بێ ئاگایی خەلیفە "ئەلعازێد" لەگەڵ فەرانساوییەکانی ئاموریدا بڕیارێکی نهێنی بەستبو وە دارۆغەیێکی لەوان لە قاهێرە دانابو، وە فەرانساوییەکان لە کاروباری میسردا دەستیان کردبوە خۆ تێکەیاندن، وە سەلیبییەکان ئاموریان هەڵئەخزاند بۆ داگیر کردنی میسر خەڵکی زۆر ئالۆز بون و خەلیفەش لەم کارەساتە زۆر پەشێوو لەژێر گێرو گازابو نامەیێکی بۆ لای نورالدین کورشی عێمادالدین زەنگی کە لە جێگای باوکیا فەرمانڕەوای شام بو نارد وە لەو نامەدا کەبڕێ قژی سەری یەکێ لە ژنەکانی خۆی تێدابو دەرخوازی یارمەتی کردبو "ئەم جارەش ئەسەدالدین شێرکۆو سەلاح الدین بۆ کەڕەتی سێیەم لەگەڵ لەشکرێکا کەوتنەڕێ بۆ میسر ئەڵبەت ئەمەش ئەبێ بزانین کە دیسان سەلاح الدین قەت دڵی بەرۆیشتنەوە نەبو، ئەسەدالدین بە زۆرو پێ داگرتن لەگەڵ خۆیا بردی.

(قازی بەهائەدین) ئەڵێ سوڵتان سەلاح الدین بەمنی وت لەو کاتا بۆ ئەم کارە من لە هەموو نەبەدڵتر بووم وحەزم نەئەکرد، یەکەمی رەبیع الثانی ٥٦٤ی کۆچی ٣ ژانویە ١١٦٩ی زاینی گەیشتە میسر".

ئەسەد الدین شێرکۆو سەلاح الدین برازای لە میسردا مانەوە" چونکە بۆیان دەرکەوت هەموو پیلانەکان لەژێر سەر شاورایەو لەگەڵ خەلیفەو خەڵك و ئیسلاما فرۆفێڵ ئەکا گرتیان و کوشتیان (٢٧ ربیع الاخر ٥٦٤ی کۆچی، ئەنجا سەرەکەیان کردە نوکی رمەوەو هێنایانە لای خەلیفە.

خەلیفە "ئەلعازێد" کاتی خۆی لە شەڕی شاور رزگاری دی بە کەیف و خۆشییەوە شێرکۆی بانگ کردە کۆشکی خۆی و پێشوازی لێکردو خەڵاتی وەزارەتی پێ بەخشی و نازناوی (ئەلمەلیك المەنسوری ئەمیر الجیوش)ی پێدا.

بەم چەشنە ئەسەدالدین شێرکۆ لە حکومەتی "حوس"ەوە گەیشتە پلەی وەزارەتی میسر، ئەڵبەت لە هەموو کاروبارەکانا لە بیروڕاو زانایی و لێهاتوویی سەلاح الدین

کەڵکی وەرنەگرت، بەلام دەوری وەزارەتی شێرکۆ ئەوەندەی نەخایاند پاش دوو مانگو پێنج رۆژ کۆچی دوایی کرد، بە تەواوی رێگای سەرکەوتنی سەلاح الدین ئاوەلا بوو. (دووەمی مانگی جیمادی یەکەمی ٥٦٤ی کۆچی)، "قازی ئەلفازێل" لە کتێبی "وەفەیات الاعیان" دا ئەڵێ پاش چەن ساڵ تر تەرمی شێرکۆ لەگەڵ تەرمی ئەیوب نەجم الدینا گوێزرایەوە بۆ "مەدینە".

## وەزارەتی سەلاح الدین لە ٥٦٤ی کۆچی تا ٥٦٧:

پاش لە دونیا دەرچوونی ئەسەدالدین شێرکۆ خەلیفە ئەلعازێد برازاکەی ئەو سەلاح الدین کرد بە وەزیر، باوەکو ئەمیرەکانی سوڵتان نورالدین، وەکو قوتبەدین خەسرەو کوڕی بەلیل، ئەمیر عەین الدولە یاروقی، سەیف الدین کوڕی ئەحمەدی هەکاری، شەهابەدین مەحمود حارمی خاڵۆی سەلاح الدین لەم کاتا لە میسرا بوون و هەرکامە بە جۆرێ داوا کاری پلەی وەزارەت بوون، بەلام خەلیفە هیوای هەموویانی بەتاڵ کردەوە، لە ٢٥ی جیمادی الاخری ٥٦٤ی کۆچی ٢٠ ی مارسی ١١٦٩ی زاینی فەرمانی وەزارەتی وەرگرت.

لە سەرەتای کرا سەلاح الدین خۆی بەنایبی (ئەلمەلیك العادی نورالدین)دائەنا، تاکو بە تەواوی هێزی گرت.

قوڵەرەشەکان بەهۆی هەڵخزاندنی ئەمیرەکانی میسرەوە شۆڕشیان کرد، سەلاح الدین فەرمانی دا شەمس الدەولە تورانشا برای شۆڕەشەکە دامرکێنی کە ئەویش بە دڵو گیان ئەم کارەی کرد ئەم شۆڕشە لە مێژوودا بەناوی قەوماوەی (ئەلسودان)ناوبراوە لەم کاتا سەلیبییەکن هێریشان کردە سەر "دمیاگ" و داگیریان کرد سەلاح الدین الشکرێکی بۆیان نارد ئەوانی تێکشاندو شاری لێیان ساندەوەو شاری (عەقەبەشی) داگیر کرد کە لەسەر رێگەی حاجیە میسرییەکانەوە بو زۆر گرنگ بو.

لە لایەکی ترەوە نورالدین هێرشی کردە سەر (الکەرك)، بەڵام لەم کاتا بومەلەرزەیەکی سەخت لە هاوینی ٥٦٥ی کۆچیا قەوماو گەلێ شاری روخاند.
هەموویان ناچار چەکیان داناو خەریکی ئاوەدان کردنەوەی مەڵبەندە رووخاوەکان بوون.

## هێرش بۆ فەلەستین ٥٦٦ی کۆچی:

سەلاح الدین لەساڵی ٥٦٦ی کۆچیا پاش دامەزرانی کاروباری ناخۆیی میسرو سپاردنی کارە گرنگەکان بە خزم و کەس و کارەکانی خۆی و بەتینکردنەوەی سوپاو لەشکر لە میسر هاتە دەرەوەو رووی کردە فەلەستین وە تانێزیکی (رەمە عەسقەلان) رۆیشتە پێشەوە شاری (غەزە)ی داگیر کرد.

پادشای فەرانساوی بەیتولموقەدەس بە لەشکرێکەوە هات بۆ بەرگری سەلاح الدین، بەلام بەچەشنێکی خراپ تێ شکا ئەنجا سەلاح الدین گەڕایەوە بۆ میسر پاشان بۆ دامەزراندنی هێمنی تەواو لە نێوانی رێگای میسرو فەلەستینا هەم لە لایەن دەریاوە، هەم لە رێگای زەویەوە هێرشی کردەسەر بەندەری "ئیله" و ئەوێی گرت.

ئەمی زەکی بەگ لە میژوەکەیا ئەنوسێ گۆڕینی کارەساتی سوپایی و سیاسی میسر لەبەرگرییەوە بەرەو هێرشی بەلای گەلی مێسرەوە پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراوو گرنگ بو وەئەمە بوە هۆی زورەوەچوونی پلەو پایەو خۆشەویستی سەلاح الدین و ئەوی بەرەو ویست و ئاواتی خۆی ئەبردە پێشەوە ئەنسکلوپیدی ئیسلام ئەڵێ ئەو هێزانە بە چەشنێ بوون، کارەساتی لەگەڵ ئەوا سازگار کردبوو، ئەوی مرۆڤێکی بەتەواوی بەر خوردار پیشان ئەدا کە ئەتوانێ ئەو هێزانە بەکارببا.

## دوایی هاتنی خەلافەتی فاتمی و پادشایی سەلاح الدینی ئەیوبی؛

وەکو لەمەوپێش نوسیم و دەرکەوت سەلاح الدین رۆژ بۆ رۆژ بەهێزتر ئەبو وەهەموو کاروباری وەلاتی گرتە دەس لەناوچەکەدا فەرمانڕەوای راستەقینە ئەوبوو، ئیتر بۆ خەلیفە جگە لەناوێکی بێناو کە شتێ نەمایەوە.

خەلیفە پاش نەخۆشییێکی سەخت لەبەرواری ٥٦٧ی کۆچیا مرد بۆ جێگەنشینی دیسان لێرەدا بیروڕای هەموو مێژوونوسەکان وەکو یەك نیە بڕێکیان وتویانە چەندرۆژ بەر لە مردنی ئەلعازێد بەپێی فەرمانی سەلاح الدین خوتبەو وتار بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە خوێنرا عەباس اقبال ئەنوسێ کاتێ ئەلعازید مرد لە نێوانی خەڵکیا لەسەر هەڵبژاردنی خەلیفە چەن بەرەکێ بەدی هات تا لە رۆژی هەینیدا.

کاتی خوێندنی نوێژی جومعە مرۆڤێکی ئێرانی لە لایەنگیرانی سەلاح الدین لەسەر کەوتەوە بەناوی موستەزیی خەلیفەی عەباسی وتاری خوێندەوەو سەلاح الدینی بەناو سوڵتان ناوبرد، وە رێکەوت وابو لە لایەن هیچ کەسەوە رەخنە نەگیراو دەنگی ناحەزی هەڵنەبڕا.

جۆرجی زەیدان چیرۆکێکی گێراندوەتەوەو ئەڵێ: سەلاح الدین بە پێی هەڵبژاردنی ئەلعازێد وە دەنگی تەواو سەردارەکانەوە بوەتە سوڵتانی میسر.

بە هەر جۆر بێ یوسو سەلاح الدین کوڕی ئەیوب نەجم الدین لە بەرواری ٥٦٧ی کۆچیا بوبە پادشای میسرو زەنجیرەی خولەفای فاتمی کەماوەی دوو سەدە بەسەر میسرا فەرمانڕەواییان کردبوو دوایی هات و هەڵپچڕا.

ئەنسکلوپیدی ئیسلام ئەنوسێ سەلاح الدین لە کاتی مردنی خەلیفە ئەلعازێد ئەو هەلەی دەس کەوتبو وە ئەیتوانیماڵو دارایێکی زۆر بەدەس بێنێ و خەزنەو گەنجینەێکی زۆر پێکەوە بنێ.

بەڵام هەموو خەزنەکانی خەلیفەی وەکو (بەتولمال) لە نێوانی لەشکرا دابەشکردو خۆی هیچی دانەنا.

لە کتێبی (حسن المحازرە) لاپەڕە ٢٥ دانوسراوە پاش هەڵپچڕانی خەلافەتی فاتمییەکانی میسر سەلاح الدین لە ڕۆژی هەینی، سێیەمی مانگی سەفەری ئەوساڵا یانێ مانگی پاش خوێندنی خوتبە بە ناوی خەلیفەکانی عەباسی و پادشایی سەلاح الدین گەلی میسری لەدانی سورسات وماڵیات تەرخان کرد، وە ئەم کارە لە دڵی خەڵکیا زۆ شوێنی گرت.

"نورەدین زەنگی" تەمادار بو کە سەلاح الدین خۆی بەژێر دەستەی ئەو دانێ و وەلاتی میسر بکاتە بەشێ لە مەڵبەندی حکومەتی ئەو، بەلام ماوەیێ بوردو لەم مەبەستە هەواڵی نەبون لەسەر ئەمە نێوانی نورەدین و سەلاح الدین تێکچوو، تا لە دواییا بەهۆی ناوجیگەری شەمس الدولە و پێداگرتنی نەجم الدینەوە تۆزێ نێوان خۆشبو، بەلام لە ناکادا هەر نێوان قورِناوی و لێڵ بو.

سەلاح الدین بۆ بەرگری پەرەسەندنی مەترسی "نورەدین" پێویستی زانی وەلاتی خۆی پەرە پێبداو لە ساڵی ٥٦٨دا شەمس الدولە و تورانشا برا گەورەی خۆی نارد بۆ (ئاسوان)وە لەوێوە رۆیشت بو (نەوبە)و قەلایێکی قایم بەناوی (ئەبزیم)و ئەو جێگایانەی داگیر کرد.

## کۆچی دوایی ئەیوب نەجم الدین ٥٦٨ی کۆچی:

لەم بەینا کەتۆزێ نێوانی سەلاح الدین لەگەڵ نورەدینا باش بوبوەوەو ئاشتی بەهۆی ناجێگیری نەجم الدینا بەدی هاتبو، نورەدین لە سەلاح الدینی ویست کە لەگەڵ لەشکرێکا بەرەو فەلەستین بکەوێتە رێ و بۆ خۆیشی لەولاوە بێت بۆ شەڕی پادشای بەتولاموقدیس، سەلاح الدین قوبوڵی کرد و رۆیشت، بەلام هەرکاتێ ئەوەڵ کەچاوی بەنورالدین کەوت زانی کە لەدڵەوە لەگەڵیا پاك و یەك رەنگ نیە، سەلاح الدین نەخۆشی باوکی کردە بیانوو گەڕاوە بۆ میسر، چونکو لەم کاتا رێك کەوت وابو "ئەیوب نەجم

الدین" لە ئەسپ گلابوو وەتوشی دەردێکی گران بو، هەرچەندە تیمار کراو دەرمانیان کرد قازانجی نەبو، ئەیوب نەجم الدین کۆچی دوایی کرد.

برێ لە مێژوونووسەکان بەرواری مردنی ئەویان رۆژی ١٨ی زیحەجەی ٥٦٨ی کۆچی نوسیوە.

حەوزو مزگەوتێکی جوان لە قاهیرە و هەروەها خانەقایێ بەنوی نەجمیە لە بەعلەبەکا بە دەستی ئەیوب نەجم الدین دروس کراوە، شوێنی ئەوە.

کاتی سەلاح الدین لە (ئەلکەرک)ئەوە ئەگەڕایەوە هەوالی لەدونیا دەرچوونی بابی پێدرا زۆرپێی ناخۆش بوو بەتایەبت بۆ ئەوە دلگران بوو کەلە دواهەناسەدا لەسەریەوە نەبوو.

سەلاح الدین جارێکی تر تورانشا براگەورەی خۆی خستەڕێ بۆ یەمەن بەویستی پەرەپێدانی وەلات و بەدەسهێنانی ناوچەکانی ترو کۆکردنەوەی سوپا بۆ بەتین کردنەوەی کاروباری خۆی.

تورانشا لە سالی ٥٦٨دا کەوتەڕێ و لە یەمەندا مرۆڤێ بەناوی عەلی کوڕی مەهدی خارجی فەرمانڕەوایی کردبوو کە لەسالی ٥٥٤ دا ئەوێ داگیر کردبو ئێستا کوڕی ئەو (عەبدو نەبی) حکومەتی ئەکرد لەگەلێ تورانشا شەڕی کرد، بەلام تێکشاو تورانشا یەمەنی داگیر کردو مرۆڤێکی بەناوی (موبارەك) لە لایەن خۆیەوە کردە حاکم، بۆ خۆی رۆیشت بۆ عەدەن لەوێشدا (یاسیر کوڕی بیلال) کە لە لایەن عەبدونەبیەوە حکومەتی ئەکرد خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد، بەلام ئەویش تێکشاو عەدەنیش داگیر کراو (عیزالدولە عوسمانی) کردە فەرمانڕەوا کە ئەم عیزالدین و بەرەی ئەو تادوایی هەر لەوێ فەرمانڕەوا بون.

نورالدین لەم کارانەی سەلاح الدین و لە گەڕانەوە بە ڕەنگیا زۆر ئالۆز وتوڕەبو، ویستی بڕواتە سەر مێسرو ئەوێ داگیر بکا، بەلام مردن هەلو دەرفەتی پێنەداو لە رۆژی چوار شەمموی ٢١ی شەوالی سالی ٥٦٩ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد پاش مردنی

ئەتابەك نورالدین کوڕی ئەو بەناوی سالّح ئێسماییل نیشتە جێگەی لە کاتێکا منداڵێکی یانزە ساڵەبوون بەلام خزم و کەسو کاری هەر کام لە لاییکەوە سەریان هەڵبڕی جێگاێکیان داگیر کرد، بەلام سوڵتان سەلاح الدین ئەوی بەرەسمی ناسی وە نامەییکی نوسی و هەڕەشەی ناردەسەر ئەوانی تر بڕێکیان ملیان نەدا، وە سوڵتان سەلاح الدین ئەمەی کردە بیانو بڕی جێگەی دورەدەستی داگیر کرد، پاش ئەوە کە سەلاح الدین هەموو جێگاکانی گرت ئەیویست بڕوا بۆ دیمەشق و ئەوێش بگریٚ، بەڵام لەم کاتا ئاموری پادشای بەیتولموقەدەس مردبو کوڕێکی منداڵی بەناوی "بودوین"ی چوارەم نیشتبوە جێگەی و (ریمون) ناویٚ چاودێری کەری ئەوبو.

سەلاح الدین ئەم لای بەجێهێشت و بەلەشکریەوە هێرشی کردەسەر (حومس) ٧ی رەجەبی ٥٧٠ی کۆچی شەڕ لەویٚ دەستی پێکرد تا لە دواییا پاش شەڕێکی یەك مانگە ئەوێی گرت.

لەم لاوە (سیف الدین غازی) ئامۆزای مەلیك سالّح کە فەرمانڕەوای موسڵ بو بەناوی لایەنگریی سالّح ئیسماییل قۆشەنێکی رازاندەوە هات بۆ شەڕ لەگەڵ سەلاح الدین" شەڕ هەڵگیرسا، بەلام لەدواییا لەشکری شام تێکشاو گەلیٚ کەسیان دەسگیر بون سەلاح الدین دەردەس کراوانی بەرەڵا کرد، شارەکانی "ئەلمەغەرە" "کفرتاب" "مارگین"یش کەوتە سەر مێسرو ژێر دەستی سەلاح الدین.

(سەیفوالدین غازی) دانەمرکاو جارێکی تر لەشکرێکی نایەکەوەو هات بۆ شەڕ لەگەڵ سەلاح الدین و ئەم جارە مەلێك سالّحیشی لەگەڵ خۆی هێناو کردیە هاودەس، ئەم جارەش بە سەختی تێشکان و هەموو باوربنەو خێوەت و شتومەکیان کەوتە دەس سەلاح الدین.

بەشوێن ئەم شەڕەدا خەڵکی شام لە سوڵتان سەلاح الدین داوایان کرد کە بڕواتە ئەویٚ و گەلیٚ لەسەر کردەو گەورەکانیش لەم لانگکردنەدا بەشداریان کردبو، ناسر لەم لانگ گەیشتە پێشوازی کرد وبیٚ ماتڵی رۆیشتە ئەویٚ، ئەڵبەت ئەمەشی بە خەلیفەی

بەغدا هەولێ دابو کەپێویستە سوریەشی بەدەستەوەبێ تا باشتر بتوانێ بەرهەڵستی سەلیبییەکان بوەستێ و لەرێ گەورەیی ئیسلاما خەبات بکا، بەم جۆرە مەلیك ناسر سەلاح الدین لە ئاخر و ئۆخری رەبیع الاولی ٥٧٠ی کۆچیا رۆیشتە ناو شاری شام، لە پێشا رۆیشتە خانوەکەی خۆیان تا لە دواییا قەڵاو کۆشکی ئەتابەکیان پێشکەشی کرد، لەوێش تەواو ماڵی و دارایی و خەزنەی بەسەر لەشکرو خەڵکا دابەش کردو شامیش بوە یەکێ لەوەڵاتانی ژێردەستی، ئەنجا (سەیفوالاسلام تەفتەکین)برای خۆی کردە حاکمی ئەوێ و بۆ خۆی روی کردە (حومس) ئەوێشی لە دوژمن پاك کردەوەو رۆیشتە (حەما) حاکمی ئەم شارە ئەمیر عێزالدین جوردیك بوو کە لە سەرفەری سێیەمی میسرا هاوڕێی شێرکۆو سەلاح الدین بوو، حاکم لە سوڵتان پێشوازی کرد و لەئەنجاما سەلاح الادین ئەوی هەر لەوێ داناوە.

ئەنجا روی کردە حەلەب وە لە رۆژی سێیەمی جیمادی الاخری ٥٧٠ی کۆچی شاری گەرمارەدا.

(کوموشتەکین) و چەن کەس تر لە ملەپێچیکەران لەوێ بون دەسیان کردە پیلان گێران و نامە ناردن بۆ رێمون حاکمی تەرابلوس و شێخ راشدالدین سنان سەرەکی ئیسماییلیەکان رێمون حاکمی فەرەنگ لەشکری کردەسەر خوس ئەم هەواڵە گەیشتە سەلاح الدین گەمارەی حەلەبی واز لێهێناو روی کردە لەشکری قودس، رێمون گەڕایەوەو بێ شەڕ ئەم کارەساتە دوایی هات، بەلام سەلاح الدین دەستی هەڵنەگرت و بەلەشکرەییەوە هێرشی بردەسەر عەسقەلان و دەوروبەری و ماڵێکی زۆری لە خاچ پەرستەکان وەرگرت.

وە لەدواییا ساڵی ٥٧٣ی کۆچی بەرانبەری ١١٧٧ی زاینی قەڵای حەلەب کەوتە دەست سەلاح الدین ئەویش فەرمانڕەوایی حەلەبی سپاردە مەلیك زاهێر کوڕی خۆی.

لە ساڵی ٥٧٤دا گاورەکان هێرشیان کردە سەر شام کەلەو کاتەدا فەروخشا برازای سەلاح الدین لەوێ بۆ بەلەشکرییەوە رووی کردە قۆشەنی سەلیب پاش شەڕێکی توند و

سەخت بەچەشنێکی خراپ ئەوانی تێشکاندو لەم شەڕا سەرەکی قۆشەنی سەلیب کوژرا.

لەساڵی ٥٧٣دا جارێکی تر شەڕێ لە نێوانی ئەهلی سەلیب و سوڵتان سەلاح الدینا قەوما کەپاش ماوەیەکی درێژ سەلیبییەکان تێشکان بەشوێنیا شارەکانی (نابلوس) (حەیفا) (ناسرە) (عەسقەلان)و (قیساریە)و چەن جێگەی تر کەوتە دەس لەشکری سەلاح الدین.

سوڵتان پاش ئەم پیرۆزییە هاتەسەر قەڵای یاقۆ ئەوێی گرت، ئەم کارە بوە هۆی ترسانی گاورەکان و داوای ئاشتیان کرد، قوبوڵ کراو بۆ ماوەی دوو ساڵ بڕیاردرا.

سەلاح الدین کە لەشەڕی ئەهلی سەلیب تۆزێ رزگاربو ویستی لەم فرسەتە کەڵك وەرگرێ و کاری جزیرەش ساغ کاتەوە هەڵی کوتایە سەر ئەرمەنییەی بچوك و ئەویشی ناچار کرد ئاشتی بکا بە شوێن ئەوەدا گەلێ لە وەڵاتە بچکۆلەکان ملدانی خۆیانیان ڕاگەیاند، وەکو موسڵ، جەزیرە، هەولێر، حسن کێف، ماردین.

لە ساڵی ٥٧٦دا مەلیك ناسر سەلاح الدین گەڕایەوە بۆ میسر تا بەتەواوی خۆی لەشکری تەیار بکا بۆ شەڕی هەرە گەورە لەگەڵ فەرەنگدا.

بەڵام لە پێشان برێ جێگای موسوڵمان نشین بە تایبەت ناوچە کوردنشینەکان مابو کە بگیررێ یا بینە هاوقەوڵ بۆ ئەمە لەشکری خستەڕێ و هات بەرەو ژوور، سەرەتا گەیشتە شام، لەناو ڕێگەدا قەڵای (بیسان)گیرا، ئەنجا لە ڕۆژی ٢ی رەمەزانی ٥٧٨دا سنجاری گرت، لە دوای سنجار روی کردە قەڵای (ئامێد) دیاربەکرو ئەمانەشی داگیر کرد لەو بەینەدا هەواڵی پێگەیشت کە عیمادالدین حاکمی حەلەب لەگەڵ ئەهلی سەلیبا ڕێك کەوتووە سوڵتان گەڕایەوە بۆ ئەوێ لەناو ڕێگەدا (غیتانی) گرت موحەرەمی ٥٧٩ی کۆچی ئەنجا حەلەبی گەمارەدا عیمادالدین کەزانی چار ناکا داوای لێبوردنی کرد، وتی سنجار بە من بدە لەبەرانبەرەوە ئەملا هەمووی بۆ سوڵتان ئەم ئاڵوگۆڕە

کراو حەلەب بوە هی سولتان کە یەکێ لە هونەرانی ئەو کاتە هۆنراوەیێکی بۆ ئەم پیرۆزییە داناوە.

## کورتەیێ لەبارەی شەڕەکانی سەلیبیەوە:

لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا دوو کۆلاراوی گەورە لە عالەمی ئیسلاما قەوما، یەکێکیان هێرشی تورکەکان بو، ئەوی دیکە هەنگامەی گەورەی شەڕەکانی سەلیبیە.

عەرەبەکان کاتێ تورکستانیان داگیر کردو بەسەر تورکا زاڵبون گەلێکی زۆر لە تورکە دیلکراوەکانیان لەگەڵ خۆیانا بەیەخسیری برد تابونە پارێزەری کۆشك و قەلای خەلافەت و خزمەتکاری نێزیك ئەنجا وردە وردە هێزیان گرت تا جێگایێ کەدەسەجڵەوی کاروباری حکومەتیان بەدەس هێنا.

خولی خەلافەتی فاتمییەکان کە یازدە خەلیفە ماوەی ٢٩٠ ساڵ، لە ساڵی (٣٥٨ تا ٥٦٧ی کۆچی) خەلافەتیان کردووە ئەم خولە بەسێ دەورە دابەش ئەکرێ " دەورەی یەکەم خولی دەسڕۆیشتن و دەسداری تورك و بەربەر لەدەزگای خەلافەتا، دەورەی دووەم خولی دەسەڵاتی تورك و رەشپێسەکان، دەورەی سێیەم خولی دەسەڵاتی تورك و گاور" تورکەکان زۆر دەستیان پەیدا کرد بە تایبەت لەماوەی خەلافەتی "زاهێر لاغرازی لدین الله" بە جۆرێ کە ئیتر دەسەڵاتی بەربەرەکان لەناوچوو تەنیا تورکەکان بون ئەم کارەساتە لە خولی خەلافەتی "موستنەسەرو بالله"ش دا درێژەی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، چونکو دایکی ئەم خەلیفە ژنێکی رەشپێستی بەپارە کڕاوبوو، گەلێکی زۆر لە قوڵە رەش پێس تەنیا لەناو لەشکرا بوو" باوەکو خەلیفە بەدەسەڵات بو، بەلام هەر هاتن و بونی ئەم رەشپێسانە لەگەڵ تورکەکان دوو هۆیی بەدیهێناو بوە هۆی ملەملێ و شەڕی ناوخۆیی تانەو جێگا، خەلیفە ناچار بو لەحوکمڕانی شام کە گاورێك بو بەناوی "بەدر الجمالی" داوای یارمەتی کرد ئەویش بە لەشکرێکی مەسیحیەوە هاتە میسر گەلێ

لەسەرۆکانی ئەرتەشی کوشت و زۆربەی لەشکری گاوری لەوێ دانا، لێرەدا زۆرتری سوپا تورك و مەسیحی بوو.

تورکەکان دەسەلاتی زۆرتریان بو دەسیان کردە ئازارو چەرمەسەرێ هەموان لەدەروەبەرا حکومەتێکیان دانا کەهەموو لێ ئالۆزبون و بە تایبەت زیارەتکەرانی مەسیحی ئەوروپا کە لەرێگای زیارەتی بەیتولمەقدەسا توشی جەزرەوە ئەبون، بەهۆی ئەم کاروبارەوە خەڵکی وەلاتانی ئەوروپایی کەوتنە جوڵەجوڵ و لە دواییا بەهۆی هەڵخزاندنی "پیرئرمیت" کە یەکێ لە قەشەکانی گەورەی فەرانسە بو لە ساڵی ١٠٩٥ی زاینیدا ئامادەی شەر بون" هەر ئەم قەشە فەرمانی شەڕی لە "ئوروین" پایی ئەو کاتە وەرگرت.

لەم بەروارەدا ئەم قەشە لەگەڵ قۆشەنی گاورەکان هێرشی کردە سەر فەلەستین و ئەوی داگیر کردو "گود فروادو بویون" ی کردە حوکمڕانی ئەوێ.

لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا بەهۆی پیرۆزییێکەوە کە ئەهلی سەلیب لە رۆژهەلاتا بەدەستی هێنا شێرگیر بوون و لەساڵی ١١٤٧ی زاینیدا شەڕی دووەمیان دەس پێکرد، بەلام ئەمجارە خولی پادشایی کوڕی شیر سەلاح الدینی کورد بۆ کە ئەوانی تێکشاندنو فەلەستینی گرتەوەو مەسیحییەکانی لەوێ دەرکردو بەیتولموقەدەسی کردەوە هی ئیسلام.

پاش ئەوە شەڕی سێیەمی سەلیبی کەسەخت ترین و گرنگترین شەڕەکان دەستپێکرا کە ئەویش هەر بە تێکشکانی ئەهلی سەلیب دوایی هات.

جارێکی تر ئەمپراتۆری بەناوبانگی فەرانسە "سەن لویی" لەگەڵ لەشکرێکی زۆرا هێرشی کردە سەر فەلەستین و تاپێ دیواری شار هات، بەلام تێشکا و خۆی دەردەس کراو سوپاکەشی تەفرو تونا بو ئەم شەرانە بەینابەین هەر درێژەی بو، ئەم ئیمپراتۆرە هەموو جارێ خەڵکی ئەورووپای تەیارکردو ئەیانهێنا بۆ گرتنەوەی فەلەستین تاکو لە

شەڕی هەشتەما لە پێ دیواری (تونسا) تاعونی گرت و لەشەڕی هەشتەما ئاواتی بردە قەبرەوە.

ئەڵبەت ئەم مەبەستە کارێکی سوك و ئاسان نەبوە، دەها کەس لە پادشایان و دەسەڵاتدارەکانی ئەورووپا لەگەڵ لەشکرو سوپاو قۆشەنی زۆرا ئەم هەشت جارە بەتەواو هێزو دلێری و لەگیان بوردوییەوە، بۆ دەس پەیداکردن بەسەر مەزنترین و گەورەترین و خۆشەویسترین جێگا تێکۆشاون و بڕێ جار تاپشتی دیواری ئەورشەلیم چونەتە پێشەوەو بەدەستی خاڵی گەڕاونەتەوە، بەچەشنێ کە یەکێ وەکو "ریشارد" شێردڵ ئەمپراتۆری ناوداری انگلیز بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تەماشای "بەیتولمەقدەسی" کردو وتی ئەی عیسای مەسیح بۆ خۆت ئەزانی تائەو جێگا واپێویست بو تێکۆشام، بەڵام نەمتوانی کارێ بکەم و ئەوا دەس بەتاڵ گەڕامەوە.

گرنگی فەلەستین: فەلەستین بەتایبەتی ناوەندی ئەوێ "بەیتولموقەدەس" زۆر لە مێژەوە گرنگی ئایینی زۆرێکی بووە لەوانەیە کە بڕوا ناڕوات هیچ جێگایێ لە دونیادا ئەوەندە گرنگ بۆبێ شوێن کەوتووانی ئاینی "موسا" ئەوێ بە مەڵبەندی وادەردراو "ئەرزە موعود" وە شوێنکەوتوانی ئاینی مەسیح لە تەواو دونیادا ئەوێ بە خاکی پاکی "عیسا"و "توربەتی عیسا"و جێگای پەیدابوون و نەمانی ئەزانن، وە بۆ موسوڵمانەکان و شوێنکەوتوانی ئاینی "موحەمەد" قیبلەی یەکەم و جێگەی ئاسمان چونی پێغەمبەری خۆیان ئەزانن و شوێنەکەوتوانی هەر سێ ئایین بۆ گرتن و راگرتن و پاراستنی ئەوێ لە هیچ چەشنە خەبات و لێبوردوویێ کۆتاییان نەکردووەو ناکەن، بەڵام گەرموگوڕی ئەم ویستە لەسەدەکانی نێوەراستا زۆرتر لە هەموو کاتێ بوە.

ئەزانین موسوڵمانەکان لە ساڵی ١٥ی کۆچی ٦٣٧ی زاینی لە خولی خەلافەتی خەلیفەی ئیسلاما داگیران کرد "وە ئەم خەلیفە بۆ خۆی هاتە ئەوێ و بەڵێنی پاراستنی گیان و ماڵ وئازادی دینی بەمەسیحییەکانداو لە پاشا چاودێری ئەکراو ئەم بڕیارە زۆرو کەم بەڕێوە ئەبرا.

بەڵام خەلیفەکانی فاتمی لەم رەوشتە کۆتییان کرد بەتایبەت خەلیفەی سێەمی ئەم زەنجیرە "ئەلحاکم بامر الله" لەبەرواری (٣٨٠ – ٤١١)ی کۆچیا فەرمانی یاساخ کردنی زیارەتی مەسیحییەکانی دەرکرد.

جارێکی تر لە بەرواری ٤٧١ی کۆچیا (مەلیك شای سەلجوقی) کەبەسەر ئەوێدا دەسەڵاتی پەیدا کردو (تەکێش) برای خۆی لەوێ کردە حاکم سەبارەت بە مەسیحییەکانی فەلەستین زۆر سەختیان بۆ پێشهێنان و سەبارەت بە ئازاری زیارەت کەران قەت دەسیان نەئەگێڕاوە، تاکو هەروەها کە وتمان لەساڵی ١٠٩٥ی زاینیدا (ئوروین)ی دووەم پاپ فەرمانی شەڕی دەرکرد بە جۆرێ کە تەنانەت هەموو قەشەکانو سەرۆکانی ئاینی تەواو دانیشتوانی کلێسا و نوێژخانەکان بۆ شەڕ نەبێ بڕوا تەواو قەرزدارەکان لە دانەوەی وام و بەندیخانەو کوژراوان ئازادکران بەو مەرجەی لە شەڕا بەشداری بکەن، بەم چەشنە تەواو ئەوروپا کەوتەڕێ تاکو لە (ژوەنی ١٠٩٩ی زاینی)دا شوێنکەوتوانی عیسا مەسیح چاویان بەدیاری فەلەستین کەوت و لە ٢٣ی شەعبانی ٤٩٢ی کۆچی شاری ئەورشەلیمیان لەدەس تورکەکان دەرهێناو بە شوێنیا گود فروادو بویون بوە حاکمی ئەوێ، لە پاشا بەرەی ئەو تاساڵی ١١٧٣ی زاینی ٥٧٠ی کۆچی ئاموری مردو کورشی ئەو "بودوینی چوارەم" جێگەنشینی ئەو بڕیاری دەس لە شەڕکێشانی چوار ساڵەی لەگەڵ سەلاح الدینا بەست ئەم حکومەتە هەر درێژەی بو تاکو لە ساڵی ٥٨٢دا بڕیارەکە بەتاڵ بوەوە ئەوەش بەهۆی دەسدرێژی حاکمێکی فەرانساوی ئەلکەرك دابو کە هەڵمەتی دایە سەر کاروانێکی موسوڵمان و تاڵانی کرد وژنانی هاوڕێ کاروانەکەی بەدیلی برد کە (زمروت خاتون) خوشکی سەلاح الدین لەناو ئەوانا بوو.

ئەوەبو کە سەلاح الدین لەشکری کێشا بۆ ئەلکەرك و ئەوێ داگیر کردو دیلەکانی ئازادکردو ئەنجا "سەفوریە" "تەبەریە" و قەڵاکانی دەوروبەری داگیر کرد.

لەیەکێ لەو قەڵایانە سەلیبی خاوێن کەپێیان ئەوت (سەلیب السەلبوت) کەوتە دەس ئیسلام.

لەم شەڕا سەرەکی دەستەی هەیکەل کە یەکێ لە پێشەواکانی گەورەی ئاینی عیسا بو لە بورجی (عویون) لەگەڵ چەن قەشەو بڕێ لە گەورەکانی وەڵات وەکو (یوحانا عەمەدان) خاوەنی تەبەریە براکەی (جبیل)و چەن کەسێکی تر لە گەورەکانی (قودس-عەکا) دەردەس کرابون، سەرەك مردو لاشەکەی لەبەرانبەر پارەیێکی زۆرەوە درایە گاورەکان هەر لەم شەڕا، عەکا، عەسقەڵان، ئەرەمەڵ، ئەدارم غەزە، ئەلخەلیل، بەتولەحم، بەیت جیبرەییل-سڕو چەن قەڵای تر کەوتە دەس لەشکری سوڵتان سەلاح الدین و تەواو ئەم سەرکەوتانە لەماوەی سێ مانگ و نیوا بەدەس هات ئیتر تەنیا فەلەستین یا شاری پیرۆزی "قودس" مابوەوە.

## گرتنی فەلەستین یا گەورەترین پیرۆزی:

پاش پیرۆزییەکان و گرتنی شارەکانی دەوروبەری شاری "قودس" دواپلەی پیرۆزیو دوائامانج کەئەبوا بەدەس بێ گرتنی (بەیت المقەدەس)بو کە وادەی گرتنی گەیشتبو، دیارە ئەم شەڕەو بەرگری سەلیبییەکان لەم شارە خاوێنە چەن گرنگ و چەندە ئەبێ توندوتیژ بێ وەرگرتنی ئەوێ لە دواپلەی سەختی دا بوە.

سوپای سوڵتان بەدوا پلەی لێبوردویی و تێکۆشان خۆیانیان گەیاندە پای دیواری شارو ئەویان بەتەواوی گەمارەداو زۆریان بۆ خەڵکی شار هێنا، لەم کاتا گەورەکانی شارو ئاینی مەسیح پێشنیاری ئاشتیان داو ئامادەبون شار بدەنە دەستەوە پێشنیار قوبوڵ کراو بڕیار بەسرا کە یەکێ لەبەشەکانی بڕیارنامە ئەوەبو تا چل رۆژ پاش مۆرکردنی بڕیارنامە هەر پیاوێ ١٠دینارو هەر ژنێ پێنج دینارو هەر منداڵێ دوو دینار بدا ئەتوانێ لەشار دەرچێ بێ ئەوەی لەگەڵ مەترسیدا رووبەڕو بێ ئەگینا دیلەو ئەبێ بەبەردە.

هێشتا مانگێ نەبوردبو کەشار چۆڵ بو هەربڕێ کەم دەسی تێدا مایەوە، کە حەوت هەزار کەس لەسەر تکای (مەلیك عادل) برای سوڵتان بەخشران و بەم جۆرە پارەیێکی زۆر بو (بەیتولمال) کۆبوەوەو شارەکە لە گاور خاوێن کرایەوە (٥٨٥-١١٨٨).

سەلاح الدین پاش دامەزراندنی کاروباری شاری پیرۆزی (قودس) بە لەشکرییەوە لەوێ کەوتەڕێ و دەستی کردە گرتنی شارو قەڵاکانی تری دەورروبەر کە لەماوەی سێ مانگا (حەبەلە - ئانتروس - لازقیە - سەهیون - بکاس - ئەشەقەر - بەرزیە - دەرباك - ئەنتاکیە - سەفەد - ئەشوبەك) و چەند جێگەی تر گیراو بە وەڵاتانی ئیسلام زیاد کرا.

شەڕەکانی سێیەمی سەلیبی بەشویچن گرتنی قودسا کرا کەئەوەش بەسەرکەوت و پیرۆزی سەلاح الدین ئەیوبی دوایی هات و بەپێی پێشنیاری ریشاردی شێردڵ ئاشتی کراو بڕیارنامەیێ بەسرا (رۆژی چوارشەممەی ٢٢ی شەعبانی ٥٨٨ی کۆچی یەکەمی نوامبری ١١٩٢ی زاینی)و شەڕی سێیەمی سەلیبییەکان دوایی هات.

ساڵی دوایی لەبەرواری ٢٧ی سەفەری ساڵی ٥٨٩ی کۆچی پادشای دادگەرو قارەمانی تێکۆشەری کوردو بەخێوکەری گەل و موسوڵمانان لەتەمەنی ٥٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و لە دیمەشق لەلای قەبری ئەتابەك نێژراو شمشێرەکەشی لە لا دانرا.

## کوڕەکانی سوڵتان سەلاح الدین ئەیوبی:

سوڵتان سەلاح الدین لەکاتی ژیانا حکومەتی فەلەستین و سوریەی دابوە مەلیك ئەفزەڵ عەلی (ئەبوالحەسەن نورەدین) وە میسری سپاردبوە دەستی مەلیك عەزیز عوسمان (ئەبوالفەتح عیمادالدین) مەلیك عادێل برای بەشێکی جزیرەی لە دەستابو، کوڕانی شێرکۆ مامی لە (حومس)دا جێگیر بوبون، یەمەن هەر بەلای کوڕانی سەیفوالاسلام (تەغتەکین) برایەوە بو".

لەکاتی مردنا کەسی بۆ جێگاداری خۆی دیاری نەکردبو، بەلام پاش ماوەیێ وەکو زۆر بنەماڵەکانی تر ناحەزی کەوتە نێوان کوڕەکان و جارجار بەرهەڵستی یەکتر وەستان پاش دوایی هاتنی یاسای تەعزیەی سوڵتان سەلاح الدین ئەبولفەتح کوڕی کەفەرمانڕەوای میسر بو لەگەڵ مەلیك عادل ماميا هێرشان کردە سەر مەلیك ئەفزەڵ کوڕی تری سوڵتان کە فەرمانڕەوای شام بو، پاش سێ جار شەڕ لە بەرواری ٥٩٢ی کۆچی ١١٩٦ زایینی لەوێ دەریان پەڕاند و دیمەشق خرایە سەر بەشی حکومەتی مەلیك عادل.

ساڵی ٥٩٣ی کۆچی سەفوالاسلام تەغتەکین کوڕی ئەیوب نجم الدین کە پادشای یەمەن بو کۆچی دوایی کرد و کوڕی ئەو بە ناوی فەتح الدین ئیسماعیل بە ناوی مەلیك موعێز نیشتەجێگای.

لە ساڵی ٥٩٥ ی کۆچیا مەلیك عەزیز کوڕی سەلاح الدین کە پادشای میسر بو پاش شەش ساڵ پادشایی کۆچی دوایی کردو بە شوێن ئەوا دوو هۆیی کەوتە نێوان جێگارەکان بونە دوو دەستەوە بڕێ لایەنگیری ئەبو مەنسور کوڕی عەزیز بون و بڕێك لایەنگیری مەلیك ئەفزەڵ کوڕی سوڵتان سەلاح الدین کە لەپێشا لە دیمەشق دەرکرا لە ئاکاما ئەم دەستە بردیانەوەو مەلیك ئەفزەڵ بوە پادشای میسر" بەلام بۆ ماوەییێکی کەم چونکا دیسان بەهۆی هێرشی مەلیك عادلەوە لەوێ دەرکراو قەلای شەیشاتی پێدرا کە هەر لەوێ بو تامرد (٦٢٢ی کۆچی)، "ئیبن ئەسیر" نەسروڵلا کوڕی ئەبولکەرەم شەیبانی جزیری زانای بەناوبانگ لەگەڵ دووبرای ناوداریا وەزیری مەلیك ئەفزەڵ بون ئەم (ئێبن ئەسیر)ە لەپێشدا نوسەرێکی زۆر باش بووەو زانایانی بەڕێز گرتووە سەلاح الدین ئەم زانابیەی بە ئەودا.

## فەرمانڕەوایی مەلیك عادل کوڕی ئەیوب نەجم الدین:

مەلیك عادل کە لەکاتی پادشایی سەلاح الدینا جزیرەو چەن ناوچەیەکی تر بەدەسیەوە بو لە کاتی پادشایی مەلیك عەزیزا شامی خستە سەر وەڵاتی خۆی و پاش مردنی مەلیك عەزیز بەرهەڵستی مەلیك ئەفزەڵ وەستاو میسری لە دەستی ساندو کوڕی خۆی مەلیك کامیل موحەمەدی کردە حاکمی ئەوێ.

کوڕی تری خۆی مەلیك موعەزەمی کردە حاکمی دیمەشق و مەلیك ئەشرەف کوڕی دیکەی خۆی ناردە سەر جەزیرە وە چوارەمین کوڕی مەلیك ئەوحەد بوە فەرمانڕەوای ئەخلات و بۆ خۆی، ئەنجا لە میسرا پاڵی ئاسایش و رەحەتی لێداوە.

بەڵام زۆری پێ نەچوو مەلیك ئەوحەد ئەیوب مرد وبەشەکەی درایە مەلیك ئەشرەف (٦٠٩ کۆچی لەساڵی ٦١٣)شدا مەلیك عادل کوڕەزایەکی خۆی بەناوی مەسعود ناردە یەمەن و کردیە حکومەتی ئەوێ بە جێگای مەلیك ناسری کوڕی موعیز کە زۆر منداڵ بو کرابوە جێگەداری باوکی.

لەبەرواری ٦١٥ی کۆچی ١٢١٨ی زایینی مەلیك عادل کۆچی دوایی کرد و لەم دونیا دەرچوو.

## پادشایی مەلیك ئەشرەف موسا کوڕی مەلیك عادل:

مەلیك ئەشرەف لە کاتی بونی باوکیا حوکمداری روها – ئوفەو حەڕان و ئەخلات بو.

مەلیك موعەزەم کورشی مەلیك عادل کە پادشای دشمەشق بو لەساڵی ٦٢٥دا کۆچی دوایی کرد و کوڕی ئەو بەناوی مەلیك ناسر بوبو بە جێگەداری، مەلیك کامل کوڕی مەلیك عادل کە پادشای میسر بو لەشکری هێنا سەر دیمەشق مەلیك ئەشرەفیش لەولاوە بو یارمەتی برای هات و لە ئاکاما برازایان لە دیمەشق دەرپەڕاند" لە بەرانبەرە قەڵای (شوبەك – نابلوس – کەرەك) یان پێدا تاکو پێی بژی.

لەم لاوە، دوو برا وەلاتـی ئـەویان دابەشـکردو دیمەشـق کەوتـە سـەر بەشـی مـەلیك ئەشرەف" ئەڵبەت ئەم مرۆڤە زۆر زاناو لێهـاتوو لـە لای سـەردارەکان و سـوپایەوە زۆر خۆشەویست بو.

مەلیك ئەشرەف لە ساڵی ٦٣٥ی کۆچی ١٢٣٧ی زاینی کۆچی دوایی کرد.

## پادشایی مەلیك کامل موحەمەد کوڕی مەلیك عادل:

مەلیك کامیل کوڕی مـەلیك عـادل کـە بـەنازناوی ئەبولمـەهالی ناسـرالدین موحەمـەد ناوداربو، یەکێ لە پادشایانی پایەبەرزی زەنجیرە پادشایانی بنەماڵەی ئەیوبیـە کـە لـە هەموو کاتێکا لێهاتوویی و ژیری وزانایی خـۆی پیـشان ئـەدا، ئـەم پادشـا کـە لەسـاڵی ٦٢٥دا جێگەی گرتەوە، بەرەبەرە وەلاتـی خـۆی پەرەپێـداو تەنانـەت تـوانی حیجـاز و یەمەن و شامیش بخاتە ژێر دەستی خۆی.

لە دواییا مەلیك کامیل رۆژی چوار شەممەی ٢١ی رەجەبی ساڵی ٦٣٥ی کۆچـی ٨ی مارسی ١٢٣٨ی زاینی لە کاتێکا جەوان بو وەتەنیا چل ساڵ تەمەنی بـو کۆچـی دوایـی کرد.

یافعی لـە مێژووەکـەیا نوسـیویە مـەلیك مەسـعود کـوڕی مـەلیك کامـل کـە کردبویـە پادشای یەمەن لەکاتی گەنجی و جەحێلیدا لە مەکە کۆچی دوایی کرد، کە مردنـی ئـەم کوڕە زۆر لە دڵی مەلیکدا شوێنی کرد وهەر ئەم پەژارە بوە هۆی مردنی ناوەختی.

وەکـو ئـەوەی دەردی گرانـی براـنـەوەی بنەماڵـە کەوتبێتـە نـاو زنجـیرە پادشـایانی رەگەزی ئـەیوبی، وەرە وەرەو بەینابـەین تـەنیا لـەماوەی چـەن سـالا زۆریـان مـردن و کەمبونەوە.

لە ساڵی ٦٣٢دا سەرداری ناوداری ئەم بنەماڵە بەناوی سـەواب خـادم کـە مرۆڤێکـی ئازاد و هەڵکەوتوو بوو مرد لە ساڵی ٦٣٢ی کۆچـی ١٢٣٤ی زاینـی مـەلیك زاهـیر کـوڕی

سوڵتان سەلاح الدین کۆچی دوایی کرد . لە ساڵی ٦٣٣ی کۆچیا مەلیك موحسین کوڕی سوڵتان سەلاح الدین لە دونیا دەرچوو.

لە ساڵی ٦٣٤ی کۆچی ١٢٣٧ی زاینی مەلیك ئەشرەف پادشای شام لە دونیا دەرچوو.

بە شوێن ئەم مەرگ و میرا لە میسر مەلیك عادلی دووەم کرایە پادشاو لە لایەن ئەوەوە مەلیك جەواد بوە فەرمانڕەوای دیمەشق" بەڵام پاش ماوەیێکی کەم مەلیك ساڵح ئەیوب کرایە پادشای میسرو مەلیك عادل خرایە بەندیخانەوە.

مەلیك ساڵح هێرشی کردە سەر دیمەشق و ئەویشی داگیر کرد مەلیك ساڵح بە شوێن گرتنی دیمەشقا هەڕەشەی ناردە سەر مامی خۆی مەلیك ئیسماییل مامی لەم هەڕەشە توڕەبو بەرهەڵستی وەستاو کارێکی کرد کە سەردارانی دیمەشق لەگەڕانەوەدا مەلیك ساڵح ئەیوبیان گرت و دایانە دەست مەلیك ساڵح ئیسماییلەوە، بەڵام ئەم مەلیك ساڵحە لە بەرواری ٦٣٨دا قەڵای شەقیقی دا بە دەستی گاورەکانەوە.

ساڵی ٦٤١ی کۆچی مەلیك جەواد لە دونیا دەرچوو ساڵی ٦٤٥ی کۆچی بەرانبەری ١٢٤٧ی زاینی مەلیك عادل دووەم کوڕی مەلیك کامیل کۆچی دوایی کرد.

لە ساڵی ٦٤٧ی کۆچی دا مەلیك ساڵحی ئەیوبی پادشای میسر لە دونیا دەرچوو" کوڕی ئەو مەلیك موعەزەم بوبە جێگەداری، لە کاتی پادشای ئەم مەلیك موعەزەمەدا شەڕێك لە نێوانی ئەو گاورەکانا قەوما کەبەسەر کەوتنی ئەم پادشا دوایی هات و پادشای گاورەکان بەدیل گیرا.

بەشوێن ئەم شەڕەدا رەویشتی مەلیك مەعەزەم گۆڕا بە جۆرێ کەخەڵکی لێ هەڵگەڕایەوەو گرتاین و کوشتیان و یەکێ لە خۆیان بەناوی "عیزالدین تورکەمان" یان کردە سەرداروگەورەی خۆیان و پادشای گاورە دیلەکەیان فرۆشت بە خاچ پەرەستەکان.

لەم بەینا مەلیك ناسر فەرمانڕەوای کەرەك لەشکری کردە سەر شام و دیمەشقی گرت و لەویەوە روی کردە قاهیرە ئەویشی داگیر کرد، عیزالدین تورکەمان و سێ سەد کەس لەهاوڵەکانی هەڵاتن و بەرەو دیمەشق کەوتنەڕێ لەناو رێگادا توشیان لە کاروانی بارومەتای مەلیك ناسر هات هەموویان تاڵان کرد وپیاوەکانیان کوشت ئەنجا هێرشیان بردەسەر غەزەو ئەویان داگیر کرد بەشوێنیا لەشکرێکیان پێکهێناو یەکەیەکە چەن کەس لە فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی ئەیوبیان کوشت.

بەشوێن ئەمەدا مەلیك ناسر مێسری بەجێ هێشت و رۆی، ساڵی ٦٥١ی کۆچی ١٢٥٣ی زاینی مەلیك سەلاح الدین کوڕی مەلیك زاهێر لە دونیاوە دەرچوو.

ساڵی ٦٥٢ی کۆچی بەرانبەری ١٢٥٤ی زاینی پایەبەرزەکانی میسر جارێکی تر (عیزالدین تورکەمان)یان کردە پادشای خۆیان و دەستی بنەماڵەی ئەیوبی بە تەواوی کۆتابو.

ساڵی ٦٥٦ی کۆچی مەلیك ناسر داود کوڕی مەعەزەم لەدەربەدەریا کۆچی دوایی کرد.

لە بنەماڵەی ئەیوبی موغیس کوڕی عادل مابوەوە کە لە کەرەك فەرمانڕەوا بو ئەویش لە بەرواری ٦٢٢ی کۆچی ١٢٦٥ی زاینی بەدەس تورکەمان لەناوچوو بەمجۆرە زەنجیرەی پادشایانی ئەیوبیە لە سەرانسەری ناوچەکانا دوایی هات و بنەبڕ بو، وە پادشایی رەگەزێکی تر لە پادشا ناودارەکانی کورد هەڵپێچرا.

بەلام ناوو شۆرەت و ناوبانگی یەکەیەکەیان بە تایبەت پادشای ناودارو هەرە گەورەی ئەم بنەماڵە یوسف سەلاح الدین، هەروەها شوێنەوارە دیارییەکانیان لە هەموو ناوچەکانا ماوەتەوە، جگە لەمانە ناوی سەلاح الدین ئەیوبی لەباری ئازایی، زانایی، هەڵکەوتوویی، لێبوردەیی، دروستکردنی شوێنەوارە بەرچاوی و گرنگەکان هەتا هەتایەو هەتا مێژوو هەیەو خوێنەوار هەیە سەرنجی بدا ئەمێنێتەوە و ون نابێ.

# دەوری کوردەکان لەسوپای سەلاحەدین دا

د. موحسین محەمەد حوسێن
بەشی مێژوو – کۆلێجی پەروەردە
زانستگای بەغدا

گومان لەوەدا نیە کە کوردەکان دەوری سەرەکی یان هەبووە لە دامەزراندنی سوپای ئەمارەتەکانی کوردی ، کە لەقۆناغە جیاوازەکانی مێژووی ئیسلامیدا دەرکەوتوون[١]. هەروەها بەشدارییان کردووە لە دامەزراندنی گەلێك سوپای ئیسلامیدا، کە لە دەوروبەری ناوچە کوردی یەکان سەریان هەڵداوە.

دەوری کوردەکان بەئاشکرایی دەرکەوتووە لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی و ئەمارەتەکانی ئەتابەگی دا، بەجۆرێك مێژوو نووس ((دواداری)) وای راگەیاندووە کە لە ساڵی ٤٦٣ ك ١٠٧١ زایینی دا سوڵتانی سەلجوقی ی بەناوبانگ ((ئەلب ئەرسەلان)) دەهەزار (١٠/٠٠٠) شەڕکەری کوردی لە دەوروبەری خۆی کۆ کردوەتەوە [(٢)].

لێرە دەبی باسی لایەنێکی گرنگ لە مێژووی کوردیی ئیسلامی بکەین، ئەویش ئەوەیە کە کوردەکان بەشداری یان نەکردووە لە سپای ئیسلامی دا بەسیفەتی (ممالیك) بەڵکو وەك سەربازی (ئیعتیادی) بەشداری یان کردووە [(٣)].

بەشداربوونی کوردەکان لە دامەزراندنی سپا ئیسلامیەکاندا شتێکی (اعتباطی)نەبووە، بەڵکو هۆی ئەوە بوو کە شەڕکەری چاك بوون، وەك مێژوونوسی ناوبراو (دواداری) باسیان دەکاو دەڵێ:

((کوردەکان نیشانچی و سوارچاکی باش بوون)) [(٤)].

هەروەها مێژوونووس (حەسەن کوردی عەبدوڵلای عەبباسی) باسی ئازایەتی و پیاوەتی و غیرەتیان دەکاو دەڵێ:

((ان الكرد فيهم الشجاعة والنجدة والحمية، فرسانهم ورجالتهم. وهم يتعصبون لبعضهم...وليس فيهم حيل ولا مكر)) هەروا دەڵێ: ((ان الكرد ينقادون للديانات والامانات))[٥].

ئەو رەوشتە گەلێك هۆی تر هاندەری سەرەكیی (دافعی أساسی) بوون بۆ بەشداربوونی كوردەكان لە شەڕی خاچ پەرستەكان ((صەلیبی یەكان)) لە هەموو قۆناغەكانیدا. دەركەوتنی بنەماڵەی ئەییوب و شێركۆ یەكێكە لە لاپەڕە گەشەكانی مێژووی جیهادی (خەباتی) كوردی و ، دەوری ئەو بنەماڵەیە گەیشتە لوتكەی لەگەڵ دەركەوتنی سەلاحەددین یوسف كوڕی ئەییوب.

وەنەبی بنەماڵەی ئەییوب تاكە نمونەییێك بی لەو مێژووە گەشە، بەڵكو چەندەها كاروانی دیكە لە رۆڵەكانی ئەو گەلە، تارادەییێكی زۆر بەشداری یان كردووە لە پێناوی بیروباوەڕیان و دژی داگیركەران. چ بە (دافعی) ئایینی ئەوەیە كە كوردەكان بە خۆیان مێژووی خۆیان نەنووسیوە، بۆیێ ناوی زۆربەی زۆری ئەو قارەمانانە بزربوون یا پێمان نەگەیشتوون.

ئاسان نی یە لە هەلێكی وادا هەموو ئەو مێژووە دووروودرێژە ئالۆزە باس بكرێ. ئەوەی دەمانەوێ باسی بكەین تەنها لایەنێكی بەشداربوونی كوردەكانە لە سپای سەلاحەددین دا.

باسەكەمان پێویست بەوە دەكا هەندێك بگەڕێینەوە دوواوە تا بزانین چۆن سەربازێك لە سپای شێركۆ توانی ئەو جێگایە بەرزو گرنگە لە مێژوودا بگرێ. لێرەدا باسی ئەوە ناكەین چۆن بنەماڵەی سەلاحەددین وڵاتی عێراقی بە جێ بهێڵن لەو شەوە كە سەلاحەددین لە دایك بوو و بچنە شام، لە پاشان بچنە وڵاتی میسر.

تێك چوونی كاروباری ناوخۆی میسری فاتمی گەیشتە ئەوپەڕی خەتەری سەلیبی. (نورالدین محمود)ی ئەتابەگی خاوەن وڵاتی شامی ناچار كرد هێزی خۆی بنێرێ بۆ

بەرگری کردن لە میسر و راگرتنی دوژمنی سەلیبی لە پێکەوتن [٦]. (واتە بەسەر میسرا زاڵ بوون)

(نورالدین محمود) سەرکردەیەکی لەشێرکۆ باشتری بۆ نەدۆزرایەوە کە بتوانێ ئەو ئەرکە گرنگە بەجێ بێنێ [٧]. ئەو وەختە شێرکۆ سەرەك سپای شام بوو و لە پایەکەشی دا دوەم کەس بوو پاش نورالدین.

(ابن الاثیر ) کە مێژوونووسی هاوچەرخ بوو، و لەو رووداوانەی دا نووسیتی، دەڵێ: کە (نورالدین محمود) دیتی شێرکۆ کابراییێکی شوێنێکی بەتووانایە، (تعیینی) کرد بە سەرەك سپای خۆی. بەوجۆرە شوێنێکی بەرزی وەرگرت لە هەڵسوراندن و بەرێوەبردنی دەوڵەتی (نورالدین محمود) و کەس نەتووانی بیگاتێ لەو مەسەلەیە، بەجۆرێك وەك شەریکێکی (نورالدینی) لێ هات لە حوکمدا [٨] ئەوەی شایانی باسە کە بەیارمەتی شێرکۆ بوو (نورالدین محمود) تووانی شاری حەڵەب و دیمەشق بێنێتە ژێر ئاڵای خۆیەوەو ئێستاش ئەرکی کردنەوەی میسر دەخاتە سەرشانی.

لەهەر سێ هێرش بردنە سەر میسرا شێرکۆ سوارەکانی خۆی لە سەربازەکانی سپای نورالدین هەڵبژاردو ژمارەی شەرکەرەکانی شێرکۆ لە زۆربوونا بوون.

لە هێرشی ساڵی ٥٥٩ك/١١٦٤ زاییندا ژمارەیان هەزار سواربوو [٩]، ولە هێرشی ساڵی ٥٦٢ك/١١٦٧ زاینیدا بوون بە دەهەزار سوار [١٠] و لە دووا هێرشدا ژمارەیان گەیشتە هەشت هەزار سوار [١١]، جگە لە ژمارەی پیادەکان. هەچەندە سەرچاوەکانی مێژوویی ژمارەی ئەو کوردانەی کە بەشداریان کردبو لەو هێرشانە دەست نیشان ناکەن، بەڵام بەوپەڕی بڕواوە دەتوانین ئەوە دەرخەین کە بەناوبانگترین سەرکردەکانی هێرشەکان کورد بوون، جگە لە تورکمانەکان کە پشتیوانی دەوڵەتی (نورالدین محمود) بوون [١٢]، هەروا عەرەبەکانی ناوچەی شامیش بەشداریان کردبوو [١٣].

ئەوەی ئەو راستیەش دەسەلمێنێ ئەو گفتوگۆیەی نێوان قازی ی بەناوبانگ عیسای هەکاری و سەرکردەکانی سپای شێرکۆیە، کە لە ئەنجامدا رازی بوون بەوەی سەلاحەددین شوێنی مامی خۆی بگرێ و ببێت بە وەزیری خەلیفەی فاتمی.

مێژوو نووسان دەڵێن خەلیفەی فاتمی کە سەلاحەدینی بە وەزیر دامەزراند، هەندێ لە سەرکردەکانی سپا رێزیان نەگرت، لەبەر بچووکی تەمەنی کە ئەو وەختە (٣٢) سیءو دوو ساڵی تێنەپەڕیبوو وە دەیانویست خۆیان ببن بە وەزیر.

فەقێ عیسای هەکاری لەم گفتوگۆیەدا ئامادە بوو، و زۆر هەوڵی دا، وا لە سەرکردەکانی سپای شێرکۆ بکات لایەنگیری سەلاحەددین بکەن.

فەقێ عیسا لە سەرەتادا چووە لای (سیف الدين علي مشطوبی هەکاری) کە یەکێك لە گرنگترین سەرکردەکانی سپا بوو و لە هەوڵدانەکەی توانی پێی بسەلمێنێ و (مشطوبی هەکاری) وازی لەو خەیاڵە هێنا کە ببێتە وەزیری میسر.

لە پاشان فەقێ عیسا توانی (شهاب الدين محمود) خاڵی سەلاحەددینیش (اقناع) بکاو پێ ی گوت: سەلاحەددین خۆشکەزاتە و سەربەرزی و پێش کەوتنی ئەو سەربەرزی و پێشکەوتنی تۆیە و رێگای بوون بەوەزیری بۆ پاك بۆتەوە، مەبە بە کۆسپ لەرێگایدا.

ئینجا فەقێ عیسا چووە لای خەسرەوی کوڕی تەلیلی هەزبانی، ئەویشی ئیقناع کردو پێی وت: سەلاحەددین خەڵکەکە پێی رازین، تۆو یارۆقی نەبێو، کوردێك ببێت بە وەزیر باشترە لەوەی تورکمانەکان (ئیستیغلال) ی ئەو زروفە بکەن و، خۆیان ئەو مەرکەزە داگیر بکەن.

یارۆقی سەرکردەی تورکمانەکان، کە خەڵکێکی زۆری لەدواوەبوو، نەتوانرا ئیقناع بکرێ. یارۆقی گەڕایەوە شام و زۆربەی سەرکردە تورکمانەکانی تریشی لەگەڵ خۆی بردوو وەڵامەکەی ئەوەبوو کە گوتی: من خزمەتی سەلاحەددین ناکەم [١٤].

ئەو گفتوگۆیە بۆمان دەردەخات کە سەرکردەو سەرەك عەشیرەتە کوردەکان هەموویان پشتی سەلاحەدینیان گرت، هەرچەندەش هەندێکیان وایان دەزانی خۆیان زیاتر مافی ئەوەیان هەبوو ئەو شوێنە گرنگەن بگرن، واتە ببن بە وەزیر، چونکە بەتەمەن گەورەتر بوون و (خیبرەی عەسکەرییان) لە سەلاحەددین زیاتر بوو لەگەڵ ئەوەشدا وازیان لە (مونافەسە) کردنی سەلاحەددین هێنا.

لە دیارترین کوردەکان کە چوونە ژێر ئاڵای سەلاحەددینەوە: هەزبانیەکان بوون، کە هەندێك لە ناوچە کوردەکانیان حوکم کردبوو لەسەردەمەکانی پێشوودا، وەك وڵاتی هەولێر پێش سەردەمی ئەتا بەگی یەکان [١٥].

ئەوەی شایەنی باسە بنەماڵەی ئەیوب دەگەڕێتەوە سەر عەشیرەتی هەزبانی و [١٦] لەو سەرکردە بەناوبانگانەی کە سەر بەو عەشیرەتە بوون: میر (موسك) و میر (خەسرەو) و میر (أبو الهجا)ن [١٧]. هەروەها هەکارییەکانیش [١٨] کە ژمارەیەك قەڵاو گوندیان بەدەستەوە بوو لەناوچەی موسڵ و ئاکرێو (جەزیری إبن عومەر)دا چوونە ژێر ئاڵای سەلاحەددینەوەو سەرکردەی ئەو هەکاریانە (سیف الدین علی مشطوبی) ناوبراوبوو (إبن شداد) — مێژوونووسی سیرەتی سەلاحەددین — ئەو سەرکردەیەی بە (کبیر ملوك الأکراد) [١٩] لەقەڵەم داوە.

عەشیرەتی (حەمیدی) و (زرزاری) و (حەکەمی) و گەلێك عەشیرەتی کوردیی دیکە بەشداریان کردبوو لە سوپای سەلاحەدینداو دەوریان گێڕاوە لە ڕێکخستنی سوپای ئەو سەرۆکەدا.

# پشت بەستنی سەلاحەدین بە کوردەکان

## لە لەناوبردنی سوپای فاتمی لە میسردا:

هەر لەسەرەتاوە سەلاحەدین پشتی بە کوردەکان بەست بەتایبەتی لە نەهێشتنی سوپای میسری فاتمی دا. قولە ڕەشەکان – کە کۆڵەکەو بڕبڕەی سوپای فاتمی بوون، بە سەرکردەیی (جەوهەر) لەساڵی ٥٦٤ك دا کە دەکاتە ساڵی ١١٦٨ز ، ڕاپەڕین دژی ئەو وەزیرە لاوە کە هێزەکانی شامی هێنا بۆ داگیرکردنی میسر. (جەوهەر) توانی هەموو ئەوانەی دژی سەلاحەدین بوون کۆ بکاتەوە، ژمارەیان گەیشتە دەورووبەری (٥٠) هەزار شەڕکەر[٢٠]. بەڵام سەلاحەدین توان هێزێکی وا پێکبهێنێت بەسەرکردایەتی (أبو الهجا)ی کوردی هەزبانی، کە قولەکان و هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیانا بوون ببەزێنێ لەگەڕەکی (بین القصرین) لە شاری قاهیرەو ئاگریان لەماڵیان بەرداو گەڕەکی (مەنسوورە)ی کە تێدا دەژیان سوتاند و ئەوانەی مانەوە لە قولە ڕەشەکان (توران شاه) برای سەلاحەدین ڕاوی نان بۆ ناوچەی (جیزە) تا گەیشتنە ناوچەی (صەعید) لەخوارووی میسر[٢١].

قولە ڕەشەکان بەردەوام بوون لە یاخی بوونیان لەئەنجامدا ئەو یاخیەتیانە هەموو دامرکێنران و قولە ڕەشەکان بەتەواوی لەناو بران، بەسەرۆکایەتی (أبو بکر سیف الدین و موسك کوڕی چكو) کە براو کوڕی خاڵی سەلاحەدین بوون و سەرۆکی قولە ڕەشەکانیان کوشت[٢٢].

ئەوە بەڵگەیە بۆئەوەی کە سەلاحەدین هەمیشە پشتی بە کوردەکان بەستبوو لە چارەسەرکردنی گیروگرفتی وادا گرنگ پەیوەندی بە ئاسایشی ناوخۆی وڵاتەوە هەبوو لەدامرکاندنی ئەو بزووتنەوانەی دژی حوکم و دەوڵەتەکەی بەرپا دەبوون.

کە بەربەرەکانێی لەگەڵ خاچپەرستەکان گەیشتە لوتکە، کوردەکان بەسەرکردەو شەڕەکەرەوە بوون بە بڕبڕەی سوپای سەلاحەدین.

لەو شەڕە گەورەیەی کە پێی دەڵێن (الوقعة العظمی) کە لە مێرگی عەکا لەساڵی ٥٨٥ك / ١١٨٩ز دا رووی دا، خاچ پەرستەکان هەموو هێزی خۆیان تەرخان کرد بۆئەوەی تۆڵەی بەزینیان لە شەڕی (حطین) و (شاری قودس) بکەنەوە، سەلاحەدین هێزەکانی خۆی بەسەرۆکایەتی خۆیی و براو کوڕە گەورەکانی بەم جۆرە ئامادەکرد: لای راستی سوپاکەی کە کوڕەکانی تێدابوون بەسەرۆکایەتی میر (سیف الدین علی مشطوب) بوو، هەروا میر (مەجەلی کوڕی مروان) و کۆمەڵێك لە کوردەکانی مارانی و هەکاریان لەگەڵ بوون و لای دواوەی سوپاکەش لەلایەن سەرۆکەکانی (تیپی ئەسەدی)[٢٣] بەڕێوە دەبرا.

سەرکردایەتی لای چەپی سوپاکە درابووە دەست (تقی الدین عمر)ی برازای سەلاحەدین و (لاشین)ی خوشکەزایی و گەلێك سەرۆکی کوردو غەیری کوردیشی تێدابوو[٢٤].

## ئەنجوومەنی سەرکردایەتی سوپای سەلاحەدین

لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری شەرکەرەکانی سوپای سەلاحەدین کورد بوون ئەوە کاری لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی سوپاکەی کردو وای کرد کە ژمارەی کوردەکان لەم ئەنجوومەنەدا زۆر بن شتێکی ئاشکراشە کە ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە لەو سەرکردانە پێك هاتبێ کە خزمەتی گەورەیان پێشکەش بەم دەوڵەتە عەسکەریە کردبێ.

ئەم ئەنجوومەنە لە کاروباری گرنگی وڵاتی دەکۆڵیەوەو، بڕیاری دەداو جێبەجێیانی دەکرد بەپێی پێویستی، سەلاحەدین کەخۆی سەرۆکی ئەم ئەنجوومەنە بوو براو کوڕە گەورەکانیشی ئەندام بوون تیایدا بەتایبەتی براکەی (سیف الدین أبو بکر) کە (موستەشاری ئەساسی) سەلاحەدین بوو هەروا (تقی الدین عمری) برازای و (شهاب الدین محمود)ی خاڵی هەروا گەلێك سەرکردەی تری کوردی وەك (سیف الدین) علی

کوڕی أحمدی مشطوبی هەکاری، و (أبو الهجا)ی هەزبانی و (فقی عیسا)ی هەکاری لەم ئەنجومەنەدا ئەندام بوون [٢٥].

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو ئەندامەکانی ئەو ئەنجوومەنە کورد بوون بەڵکو گەلێك غەیری کوردیشی تێدا بوون، بۆنموونە موستەشارەکەی (القاضی الفاضی) عبدارحیم بیسانی و قازی ئوردو مێژوونوسی ئیبن شەداد و (عمادالدین الکاتب الاصفهانی) نوێنەری حەربی و مێژوونوسی شەڕەکانی سەلاحەدین و میر (علم الدین سلیمان جندر) و (مظفرالدین گۆکبوری)و گەلێکی تر هەبوون کورد نەبوون.

بوونی ئەم ژمارە زۆرە کوردە لە سوپاو ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شەڕی سەلاحەدین وای لە هەندێ مێژوونوسی هاوچەرخ کردووە کە دەوڵەتی سەلاحەدین بەدەوڵەتی کوردی لەقەڵەم بدەن. بەڵگەی ئەم مێژوونوسانەش لەمەدا ئەوەیە، وەك دکتۆر (نظیر حسان سعداوی) دەڵێ: کە سەلاحەدین هەموو پلەوپایە گرنگەکانی سوپاو بەڕێوە بردنی دەوڵەتەکەی بە کوردەکان سپاردبوو [٢٦] سەلاحەدین پشتی بەتەواوی بەکەسو کاری خۆی و بەکوردەکان بوو چونکە بەدڵ پشتیوانی بوون و لێیان نەدەترسا.

# پەراوێزەکان

١- بڕوانە: محمد أمين زكى، تأريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي.

حسام الدين النقشبندي، الكرد في الدينور وشهرزور.

٢- الدواداري، الدرة المضيئة في اخبار الدولة الفاطمية، ل، ٣٩٣.

٣- د.محسن محمد، الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين، ل: ١٣٢.

٤- الدواداري، الدرة المضيئة، ص: ١٦٦.

٥- الحسن بن عبدالله، أثار الاول، ل: ١٤٧.

٦- الكامل: ١١ / ٢٩٨.

ابن العديم، زبدة الحلب: ٢ / ٣١٦.

٧- أبن الاثير، الباهر، ل ١٢٠.

٨- هەمان سەرچاوە، ل ١٦٨

٩- المقريزي، الخطط، چاپی (المعهد الفرنسي) جزمی ٢، بەشی ١ ل ١٥.

١٠- الكامل ١١ / ٣٢٤. الباهر ١٣٣.

أبو شامة، الروضتين جزمی ١ بەشی ٢ ل ٣٦٤.

أبن الوردي: ٢ / ١٠٢.

أبن خلكان، وفيات الاعيان ٧ / ١٤٨.

١١- الكامل: ١١ / ٣٣٨.

أبن واصل، مفرج الكروب، ١ / ١٥٨.

أبن الفرات جزمی ١، جلدی ٤ ص ٢٦.

السيوطي، حسن المحاضرة: ٢ / ١٨.

١٢- الكامل: ١١ / ٣٥١ الباهر، ل: ١٤٣.

النكت العصرية ل ٧٨ — ٨١

أبن الفرات جزمی ١، جلدی ٤ ل ٢٦.

المقريزي، الخطط، چاپی أوفسيت جزمی ١ ل ٣٥٨.

و (أتعاظ الحنفا) چاپی ١٩٤٨ جزمی ١ ل ٢٩.

١٣- بڕوانە: نامەی دوکتۆر أمان (الجيش الايوبي) ل: ٨٧ – ٩٠.

١٤- الكامل ١١ / ٣٤٤ الباهر ١٤٢.

الروضتين جزمی ١، بەشی ٢ ل ٤٠٧.

وفيات الاعيان ٧ / ١٥٥.

١٥- الكامل: ١٠ / ٦٣٨. الباهر: ٣٠.

بڕوانە: (أربيل في العهد الاتابكي) ل ٣٧ ، ٣٢١.

١٦- الكامل: ١١ / ٣٤١.

وفيات الاعيان: ٧ / ١٣٩.

الروضتين: جزمی ١، بەشی ٢، ل: ٣٢٩.

١٧- الروضتين: هەمان بەش، ل :٤٠٦.

١٨- هەكاريەكان: مەبەست لێی خێڵی هەكاریی كوردە كە كۆمەڵە قەڵاو گوندێكی بتەویان لە

ڕۆژهەڵاتی موسڵ هەبوو (وفيات الاعيان ٣/٣٤٥).

هەروا مەبەست ناوچەی هەكاریە كە كەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی (ئەنادۆڵ) واتە (كوردستانی

توركیا) سەیری كتێبی (الاكراد) بكە، دانەری ((مینۆرسكی)) ل: ١١٠.

١٩- النوادر السلطانية، ل: ١٧.

سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ٨/٢٧٨، ٤٢٠.

وفيات الاعيان: ١/١٨٣.

اليونيني، ذيل مرآة الزمان: ٢/٢٢٤.

ابن تغرى بردى، النجوم الزاهرة: ٥/٣٥٤.

٢٠– سنا البرق الشامي، ل ٨٣.

الكامل: ١١/٣٦٥.

الروضتين جزمی ١ ل: ٤٥٣.

مفرج الكروب: ١/١٧٦.

الكواكب الدريه، ل:١٨٤.

٢١– الروضتين: ١/٤٥١–٤٥٢.

أبن خلدون: جلدی ٥ بەشی٣، ل:٦٢٤.

أبن الفرات، جزمی ١، جزمی ١، جلدی ٤، ل:٧١.

شفاء القلوب، ل:٧٢.

الكواكب الدرية، ل:١٨٥.

٢٢– سنا البرق: ١/١٧٥ – ١٧٦.

النوادر، ل: ٤٧ – ٤٨.

الكامل: ١١/٤١٤.

مفرج الكروب: ٢/١٦ – ١٧.

المقريزي، السلوك: ١/٥٧ – ٥٨

المقريزي، البيان والاعراب ل:٤٦.

٢٣– تیپی ئەسەدی: مەبەست ئەو تیپەیە کە (أسد الدين شیرکۆ) مامی سەلاحەددین دایمەزراندبوو.

٢٤– النوادر، ل:١١٠.

٢٥– بڕوانە (الجيش الايوبي) ل١٧٨.

٢٦– د.سعداوي، جيش، ل:٣٤.

# سەرچاوەکان

١ـ شەرەفنامە، نوسینی شەرەفخانی بەدلیسی، وەرگێڕانی هەژار– دەزگای ئاراس.

٢ـ خولاصەیەکی تأریخی کوردو کوردستان، نوسینی محمدأمین زکی، ئامادەکردنی صدیق صالح– بنکەی ژین.

٣ـ مێژوی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، نوسینی صالح قەفتان– سلێمانی ١٩٦٠.

٤ـ مێژوی کوردو کوردستان، شوکرولڵا بابان– بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری سلێمانی.

٥ـ سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی صەلاحەددینی ئەیوبیدا، نوسینی: دکتۆر محسن محمد حسین، وەرگێڕانی عثمان سید قادر– پڕۆژەی تیشك.

# ناوەڕۆك